


● ناوی کتێب: گەشتی ژیان.

● نوسینی: د.محەمەد عەریفی.

● وەرگێڕانی: هێمن محەمەد عەلی.

● دیزاین: قەیدار ڕەحیم.

● چاپ: یەکەم - ٢٠١٤

● شوێنی چاپ: بیروت . لبنان.





● ژمارەی سپاردن: ١١٠٤ی ساڵی ٢٠١٤پێدراوە.






هەولێر- چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی.

تەلەفۆن: ٠٠٩٦٤٦٦٢٥١١٩٨٢

مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

**Website: www.nareenpub.com**

**E-mail: info@nareenpub.com**






**ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە:**

- پێشەوای مرۆڤایەتی محمد ﷺ.
- دایکو باوکی خۆشەویستم.
- ئیبراهیمی کوڕم.





# گفتوگۆیەك لەگەڵ بێباوەڕان..

* بە چیرۆکێکی سەیر دەست پێدەکەین، ئەم چیرۆکە شێوەیەك لە بیانوو بڕینی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕ بە بوونی خودای گەورە ناکەن..

با بزانین پێشینەکانمان چۆن چۆنی لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا، هەڵسوکەوتیان کردووە؟!

ئایا لە سەردەمانی پێش سەردەمی ئێستادا، ئەو جۆرە کەسانە بوونیان هەبووە؟!

ئەی چۆن چۆنی دانیشتنیان لەگەڵ کراوە؟!

ئایا ئەمڕۆ ئەو کەسانە ماونو هەن؟!

ئەی چۆن چۆنی گفتوگۆیان لەگەڵ بکەینو لەگەڵیان دابنیشین؟!

ئەمڕۆ دەتوانین لە ڕێگەی پێگە ئینتەرنێتیەکانەوە، هەروەها لە ڕێگەی وتەو بڵاوکراوەکانیانەوە، لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، لەگەڵیان بدوێین..

چۆن بتوانین ئەم چیرۆکە بەکاربهێنین، بۆ ئەوەی بتوانین، کاتێك لەگەڵ ئەو کەسانەدا ڕووبەڕوو دەبینەوە، سوودی لێ ببینین؟!

ئایا بەرژەوەندی لەوەدا هەیە بچینە ناو ئەو پێگە ئینتەرنێتیانەوەو گفتوگۆیان لەگەڵ بکەین؟! چۆن بتوانین کۆمەڵێك بەڵگە کۆ بکەینەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەیان، بیانووەکانیان ببڕینو ببنە بەڵگەیەك بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا هیچ بیانوویەکیان نەمێنێت؟!

ئەمانەو زۆر شتی تری بەسوود لەم چیرۆکەدا بەدی دەکەین..

ئەبوحەنیفە (خودا لێی خۆشبێت) ڕۆژێك لەگەڵ کۆمەڵێك لەو کەسانەدا، ڕووبەڕوو بوویەوە، کە باوەڕیان بە بوونی خودا نەبوو، دەیان وت: ئەم بوونەوەرە، بە ڕێکەوت دروست بووە.. ئاسمانەکانو بورجەکانو زەریاو دەریاکان، هەموو بە ڕێکەوت دروست بوون..

گفتوگۆی نێوان ئەو کەسانەو ئەبوحەنیفە درێژەی کێشاو ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی سبەینێ لە لای ئەمیری ئەو کاتە، گفتوگۆکەیان تەواو بکەن..

بۆ سبەینێ ئەبوحەنیفە بە ئەنقەست کەمێك خۆی دواخست، بەڵام کەسەکانی بەرامبەری لە کاتی خۆیدا ئامادەبوونو هەر دەیان وت: ئەبوحەنیفە بۆ نەهات؟! ئەوە بۆ دیار نیە؟! کوا زاناکەتان؟! ئەوە پێشەواکەتانە، کەچی بەڵێنەکانی ناباتە سەر؟!

لەپڕ ئەبوحەنیفە دەرکەوێتو خۆی دەکات بە ژووردا..

ئامادەبووان هەموو وتیان: بۆچی دواکەوتیت؟! خۆ تۆ باوەڕت بە خودایەو لای خۆی ترسی خودات لە دڵدایەو باوەڕت وایە لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات؟!




ئەبوحەنیفە لە وەڵامدا فەرمووی: پەلە مەکەن، کاتێك دەمویست لەوبەری ڕووبارەکەوە بۆ ماڵی ئەمیر بپەڕمەوە، هیچ شتێکم دەست نەکەوت سواری بمو پێی بپەڕمەوە.. هەر چەند چاوەڕێم کرد، بەلەمێکم دەست نەکەوت..

ئەوانیش وتیان: ئەی چۆن گەیشتیە ئێرەو پەڕیتەوە؟!

ئەبوحەنیفە فەرمووی: شتێکی زۆر سەیر ڕوویدا؟!

وتیان: چی ڕوویدا؟!

ئەبوحەنیفە فەرمووی: کاتێك لە قەراغ ڕووبارەکە وەستا بوومو چاوەڕێ بووم، بەڵکو بەلەمێك بێت، لەپڕ بە ڕێکەوت ڕەشەبایەك هەڵی کرد، کە لە توانایدا بوو خانووش بڕوخێنێت!! ئەو ڕەشەبا بەهێزە دارێکی لە تەنیشتمەوە شکاندو هەر بە ڕێکەوت دارەکە بوو بە دوو پارچەوەو هەر بە ڕێکەوتیش پارچەیەکیان کەوتە سەر وشکانیو پارچەکەی تریش کەوتە ڕووبارەکەوە!!

هەر بە ڕێکەوت پارچە ئاسنێك کە نازانم لە کوێوە هات، لەگەڵ لقێکی دارەکەدا یەکیان گرتو تەورێکیان پێك هێناو تەورەکە هەر لە خۆیەوە کەوتە چاککردنی پارچە دارەکەی ناو ئاوەکەوەو بەلەمێکی بچوکی لێ پێکهات، پاشان دوو پارچە ئاسنی تر بۆ سەوڵ لێدان پەیدابوونو یەکێکیان چووە لای ڕاستو ئەوی تریان چووە لای چەپ، پاشتریش بەلەمە بچوکەکە لێم نزیك بۆوەو منیش سەرکەوتمو ئەوا گەیشتوومەتە لاتانو دەی فەرموون با گفتوگۆ بکەین، دەربارەی ئەوەی ئایا ئەم بوونەوەرە بە ڕێکەوت دروست بووە، یان نا؟!

وتیان: کەمێك بوەستە.. تۆ شێتی یان ژیر؟!

ئەبوحەنیفە فەرمووی: بۆچی؟! ئەی بۆ ژیر نیم؟!

وتیان: ئەی چ ژیرییەك ئەوە دەسەلمێنێت، بەلەمێك بە هەموو بەشەکانیەوەو لە خۆیەوە دروست بێت؟! ئایا ئەوە جێگەی باوەڕە، ڕەشەبایەك دارێك بکات بە دوو بەشەوەو بەشێکیان بکەوێتە سەر وشکانیو بەشەکەی تری بۆ ناو ئاوەکەو.... هتد..؟!

دروست بوونی بەلەمێك پێویستی بە چەندان کەسە، بۆ ئەوەی کاری تێدا بکەن تا تەواو بێت.. ئەم هەموو کارە هەر لە خۆوەو بە ڕێکەوت دروست بوو؟!

ئەبوحەنیفەی زاناو داناش زۆر زیرەکانە فەرمووی: پاکو بێگەردی بۆ خودا!! ئەی ئێوە چۆن دەڵێن: ئاسمانەکانو چیاو زەریاو دەریاو مرۆڤو ئاژەڵو ڕۆژو مانگو ئەستێرەکان، هەموویان بە ڕێکەوت دروست بوون؟! کەچی ئێوە باوەڕ بە من ناکەن، کە تەنها بەلەمێکی بچوك بە ڕێکەوت دروست بوو بێت!! ﴿فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾﴾ البقرة. واتە: (ئینجا ئەو بێباوەڕە ڕەنگی پەڕیو دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خودا ڕێنمایی قەومی زاڵمو ستەمکار ناکات)..



بەڵێ.. بێباوەڕان ئا لێرەدا دەم کوت بوونو هیچ قسەیەکیان پێنەما..

خوشکو برایانی ئازیز: بە داخەوە بێباوەڕی ئەمڕۆ وا لە ئەوروپا دەردەکەوێتو پاشان بەرەو لای ئێمە ڕەوانەی دەکەن، لەوانەیە دەرکەوتنی ئەو دیاردەیە لە ئەوروپا بە دوور نەزانرێتو شتێکی نامۆ نەبێت، لەبەرئەوەی ئەوان بەرەنگاری ئایین دەبنەوەو پشتیان تێکردووە..

کاتێك دەڵێن: خودا عیسا ﷺی کردووە بە کوڕی خۆی، خوداش تەنها ئەو کوڕەی هەیە (پەنا بە خودا)!! بەڵام عیسا ﷺ هیچ منداڵێکی نیە.. لەبەرئەوە ئەوان بانگەشەی شتێك دەکەن کە ژیری باوەڕی پێناکات، کە خودا کوڕی هەبێت، بەڵام عیسا ﷺ نەیبێت!!

پاشان ئەوان بە جۆرەها لە ئارەزووبازیو ڕابواردنی دونیاییەوە سەرقاڵن، بەتایبەت چینی گەنجان، لە کچانو کوڕان.. سەرەتا بە جۆرەها ئارەزووەوە سەرقاڵ دەبنو بە هیچ شێوەیەك ئاوڕێك لە ئایین نادەنەوە، پاشان سەریان لە بێباوەڕییەوە دەردەچێت.. بۆچی؟!

لەبەرئەوەی دەیانەوێت بە ئارەزووی خۆیان چیان بووێت بیکەن.. خواردنەوەی عەرەق.. ئەنجامدانی هەموو کارێکی بەدڕەوشتی.. حەزی لە چی بوو بیخوات.. کەی ویستی بخەوێت.. کەی ویستی هەڵبستێت.. دوای هەموو ئەم شتانە، کاتێك ئامۆژگاریکارێك لە دڵیدا پێی بڵێت: ئەوە حەرامو نادروستە.. خودا لە ڕۆژی دواییدا سزات دەدات.. ئەو کردارەت ناشیرینو نامۆیە.. ئەو کاتە تاکە هۆکاری ڕزگار بوون لەو ئامۆژگاریکارەی ناخو دەروونی، ئەوەیە بانگەوازی بێباوەڕی خۆی بەرامبەر بوونی خودا ڕابگەیەنێتو بەرەو بێباوەڕیو بێ ئایینی هەنگاو بنێت..

بێباوەڕی ئەمڕۆ لە ئەوروپا زۆر بڵاوە.. بیرم دێت نزیکەی دە ساڵ لەمەوبەر، لە یەکێك لە وڵاتانی ئەوروپا سەیری سەرژمێرییەکەم کرد، کە ئەو وڵاتە ڕەسمی خاچ لە سەر ئاڵای وڵاتەکەشیان هەبوو، بەو مانایەی کە وڵاتێکن پەیڕەوی ئایینی مەسیحی دەکەن.. لە زۆربەی شوێنو جێگەکان کەنیسە هەبوو.. کاتێك بە شوێنێکدا دەڕۆیشتی، زۆرێك بە ناو وێنەی عیسا ﷺت دەبینی کە بە باوەڕی ئەوان لە خاچدرا بوو..

یەکێك لە پرسیارەکانی ڕاپرسیەکە بریتی بوو لەوەی: لە سەر چ ئایینێکیت؟

تەنها ١٣٪ لە وەڵامدا وتبوویان لە سەر ئایینی مەسیحین!!

یەکێکی تر لە پرسیارەکان ئەوە بوو: ئایا بۆ جارێکیش بێت، لە منداڵیدا یان لە یەکێك لە قۆناغەکانی خوێندندا، یان لە کاتی هاوسەرگیریدا، سەردانی کەنیسەت کردووە؟

٧٪ وتبوویان: بەڵێ لە ژیانمدا تەنها جارێك سەردانی کەنیسەمان کردووە!! هەروەها تەنها ١٪ وتبوویان: هەفتانە سەردانی کەنیسە دەکەین..

هەر بۆیە کەسانێکی بەریتانی یان فلیپینی یان ئەمریکی، لە دوای نوێژەکانی هەینی، کاتێك دێنو موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیەنن، پرسیاریان لێدەکەمو پێیان دەڵێم: لە ژیانتدا چەند جار سەردانی کەنیسەت کردووە؟ لە کاتێکدا تەمەنیان سی یان چل ساڵە..

لە وەڵامدا دەڵێن: تەنها یەکجاریش سەردانی کەنیسەمان نەکردووە؟ لێرەوە بێباوەڕی لە لای ئەو کەسانە دەست پێدەکاتو بڵاوبوونەوەی بێباوەڕی کارێکی سەیر نابێتو تەشەنە دەسێنێت..

بەڵام کاتێك تۆی بەڕێز، خاوەن ئاینی ئیسلام دەبیتو باوەڕێکی پتەوت بە پەروەردگارو بەرنامەکەی دەبێت، ئەوا بێباوەڕی لە لات دەبێتە کێشەیەکی گەورەو دەبێت چارەسەری بۆ دابنرێتو ڕێگەی لێبگیرێت، تا زیاتر گەنجو لاوەکان سەرگەردان نەبن..

بێباوەڕی لای کەسانێك ئەوەندە تەشەنەی کردووەو بە شێوەیەك سەرلێشێواوو سەرگەردانی کردوون، تەنانەت جاری وا هەیە، بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە دەتوانێت شتانێك دروست بکەنو گیانی بکەن بە بەردا!! پەنا بە خودا!!

* جارێك پیاوێك دەچێتە لای زانایەكو دەڵێت: دەتوانم شتانێك دروست بکەمو گیانیان بە بەردا بکەم..

زاناکەش دەڵێت: ئاوا!!

پیاوەکەش دەڵێت: بەڵێ.. بابڕۆین بۆ لای درەختێك.. بەشێك لە قەدی دارەکە هەڵدەکۆڵێتو پارچەیەك گۆشتی تێدەکاتو پاشان شوێنی قەدی درەختە هەڵکۆڵراوەکە دادەپۆشێتەوەو بە زاناکە دەڵێت، مانگێکی تر یەکتر دەبینینەوە..

پاش مانگێك کاتێك یەکتریان بینیەوەو چوونەوە لای درەختەکە، بۆ ئەوەی بزانن چی ڕوویداوە!!

پیاوەکە لە درەختەکە نزیك دەبێتەوەو پارچە هەڵکۆڵراوەکە لادەباتو بە زاناکە دەڵێت: سەیرکە!!

کاتێك سەیری دەکەن، لە دەوروبەری پارچە گۆشتەکە، هەندێك کرم دەبینن..

پیاوەکە بە زاناکە دەڵێت: سەیرکە، ئەوەتا من ئەم کرمانەم دروست کردووە!!

زاناکە دەڵێت:باشە ئەو کرمانەی دروستت کردون ژمارەیان چەندە؟

پیاوەکە: دەڵێت: نازانم..

زاناکە دەڵێت: ئەو کرمانە تۆ دروستت کردونو ناشزانی ژمارەیان چەندە؟! دەی چەندیان نێرو چەندیان مێیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: نازانم..

زاناکە دەڵێت: پاکو بێگەردی بۆ خودای تاکو تەنها!! تۆ دروستت کردوونو کەچی هیچ زانیارییەکت دەربارەیان نیە؟!

پیاوەکە بێدەنگ دەبێتو زمانی دەبەسترێتو هیچ قسەیەکی پێنامێنێتو بەڕاستی بۆی دەردەکەوێت، کە تەنها خودای گەورە توانای ئەوەی هەیە گیان بکات بە هەرشتێکدا کە بیەوێتو دروستکار بێت، هەر بۆیە هەر کەسێك داوای خودایەتی بکات، لە ڕووی ژیریەوە کەس باوەڕی پێناکات، تەنانەت لە ڕووی عاداتی ژیانی خەڵکیشەوە باوەڕی پێناکرێت..

* جوبەیری کوڕی مطعم، هات بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەدا نوێژی ئێوارەی بە هاوەڵانی دەکردو لە نوێژەکەدا ئەم ئایەتی دەخوێند..﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور. واتە: (ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێکو هیچ هۆیەك، هاتوونەتە کایەوە؟! یان هەر خۆیان دروستکارن؟!)..

جوبەیر دەڵێت: سوێند بە خودا کاتێك گوێم لەو ئایەتە بوو، خەریك بوو دڵم بفڕێتو لە جێگەی خۆی هەڵبکەنرێت..

بەڵێ.. ئایا ئێمە هەر لە خۆمانەوەو بەبێ دروستکارێك دروست بووین؟!

کاتێك پرسیار لە دەشتەکییەك کراو پێیان وت: چۆن خودات ناسی؟

لە وەڵامدا وتی: ئایا ئاسمانە بەرزەکانو زەوی فراوانو دەریاو زەریاو شەپۆلەکان، هۆکاری ئەوە نین خودای گەورەم پێ بناسێننو بەرەو لای ڕێنماییم بکەن؟!

پەروەردگاریش دەفەرموێت:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الأعراف.. واتە: (هەر ئەو خودایەیە کە بای شەماڵ (هەڵگری هەڵمی ئاو) دەنێرێت لە کاتێکدا مژدەیە (بۆ خەڵك) لە نێوان دوو دەستی ڕەحمەتی پەروەردگاردا، هەتا وای لێدێت کە ئەو بایە هەوری سەنگین هەڵدەگرێت، ئەوسا دەینێرین بۆ ناوچەو وڵاتێکی مردوو، جا بەهۆی ئەو ئاوەوە هەرچی بەروبوومە دەری دەهێنین، جا هەر ئا بەو شێوەیە مردووانیش لە ناخی زەوی دەردەهێنینو زیندوویان دەکەینەوە، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن)..

تێبینی ئەوە بکە، کە بایەکان، هەورەکان هەڵدەگرن، دەی کێ جگە لە خودا، ئەمە دەکات؟! هەر بۆیە ئێمە لە ژیانی دونیادا، لە ڕێگەی ناوو سیفاتو دروست کراوەکانیەوە، پەروەردگارمان دەناسین..

* کاتێك یەکێك لەو بێباوەڕانەی باوەڕیان بە بوونی خودا نیە، بە منداڵێکی موسڵمان دەگاتو پێی دەڵێت: ئەو خودایەی باوەڕت پێیەتی، دەستت لێیداوەو هەستت پێکردووە؟! ئەی بۆنت کردووە؟! گوێت لە دەنگی بووە؟!

منداڵەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر..

پیاوەکەش دەڵێت: کەواتە ئەو خودایە بوونی نیە..

پاشان منداڵەکە دەڵێت: ئەی تۆ ژیریو عەقڵت هەیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: بەڵێ..

منداڵەکە دەڵێت: دەستت لێیداوە؟! بۆنت کردووە؟! تامت کردووە؟! بینیوتە؟!

پیاوەکە دەڵێت: نەخێر..

منداڵەکەش دەڵێت: دەی کەواتە تۆ شێتیتو عەقڵت نیە!!

پیاوەکە دەڵێت: بەڵام من عەقڵم هەیە!!

منداڵەکە دەڵێت: چۆن دەزانی عەقڵت هەیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: بە شوێنەوارەکانیدا دەزانم کە خاوەنی عەقڵم، چونکە جێگەی خۆیەتی کاتێك پیاوێکی بە تەمەن ببینین بە ڕووتی بسوڕێتەوە، یان لەگەڵ منداڵاندا یاری بکات، پێی بڵێین: عەقڵی لە دەستداوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو هەڵسوکەوتانەوە کە شوێنەواری عەقڵو ژیرییان تێدا بەدی ناکرێت، ئەگەر نا خۆ کاسەی سەریمان هەڵنەداوەتەوە، تا بزانین عەقڵی هەیە یان نا، دەی ئێمەش لە ڕێگەی شوێنەوارو دروست کراوەکانی پەروەردگارەوە، دەزانین کە خودای پەروەردگار بوونی هەیە.. هەموو ئەو نیشانانەی لە سەر شاخو ئاسمانەکانو زەویو دەریاکان هەیە، شایەد حاڵی ئەوەن کە ئەمانە دروستکارێکیان هەیە..

بە داخەوە زۆرێك لە بێباوەڕانی ئەم سەردەمە کاتێك موسڵمان نابنو دان بە بوونی پەروەردگاردا نانێن، کۆتایی خۆیان بە خۆکوشتن دەهێنن، یان پەنا بۆ مادده هۆشبەرەکان دەبەنو عەقڵو ژیری خۆیان لە دەست دەدەن..

داواکارین پەروەردگار بمانکات بەو کەسانەی کە ڕێنمایی کراونو ڕێنمایی خەڵکی دەکەن.. خودایە باوەڕمان پتەوترو زیاتربکە.. لە سەر ئاینەکەت دامەزراومان بکەیت.. أمین..

# پەرستراوانێك جگەلە خودا..

لە پێش هاتنی ئیسلامدا، خەڵکانێك کۆمەڵێك بۆچوونو بیروباوەڕیان هەبوو، کاتێك ئیسلام هات، هەموو ئەو بیروباوەڕانەی سڕییەوەو پوچەڵی کردنەوە، لەوانەش بت پەرستی..

امرؤ القیس شاعیرێکی بە ناوبانگی سەردەمی نەفامی بوو.. پیاوێك دەیبینێتو پێی دەڵێت: فلانە کەس باوکتی کوشت..

باوکمی کوشت؟!

پیاوەکە دووبارە دەڵێت: بەڵێ کوشتی..

ئەمیش دەڵێت: ئەمڕۆ عەرەق دەخۆمەوەو سبەینێ کارەکە چارە دەکەم.. ئەمڕۆ خۆشی خۆم دەبینمو سبەینێ لەگەڵ بکوژی باوکم یەکلایی دەکەمەوە، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەم قسەیەی کە وتی: ﴿الیوم خمر وغداً خمر﴾ بوو بە پەند..

هەر بۆیە کاتێك ویستی ڕقی خۆی بەرامبەر بکوژی باوکی زیاد بکات، چەند پەرداخێکی هەڵگرتو لە بتەکەی نزیك کردەوە کە لە سەریان نوسراو بوو، (بیکە) یان، (مەیکە)و ژمارەیان پێنج یان، دە دانە بوون، هەڵی دەدانە بۆشاییەکی بتەکەوەو یان (بیکە)، یان (مەیکە) دەردەچوو، پاشان گوێڕایەڵی بتەکەیان دەکرد..

پەرداخەکانی هەڵداو وایدەزانی کە بتەکە هەموو شتێك دەزانێ، هەر بۆیە بە گەورەیان دەزانیو داوایان لێدەکردو ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕیو بە دەوریدا دەسوڕانەوە..

لە پێش ئیسلامدا ئەگەر سەیری کەعبەت بکردایە، بتێکی زۆرت لە دەوروبەری دەبینیو بێباوەڕان بە چەندان شێوە دەیان پەرستنو باوەڕیان وابوو، ئەو بتە بێ گیانانە، زەرەرو زیانیان لێ دوور دەخەنەوەو شیفای نەخۆشەکانیان دەدەنو ونبووەکانیان بۆ دەگێڕنەوەو ئاشکراو نهێنییان دەزانن، بەڵام ئیسلام ئەمانەی هەمووی پووچ کردەوە..

بەڵێ امرؤ القیس پەرداخەکانی هەڵدایە بەردەم بتەکەو ئەوەیان دەرچوو کە لێی نوسرا بوو (مەیکە).. دوو سێ جار دووبارەی کردەوەو پەرداخەکانی هەڵدایەوەو هەر یەکێك لەوانە دەردەچوو، کە لێی نوسرا بوو (مەیکە)، واتە: بکوژی باوکت مەکوژەو ئەو کارە مەکە..

پەرداخەکانی کۆکردەوەو کێشای بە دەموچاوی بتەکەداو وتی: ئەگەر کوژراوەکە باوکی تۆ بووایە، پێت دەوتم: (بیکە)، واتە: بیکوژە، پاشان هەستاو ڕۆی بۆ کوشتنی بکوژی باوکی..

لێرەدا مەبەستمان لەم ڕووداوە، بیروباوەڕی ئەو کەسانە بوو، بەرامبەر کۆمەڵە دارو

بەردێکی بێ گیان..

* ئەبورەجائی عەتاردی دەڵێت: لە نەفامیدا بەردو دارمان دەپەرست، جارێکیان چووین بۆ گەشتێکو ئەو بەردەشمان لەگەڵ خۆمان برد، کە دەمان پەرست، کاتێک دەمانویست چێشت لێبنین دەبووایە سێ بەرد بخەینە ژێر مەنجەڵکەوەو پاشان ئاگر بخەینە ژێری..

دوو بەردمان دەسکەوت، بەڵام زۆر گەڕاین بەردی سێیەممان نەدۆزیەوە، هەر بۆیە ئەو بەردەمان هێنا کە دەمانپەرستو خستمانە ژێر مەنجەڵەکە..

دوای چەند ڕۆژێك، ڕۆیشتینو شوێنەکەمان جێهێشت.. سەیری کەمی عەقڵو ژیری سەردەمی نەفامی بکەن!! بەڵێ.. ئەبو ڕەجاء دەڵێت: کاتێك ڕۆیشتین، کەسێکمان هاواری کردو بە دەنگی بەرز وتی: ئەو خودایەی کە ون بوو، بیدۆزنەوە.. زۆرێك گەڕاین بە دوای بەردەکەدا، کاتێك بۆ دۆزینەوەی بەردەکە دەگەڕاین، یەکێکی ترمان وتی: بە دڵنیاییەوە خوایەکەتان، یان شتێکی هاوشێوەی خواکەتانم دۆزیەوە..

بەڵێ.. لێی نزیك بووینەوەو وشترمان بۆ سەربڕی.. من دەزانم پێکەنینتان بەو کارەی ئێمە دێت، هەروەها دەزانم پێکەنینتان بە عومەری کوڕی خەتتابیش‌ﷺ دێت، کاتێك دەڵێت: پارەم نەبوو بتێك بکڕم، هەر بۆیە هەندێك خورمام لەلا بوو، بتێکم لێ دروستکردو نوێژم بۆ دەکرد، کاتێکیش برسیم بوو، خواردم!!

ئەمانەی باسمان کرد، پەرستنی چەند شتێکی بێ نرخ بوو، کە نە زیانو نە قازانجیان هەیە، هەر چەندە تا ئێستاش هەندێك لەو شتانە ماون..

بۆ نمونە: ئەگەر بڕۆیت بۆ سریلانکا، یان یابان، بەو هەموو پێشکەوتنەی کە هەموو جیهانیان سەرسام کردووە، کەچی ڕێنمایی نەکراون بۆ ئەوەی پەروەردگاری تاکو تەنها بپەرستنو هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، تا ئێستاش لە سەر ئاینی بوزین.. بڕۆ بۆ کۆریاو چین، بەو هەموو پێشکەوتنەی کە هەیانە، لەگەڵ ئەوەشدا بت دەپەرستن.. کاتێك دەبینی چۆن دەیپەرستن سەرسام دەبیت!! بە دەستی خۆیان بتەکەیان دروست دەکەنو دەیپەرستنو داوای لێخۆشبوونی لێدەکەن!!

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾﴾ الحج. واتە: (ئەی خەڵکینە: نمونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێی بۆ بگرن: بەڕاستی ئەوانەی کە هاناو هاواریان لێدەکەن لە جیاتی خودا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوەو (یارمەتی یەکتریش بدەن)و ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هەردووکیان لاوازو بێدەسەڵاتن)..

هەروەها دەفەرمویت: ﴿ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ﴾ فاطر. واتە: (خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لێتان نیەو نابیستن، ئەگەر بشبیستن بە دەمتانەوە نایەن، ڕۆژی قیامەتیش حاشا دەکەن لێتانو ئاتاجی خودان، (لە هەموو کاتو شوێنێکداو بۆ هەموو شتێك) هەر تەنها خودایە کە بێ نیازەو شایانی سوپاسە).. پەروەردگار باسی هەموو ئەو بتانە دەکاتو ڕوونی دەکاتەوە کە هیچ سوودو زیانێکیان نیە..

ئەوەی زۆر سەیرە!! لەو وڵاتانە لە چین، لە یابان، مامۆستای زانکۆ یان پزیشك، یان ئەندازیار، دێتو جلێکی سور لەبەر دەکاتو سەری بۆ بتێك نزم دەکاتەوە، یان بە دەوریدا دەسوڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونو شیفای نەخۆشیو لاچوونی غەمو پەژارەی لێدەکات!!

کەسانێکی تر هەن، لە وڵاتانی موسڵمانانو دەوروبەرمان، دەچن بۆ سەر قەبر، داوای لێدەکەنو لێی دەپاڕێنەوە، یان لە سەر قەبرەکە شوێنێك، یان دیوارو ژوورێك دروست دەکەنو دەستی لێدەدەنو بە دەوریدا دەسوڕێنەوە..

ئەو کەسانەی کە پارە لەو شتانەدا خەرج دەکەن، بۆ لە هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندنو خزمەت کردنی وڵاتدا خەرجی ناکەن؟! لە جیاتی ئەوەی داوا لە پەروەردگار بکەنو هەر لەویش بپاڕێنەوە، پەنا بۆ شتانێکی بێ گیان دەبەن، کە توانای ئەوەیان نیە سودێکی کەم بە خۆشیان بگەیەنن، چ جای بە خەڵکی تر!!

چ فەرقێك هەیە لە نێوان ئەوانەی دەست بە قەبردا دەهێننو بە پیرۆزی دەزانن، لەگەڵ ئەوانەی دەست بە پەرستراوەکانیاندا دەهێننو دەیانپەرستن؟! پەروەردگار ڕازی نابێت، جگەلە خۆی هیچ کەسو هیچ شتێکی لەگەڵدا بپەرسترێت، ﴿ وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ الجن. واتە: (دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی خودای گەورەن، دەبێت هەر ئەوی تێدا بپەرسترێنو ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریكو هاوتای ناوی ئەو زاتە)..

بەڵێ.. دروست نیە هیچ شتێك لەو شتانەی کە تایبەتە بە پەرستنی پەروەردگار، بۆ هیچ کەسێك یان بۆ هیچ شتێك بەکاربهێنرێت، لە کاتێکدا کەسانێك شتێك دەپەرستن، کە ناتوانن تەنها مێشولەیەك لە خۆیان دووربخەنەوە، ئیتر چۆن دەتوانن سوود، یان زیانت پێبگەیەنن؟!

* هاوەڵانی پێغەمبەری خوداﷺ بە باشی لەم بابەتە تێگەیشتبوون، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ موصعەبی کوڕی عومەیریﷺ وەك یەکەم نوێنەر نارد بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی بانگی خەڵکی مەدینە بکات بۆ ئیسلام، کاتێك گەیشتە مەدینە، بانگی کردن بۆ ئەوەی موسڵمان بنو واز لە بت پەرستی بێنن.. لە ناو ئەو کەسانەی کە موسڵمان




بوون، چوار لە کوڕانی عەمری کوڕی جەموحیان تێدابوو..

عەمرﷺ لە دوای موسڵمان بوونی، بوو بە یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوداﷺ..

عەمر قاچێکیشی شەل بوو.. کوڕەکانی ویستیان باوکیشیان موسڵمان بێت، پێشتریش دایکیان موسڵمان بوو بوو، هەر بۆیە بە باوکیان وت: باوە گیان، پیاوێك هاتووە بۆ شارەکەمان، بانگەواز بۆ یەکتاپەرستیو یەکخواپەرستی دەکات، بۆچی ناچیت بۆ لایو گوێی لێبگری؟!

باوکیان لە وەڵامدا وتی: نا.. ناچم.. من بتێکم هەیە کە دەیپەرستم بە ناوی (مەناف)..

کوڕەکانی وتیان: بڕۆ بۆ لایو گوێی لێبگرە، خۆ هیچ زیانت لێناکەوێت؟!

باوکیان بە گوێی کوڕەکانی کردو ڕۆیشت بۆ لای موصعەبی کوڕی عومەیرﷺو لە لای دانیشتو کەمێك گوێی بۆ قورئان شل کرد، لە دوای ئەمە چیرۆکێکی سەیر لە نێوان عەمرو بتەکەیدا ڕوویدا!!

عەمر بە کۆڵانەکانی مەدینەدا کەوتە ڕێ بۆ لای موصعەبﷺ مەدینەش وەکو ئێستا نەبوو، پڕبوو لە خانووی کۆنو دارو درەخت..

بەڵێ.. بەرەو لای موصعەبﷺ کەوتە ڕێو گەیشتە لایو وتی: بۆ لای چی بانگەواز دەکەیت؟!

موصعەبﷺ فەرمووی: بۆ لای خودای پەروەردگارو بۆ لای باوەڕبوون بە پێغەمبەری خوداﷺ، پاشان موصعەبﷺ قورئانی بە سەر عەمری کوڕی جەموحدا خوێند.. عەمر زۆر بە قورئانەکە سەرسام بوو، بەڵام یەکسەر باوەڕی نەهێنا، بەڵکو وتی: من یەکێکم لە گەورەکانی هۆزەکەم، ئێستا ناتوانم بڕیار بدەم..

عەمر گەڕایەوە بۆ لای بتەکەیو وتی: ئەی مەناف کەسێك دەیەوێت بتشکێنێت!! مەناف تۆ چی دەڵێیت؟!

لەبەر خۆیەوە دەڵێت: لەوانەیە مەناف ئەمشەو توورە بێت، تا بەیانی وازت لێدێنم..

کاتێك شەو داهات، کوڕەکانی چوون بۆ لای بتەکەو هەڵیان گرتو بردیان لە زبڵدانێك فڕێیاندا..

عەمر بەیانی کاتێك لە خەو هەڵسا، چوو بۆ لای مەناف، بەڵام مەنافی لێنەمابوو!! مەناف لە کوێیە؟! کوا خوداکەمان؟!

کوڕەکانی وتیان: نازانین.. عەمر لە دەوروبەریماڵەکەیان گەڕا، هەتا لە زبڵدانێکدا دۆزییەوە، کاتێك دۆزییەوە، وتی: تۆ ناتوانیت پارێزگاری لە خۆت بکەیتو خەڵکی گاڵتەت پێدەکەن، کە چی من بەتەمام تۆ شیفای نەخۆشیم بدەیتو قەرزەکانم بۆ

بدەیتەوەو کارم بۆ ئاسان بکەیت!!

لەگەڵ هەموو ئەم قسانەشدا، هەڵیگرتەوەو پاك شۆری‌و بۆنی خۆشی لێداو بردیەوە بۆ ماڵەوە، پاشان وتی: مەناف وادیارە بەهۆی ئەوەی سوکایەتییان پێکردووی، زۆر تووڕەی؟ کاتێك شەو داهات شمشێرێکی هێناو بە بتەکەدا هەڵیواسی، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە خۆی پێبکات!!

کاتێك شەو داهات، بە هەمان شێوەی شەوی یەکەم، کوڕەکانی هاتن‌و شمشێرەکەیان لە بتەکە کردەوەو بتەکەیان بردو بە سەگێکی تۆپیوەوە بەستیانەوە، پاشان خستیانە بیرێکی کۆنی وشکەوە، کە ئاوی تێدا نەبوو..

بەیانی عەمر بە هەمان شێوە بە دوای بتەکەدا کەوتە گەڕان، بەڵام نەیدۆزیەوە، پاش گەڕانێکی زۆر وتی: کێ دەستدرێژی کردۆتە سەر خوداکەمان؟!

کوڕەکانی وتیان: نازانین.. پاشان گەڕا، هەتا لە بیرەکەدا دۆزییەوە، کە بە سەگێکی تۆپیوەوە بەسترا بۆوە، پاشان ئەم هۆنراوەیەی وت:

والله لو كنت إلهاً لم تكن      أنت وكلب وسط بئرٍ في قرن..

واتە: سوێند بە خودا ئەگەر خودا بوویتایە، لەگەڵ سەگێکدا لە بیرێکدا نەدەبوویت، پاشان چوو بۆ لای موصعەبی کوڕی عومەیرﷺو موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند..

کاتێك کەسێك هەژار دەکەوێت، یان نەخۆش دەبێت، یان غەمبار دەبێت، پەنا بۆ قەبرێك، یان بتێك دەبات، یان وەکو هیندۆسەکان پەنا بۆ مانگا دەبەن‌و بە خودای خۆیانی دەزانن‌و دەیپەرستن، چونکە سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤ حەزی بە بەندایەتی هەیە، دەبێت شتێك بپەرستێت، پەروەردگاریش سروشی بۆ پێغەمبەرانی کردووە، بۆ ئەوەی خەڵکی فێربکەن کە خودای گەورە بە تاك‌و تەنهایی بپەرستن‌و هیچ هاوەڵی بۆ دانەنێن..

لە هیندستان کەسی وا هەیە، سەرەڕای بەرزی پلەی کۆمەڵایەتی، لە دوای مانگایەکەوە دەڕوات، بۆ ئەوەی لێی نزیك بێتەوەو بیپەرستێت‌و بەندایەتی خۆی بۆ دەرببڕێ، خۆ ئەگەر ئەو مانگایانە ڕێگەیەك بگرێت، ئەترسن بیجوڵێنن، لەبەر ئەوەی مانگایە!! جاری وا هەیە ئەو سەروەت‌و سامانەی لە خزمەت کردنی مانگایەکدا خەرجی دەکەن، لە باوك‌و دایك‌و منداڵەکانیاندا خەرجی ناکەن!!

پەروەردگار باسی بەندایەتی هەندێك لە مەسیحیەکانمان بۆ دەکات بۆ عیسا‌ﷺو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٩٤ ﴾ الأعراف. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن‌و جگە لە خودا لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەك ئێوەن (هیچیان بە دەست نیە) دەهاواریان لێبکەن، بابێن بە دەمتانەوە، ئەگە ئێوە ڕاست دەکەن).. عیسا‌ﷺ بەندەی

خودایە، چۆن دەیپەرستیت؟!

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ ﴾ الإسراء. واتە: (هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەموو ئەوانەی کە تیایاندا هەن، تەسبیحاتو ستایشی ئەو زاتە دەکەن، هیچ شتێك نیە لەم بوونەوەرەدا کە تەسبیحاتو ستایشو سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحاتو ستایشی ئەو شتانە تێناگەن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشەو بەردەوام خۆگرو بەحەوسەڵەیە (لە بەرامبەر لادانی خەڵکیەوە) لێخۆشبووەو چاوپۆشی دەکات (ئەگەر ڕووی تێبکەنو باوەڕی پێبهێنن))..

سەیرە!! کەسێك کە لەوانەیە بڕوانامەی بەرزی هەبێت، کەچی بەندایەتی بۆ ئاژەڵێك دەکات، کە هیچ لێپرسینەوەیەکی لە سەر نیە، چونکە ئاژەڵان ئاگادار نەکراونەتەوە، هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ﴿١٥﴾ ﴾ الإسراء. واتە: (ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین)..

مرۆڤ کاتێك وازی لە بەندایەتی پەروەردگارو یەکخواپەرستی هێنا، نرخی باڵە مێشولەیەکی لە لای پەروەردگاری نامێنێت، هەروەك پێغەمبەری ئازیزﷺ دەفەرموێت: ((لو كانت الدنيا تساوي عندالله جناح بعوضةٍ، ماسقى الكافِرُ منها شربة ماء)). رواه البخاري. واتە: (ئەگەر دونیا بە ئەندازەی باڵە مێشولەیەك لە لای پەروەردگار نرخی هەبووایە، ئەوا بێباوەڕانو کافران ئاوێکیان لێ نەدەخواردەوە)..

هەر بۆیە ئەمڕۆ خەڵکی لە زۆرێك لە جۆرەکانی هاوەڵدانان ئاگادار دەکەمەوە، بۆ ئەوەی تووشی ئەو تاوانە گەورەیە نەبن..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ڕۆژی دوایی نایات، هەتا خەڵکی لە یەکتاپەرستیو یەکخواپەرستی دوور دەکەونەوەو بەرەو هاوەڵ بۆ خوا دانان دەچنو تووشی چەندین جۆر لە هاوەڵدانان بۆ پەروەردگار دەبن..

ئەمڕۆ هەندێك گۆڕ بە گەورە دادەنرێنو بە دەوریدا دەسوڕێنەوەو بە سەریدا دەگرینو لێی دەپاڕێنەوەو پاشان دەڵێن: ئێمە خوداپەرستین!!

لە ڕاستیدا خودا ناپەرستن، ئەگەر خودا دەپەرستن، با بە دڵسۆزیو بە پاکی بیپەرستنو لە غەیری خودا پەنا بۆ هیچ شتێکی تر نەبەن؟!

دواکارین خودا بە یەکخواپەرستی بە خۆیمان شاد بکاتو لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بمان ژمێرێت، کە یەکخواپەرستو یەکتاپەرستن، داواکارین یارمەتیمان بداتو بمان پارێزێت، لەوەی کە بە هیچ شێوەیەك نەکەوینە ناو زەلکاوی هاوەڵ بۆ خودا دانانەوە.. أمین..

# چەند هەڵوێستەیەك لەگەڵ هاوەڵە مەسیحیەكان..

پەروەردگار هەموو پێغەمبەرانی بە یەك بیروباوەڕەوە ناردووە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ...﴿٤﴾﴾ إبراهيم. واتە: (ئێمە هیچ پەیامبەرو فرستادەیەکمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بە زمانی قەومەکەی نەبێت، (یەکێك بووە لە خۆیانو بە زمانی ئەوان دواوە) تا هەموو شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە)..

بۆ ڕوون کردنەوەی چ شتێك؟! ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ...﴿٣٢﴾﴾ المؤمنون. واتە: (تەنها خودا بپەرستن، جگە لەو زاتە خودایەکی ترتان نیە)..

هەموو پێغەمبەران کاتێك بۆ لای گەلەکانیان نێردراون، داوایان لە گەلەکەیان کردووە، کە تەنها خودای پەروەردگار بپەرستن، چونکە جگەلە خودای گەورە، هیچ خودایەکی ڕاستەقینە بوونی نیە، هەر بۆیە کەسانێك لە گەلانی پێشوو، کاتێك تووشی هاوەڵدانان دەبوون، شتێکی تریان دەپەرستو دەیاندایە پاڵ پەرستنی خودا، وەك ئەوەی منداڵیان دەدایە پاڵ خوداو دەیانپەرست، هەروەك جولەکەکانو مەسیحیەکان بە عوزەیر ﷺو عیسا ﷺیان دەوت: کوڕی خودا، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ...﴿٣٠﴾﴾ التوبة. واتە: (جولەکە وتیان: عوزەیر کوڕی خودایە، گاورەکانیش وتیان: مەسیح کوڕی خودایە!! ئا ئەو بوختانە (نابەجێیانە) قسەی ئەوانەو بە دەم دەیڵێنو لێی تێناگەن)..

بۆچی دەیان وت: عوزەیر ﷺ کوڕی خودایە؟!

لەبەر ئەوەی پێغەمبەرو پیاوچاك بوو.. لە ئاسمانەوە خواردنی بۆ دەهات، هەر بۆیە دەیان وت: باوکی خواردنی بۆ دەنێرێتو دەیاندایە پاڵ خودا، مەسیحیەکانیش بە هەمان شێوە بە عیسا ﷺیان دەوت: کوڕی خودا!! پەنا بە خودا!!

* وەرن با لەگەڵ هاوەڵە مەسیحیەکانماندا هەڵوێستەیەك بکەین..

من هاوەڵی مەسیحیم هەیە، خەڵکیش هەروەها.. دراوسێم هەیە مەسیحیە، خەڵکیش دراوسێی مەسیحییان هەیە، لە نێوان منو ئەواندا پەیوەندیەکی جوانو نەرمو نیان هەیە.. پێکەنینو هاتوچۆمان هەیە.. هەندێکیان چەندین خولیان لەگەڵ خوێندووم.. ئێستاش هەندێکیان هاوەڵمن، هەر چەندە مەسیحینو موسڵمان نین..

پێغەمبەری خودا ﷺ دراوسێی جولەکەی هەبوو، هەروەها دیاری بۆ مقوقیسی مەسیحی ناردو دیاریشی لێ وەردەگرت.. ئەم پەیامەی ئێستام، دانیشتنو هەڵوێستەیەکە لەگەڵ کەسێکی مەسیحیدا، ڕووداوەکە لە نێوان منو خاوەن تەکسیەکدا ڕوویدا..

* جارێکیان لە میسر بووم، لە پێشانگایەکی کتێب، ویستم تەکسییەك بگرم بۆ

ئەوەی بمگەیەنێتە فرۆکەخانە.. لە سەر ڕێگایەك وەستامو ئاماژەم بۆ تەکسیەك کرد، شۆفێرێکی گەنج وەستاو لەگەڵی سەرکەوتمو لە سەر نرخێك ڕێکەوتین، کە بمگەیەنێت..

لە نیوەی ڕێگە، دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵیو وتم: حاڵت چۆنە؟ وتی: بە ویستی خودا باشین..

ماندوویت ها؟

وتی: بەخوا کەمێك ماندووم، بەڵام قەیناکە لە پێناو منداڵەکانمدایە..

وتم: دەی مادام لە پێناو منداڵەکانتدا ئاوا ماندوو دەبیت، خێرو پاداشتت دەگات..

لە ڕێگە سەیرم کرد، بە شێوەی خاڵ خاچی لە سەر دەستی دروست کرد بوو، منیش پرسیم: ئەوە چیە؟

وتی: خاچە..

وتم: جابۆچی خاچ؟!

وتی: ئاخر من مەسیحیم..

وتم: ناوت چیە؟

وتی: یاسر..

وتم: یاسر ڕازی دەبیت باسێکی ئیسلامو مەسیحیەتت بۆ بکەم؟

وتی: بەڵێ.. فەرموو..

وتم: یاسر ئێستا تۆ دەڵێیت: عیسا کوڕی خودایە، وانیە؟

وتی: بەڵێ.. عیسا کوڕی خوداکەمانە..

وتم: خودا حەزی لێیە منداڵی هەبێت، هەر بۆیە کوڕێکی هەیە بە ناوی عیسا، وایە؟

وتی: وایە..

وتم: باشە یاسر مادام خودا حەزی لە منداڵەو ئەو حەزەش لە لای خودا هەر هەیە، بۆچی خودا منداڵی تری نیە؟!

وتی: دەی خودا خۆی ئەوەی دەوێت..

وتم: نەخێر.. خودا ئەوەی ناوێت، ئێوە ئەوەتان دەوێتو ئەوە دەڵێن..

خاڵێکی تر.. مادام خودا کوڕێکی هەیە بە ناوی عیسا، ئەی بۆچی عیسا منداڵی نیە، ئەی ئەگەر خودا منداڵی هەیە، ئەی بۆچی دایكو باوکی نیە، تا باوكو دایکیشی بپەرستین؟!

وتی: نازانم.. خودای ئێمە ئاوایە ئیتر..

وتم: بابەتێکی تر.. تۆ دەڵێیت: عیسا عليه السلام کوڕی خودایەو لە خاچدراوە، بۆ پاك بوونەوەو لەبری گوناه..

وتی: بەڵێ..

وتم: کام گوناه..

وتی: گوناهی ئادەم..

وتم: کام گوناهەی ئادەم..

وتی: ئادەم کاتێك چووە بەهەشتەوەو لە بەری درەختەکەی خوارد، خودا سزایداو لێی خۆش نەبوو، لە نەوەکانیشی خۆش نەبوو، هەتا خودا منداڵە تەنهاکەی خۆی نارد لە خاچدرا، بۆ سڕینەوەی گوناهی ئادەمو نەوەکانی..

وتم: زۆر باشە.. ئادەم هەڵەی کرد، یان عیسا؟

وتی: ئادەم..

وتم: دەی ئادەم هەڵەو گوناهی کردووە، ئیتر بۆچی عیسا لە خاچ بدرێت؟! با ئادەم لە خاچ بدرایا!!

وتی: بەخوا من نازانم، بەڵام ئیتر ئاوایە..

وتم: گوناهی ئادەم خواردنی بەری درەختەکە بوو، وانیە؟!

وتی: بەڵێ..

وتم: ئادەم دارەکەی لە ڕەگەوە هەڵکێشا؟

وتی: نەخێر..

وتم: ئادەم خۆ یەکێك لە فریشتەکانی نەکوشت؟

وتی: نا.. گوناهێکی بچوك بوو، خواردنی بەری درەختێك..

وتم: دەی ئەو گوناهە بچوکە، تەنها بەوە دەسڕێتەوە، خودا تەنها کوڕەکەی بنێرێتە خوارەوەو لە خاچ بدرێت؟! دەی دەکرا، خودای گەورە ئەو هەڵەو تاوانەی بە هەندێك شتی تر بسڕیایەتەوە، وەك سزای بداینایە بە نەخواردنەوەی ئاوی سارد، یان هەموو ڕۆژێك چەند ساتێك لەبەر تیشکی خۆر دانیشتینایە، یان فەرز کردنی سەد نوێژ، یان لە سەری نەزر کردینایە نیوەی سامانەکەمان بکەین بە زەکات، یان هەر سزایەکی تر، پاشان هەڵەو گوناهو تاوانو سزا، دەبێت لەگەڵ یەکدا گونجاو بن..

بۆ نمونە: کاتێك لە سەر کۆمپیوتەر کار دەکەمو یەکێك لە منداڵەکانم دێت کە تەمەنی دە ساڵێك دەبێتو یاری بە کۆمپیوتەرەکە دەکات، منیش بەوە سزای دەدەم، کە بە سەریدا هاوار بکەمو پێی بڵێم: جارێکی تر یاری بە کۆمپیوتەر نەکەیت.. ئەم سزایە لەگەڵ هەڵەی منداڵەکەمدا گونجاوە، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست هاتو کوپێك چای بە سەر کۆمپیوتەرەکەدا ڕژاند، ئەوا هەڵەکەی گەورەترەو پێویستە سزاکەشی گەورەتر بێت..

سڕینەوەی تاوانی ئادەم، تەنها بەوە دەبێت خودا تاقە کوڕەکەی بنێرێتە خوارەوە بۆ ئەوەی لە خاچ بدرێت؟!

دەی گریمان ئادەم دوو هەڵەی بکردایە، سڕینەوەی هەڵەی یەکەم بە لە خاچدانی کوڕی خودا کۆتایی بهاتایە، ئەی سڕینەوەی هەڵەی دووەم؟!

یاسر، عیسا ﷺ وەکو تۆ دەڵێیت: کوڕی خودایە، دەی چۆن کوڕی خودا دەبێت لە خاچ بدرێت، ئێمە دەزانین مەسیح لە خاچ نەدراوە، بەڵکو پەروەردگار بەرزی کردۆتەوە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾﴾ النساء. واتە: (کەچی لە ڕاستیدا نە کوشتوویانەو نە لە قەنارەو خاچیانداوە، بەڵکو لێیان تێکچووەو (کەسێکی تریان کوشتووە لەبری ئەو)، بەڕاستی ئەوانەی کە بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە، خۆشیان لە گوماندان تیایداو ئەوانە هیچ زانستێکی ڕاستیان نیە لەو بارەیەوە، جگە لە شوێنکەوتنی گومان نەبێتو بە دڵنیاییشەوە (دەڵێن) کە نەیان کوشتووەو بۆیان نەکوژراوە)..

یاسر وتی: جولەکە هاتنو بە خاچێکەوە بەستیانەوەو بە بزمار دایانکوتی..

وتم: ئازاری پێگەیشت؟!

وتی: زۆریش..

وتم: باشە خودای گەورە کە وەکو تۆ دەڵێیت باوکییەتی، بەو شێوەیە دەیبینی؟!

وتی: بەڵێ..

وتم: هاوارەکانی دەبیست؟!

وتی: بەڵێ..

دەی خودا خۆ دەیتوانی ڕزگاری بکات؟!

وتی: بەڵێ..

وتم: باشە ئەی بۆ ڕزگاری نەکرد؟!

وتی: بۆ سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانمان..

وتم: باشە بۆچی خودا ڕێگەیەکی تری بەکارنەهێنا بۆ سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانمان؟! بۆچی خودا کوڕە تاقانەکەی تووشی سزاو ئازار کرد، لە پێناو سڕینەوەی گوناهو هەڵەی ئادەم..

پاشان پرسیارێکی ترم لێکردو وتم: ئێستا عیسا لە خاچدرا، ئایا گوناهی هەموو ئەو ئەو کەسانەی بە گوناهو تاوانەوە مردوون، سڕاونەتەوە؟!

وتی: نا، تەنها بۆ سڕینەوەی گوناهی سەردەمی عیساو ئەوانەی لە دوای عیسا هاتوون.. وتم: باشە ملیۆنەها کەس لە نێوان ئادەم ﷺو عیسا ﷺدا مردوون، ئایا هەموو ئەوانە بە گوناهو تاوانەوە مردوونو چوونەتەوە بۆ خزمەتی پەروەردگار؟!

بۆچی خودا عیسای زووتر نەناردو پاشان لە خاچ بدرێت، بۆ ئەوەی گوناهو تاوانی ژمارەیەکی زیاتر بسڕێتەوە؟!

وتی: خودای ئێمە ئاوای دەوێت..

وتم: باشە تۆ دەڵێی، عیسا کوڕی خودایە، کەواتە ئەویش بەشێکە لە خودا، خوداش

هەرچیەکی بوویت، دەیکات، گریمان عیسا دەیەویت شتێك بکاتو خوداش دەیەوێت شتێکی تر بکات..

بۆ نمونە: خودا دەیەوێت فلانە کەس لە کاتژمێر پێنج بمرێت، بەڵام عیسا ﷺ بیەوێت ئەو کەسە تا سبەینێ بژێتو پاشان بمرێت، لەم کاتەدا قسە قسەی کامیان دەبێت، خودا، یان عیسا ﷺ؟!

وتی: قسەی خودا جێبەجێ دەبێت..

وتم: کام خودا؟! ئێوە سێ خوداتان هەیە!!

وتی: مەبەستم خودای باوکە..

وتم: کەواتە عیسا ﷺ خودا نیە، لەبەر ئەوەی قسەکانی ناڕواتو جێبەجێ نابێت!! مەرجی بوون بە خودا ئەوەیە، کە چی ویست بتوانێت بیکات..

وتی: قسەی هەموویان هەر دەڕوات..

وتم: ئاخر نابێت لە یەك کاتدا دوو شت پێچەوانە ڕوو بدات، وەك ئەوەی کەسێك مردووش‌و زیندووش بێت؟! پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ... ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون. واتە: (هەرگیز خودا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی‌و هیچ خودایەکی لەگەڵدا نیە)، پاشان پەروەردگار دەفەرموێت: ئەگەر خودایەکی تر هەبووایە، ﴿إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون. واتە: (چونکە ئەو کاتە هەر خودایەك دەچوو بۆ لای دروستکراوانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی‌و بێگەردی بۆ ئەو زاتی خودایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خودا نەناسان) هەڵی دەبەستن‌و دەیڵێن)..

پەروەردگار خۆی شاهیدی دەدات، کە هیچ کەسێکی نەکردووە بە منداڵی خۆی، هیچ کەسیشی نەکردووە بە هاوبەشی خۆی، پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگار..

بەم شێوەیەی کە باسم کرد، گفتوگۆم لەگەڵ ئەو گەنجەدا کرد، پاشان وتم: گوێ بگرە یاسر، سوێند بە خودا من بۆ تۆ ئامۆژگاری کارێکی باشم، خێرو خۆشیم بۆت دەوێت، هەروەك پەروەردگار ئەگەر بیویستایە منداڵ بۆ خۆی بڕیار بدات، ئەوا کێی بویستایەو ویستی لە سەر کێ بووایە، هەڵیدەبژارد، بەڵام پەروەردگار هیچ پێویستییەکی بە منداڵ نیە، خودای گەورە نە لە کەس بووەو نە کەسی لێبووە، هیچ کەسێکیش هاوشانی پەروەردگار نیە..

ئەم بۆچوونەش بۆچوونێکی مەسیحیە، کە دەڵێت: عیسا ﷺ خودایە، یان کوڕی خودایە، من وەکو ئامۆژگاری کارو دڵسۆزێك قسەیان لەگەڵ دەکەم، سوێند بە خودا خێرو خۆشی‌و چاکەم بۆیان دەوێت، هەڵسوکەوتم لەگەڵ چەندین کەسی مەسیحیدا کردووە، وەکو پێشتریش باسم کرد، دیاری‌و هاتوچۆو هەواڵ پرسینمان لە نێواندا هەیە،

سوێند بە خودا حەز ناکەم لە سەر ئەو بیروباوەڕیان بمرن، لە سەر ئەو بیروباوەڕەی کە دەڵێن: خودایە تۆ سیانیت!! خودایە بە تەنها تۆ ناپەرستم، بەڵکو دووانی تریشت لەگەڵ دەپەرستم!! پەنا بە خودا!!

بەراستی ئەمە هاوەڵدانانو گوناهێکی زۆر گەورەیە.. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾ مريم. واتە: (جولەکەو گاورو بت پەرستان دەیانوت: خودای میهرەبان ڕۆڵەو نەوەی بۆ خۆی داناوە!! سوێند بە خودا بەڕاستی بوختانێکی ناقۆڵا دەکەنو گوفتارێکی ناشایستەو سەرسوڕهێنەر دەڵێن.. خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵایی ئەو گوفتارە نابەجێیە، لەتو پەت ببێتو زەوی خەریکە شەق بەرێتو ڕۆبچێت، کێوەکانیش خەریکە بکەونو وردو خاش ببن.. کاتێك کە نەفامان بوونی ڕۆڵەو نەوەیان دایە پاڵ خودای میهرەبان.. لە کاتێکدا بۆ خودای میهرەبان نەهاتووەو ڕەوا نیە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات.. هیچ کەسێك نیە لە ئاسمانەکانو زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خودای میهرەبان نەبێت.. سوێند بە خودا بێگومان هەر هەموویانی سەرژمێر کردووەو یەك یەك ژمارەی کردوون (کەسی لێ ون نابێت)، هەر هەموویان ڕۆژی قیامەت دێنە پێشەوە، بۆ لای بە تاکو تەنها (بێ پاسەوانو بێ کەس).. یەکە یەکەی ئەو خەڵکە بە تاکو تەنهایی دێتو لە بەردەم دادگای پڕ لە دادوەری خودادا ئامادە دەکرێت)..

بەڵێ.. بە هیچ شێوەیەك دروست نیە بۆ هیچ کەسێك، منداڵ بداتە پاڵ خودای بێ هاوتا.. پەروەردگار تاکو تەنهایەو هیچ هاوەڵێکی نیە، عیسای کوڕی مەریەم، گەورەو پێغەمبەرمانە، لە هاوەڵانی پێغەمبەری خۆمان زیاترمان خۆش دەوێت..

موحەممەدمان ﷺ خۆش دەوێت، عیساشمان عليه السلام خۆش دەوێت، هەموو پێغەمبەرانمان خۆش دەوێت.. بەڵکو لە خۆشمانمان زیاتر خۆش دەوێن.. لە سەرمان پێویستە باوەڕی تەواومان بە عیسا عليه السلام هەبێت، هەروەك پێویستە باوەڕمان بە سەرجەم پێغەمبەرانی تریش هەبێت..﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ ...﴿٢٨٥﴾ ﴾ البقرة. واتە: (پێغەمبەرانو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان بە خوداو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی هەیەو (دەڵێن): هیچ جۆرە جیاوازیەك لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خودادا ناکەین)..

نەخێر.. هیچ جیاوازییەك لە نێوان پێغەمبەراندا ناکەین.. دروست نیە بۆ هیچ موسڵمانێك بەرامبەر عیسا عليه السلام، یان بەرامبەر بە موسا عليه السلام، یان هەر پێغەمبەرێکی تر بێباوەڕ بێت..

من بانگی زانایانو کەسە ژیرەکانی ئاینی مەسیحی دەکەم، بۆ ئەوەی سەیری ئینجیل بکەن، بزانن هیچ دەقێك، یان هیچ قسەیەکی عیسا ﷺ هەیە، کە بڵێت: من کوڕی خودام؟!

نەخێر.. بە هیچ شێوەیەك شتی وا نابینن.. تەنانەت ئەو چوار ئینجیلەی کە ئێستا هەیە، مەسیحیەکان خۆیان ناتوانن بڵێن: کامیان ڕاستەو کامیان هەڵەیە، کام وتانە وتەی خودانو کامیان بە ناوی خوداوە هەڵبەستراوە..

خۆیان دەزانن کە عیسا ﷺ مرۆڤە.. دەزانن کە مژدەی بە هاتنی پێغەمبەری دوای خۆیداوە، تەنانەت ناوی پێغەمبەرەکەشی پێ وتوون.. ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ...﴿٦﴾﴾ الصف. واتە: (هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێتو ناوی ئەحمەدە)..

بەڵێ.. فەرمانی بە شوێنکەوتووانی داوە، کە شوێنی ئەو پێغەمبەرە بکەون، هەر بۆیە کاتێك عەمری کوڕی عاص ﷺ وڵاتی میصری ئازاد کرد، زۆرێك لە مەسیحیەکان باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون، لەبەر ئەوەی دەیانزانی کە ئەمە ئەو ئاینەیە لە دوای ئاینەکەی عیسا ﷺ هاتووەو پێغەمبەرەکەشیان ئەو پێغەمبەرەیە کە عیسا ﷺ فەرمانی پێکردن شوێنی بکەون..

سوپاس بۆ خودا ئەمڕۆ زۆرێك لە دکتۆرو ئەندازیاری مەسیحی، تەنانەت قەشەش دەزانم موسڵمان بوونو باوەڕیان هێناوە.. پرسیارێك لە خاوەن ژیریو زانا مەسیحیەکان دەکەمو پێیان دەڵێم: قەشەو زانایەکی مەسیحی دەزانو دەیناسن موسڵمان بوو بێت؟

بە دڵنیاییەوە دەڵێن: بەڵێ..

* ژمارەیەکی زۆریان موسڵمان بوون، بۆ نموونە: شێخ یوسف ئیستێسی ئەمەریکیو زۆرێکی تریان، کە بڵاوکراوەو کتێبو بەرنامەی تەلەفزیۆنییان هەیە، هەیانە سایتی ئینتەرنێتی هەیە، لە کاتێکدا ئەو قەشانە کەسانی ئاسایی نینو خاوەن زانستو زانیارییەکی باشن..

دەی باشە ئایا زانایەکی موسڵمان دەناسن، وازی لە ئاینەکەی هێنا بێتو بوو بێت بە مەسیحی؟

بە دڵنیاییەوە دەڵێن: نەخێر..

بۆچی قەشەکان دەبن بە موسڵمان، بەڵام بە پێچەوانەوە، زانایەکی موسڵمان نابینی، ببێت بە مەسیحی؟!

من لەگەڵ مەسیحیە ئاساییەکاندا نادوێم، بەڵکو ڕووبەڕووی زاناو شارەزاکانیان دەدوێمو پێیان دەڵێم: بۆچی قەشەکان ئامادەن واز لە ئاینەکەیان بهێننو ببنە موسڵمانو فەرمانەکەی عیسا ﷺ جێبەجێ دەکەنو شوێنی موحەممەد ﷺ دەکەون؟!

ئەگەر ئێوە بەڕاستی عیساتان ﷺ خۆش دەوێت، دەی شوێنی بکەون، چونکە

**عیسا ﷺ هیچ کات نەیفەرمووە: بمپەرستن، بەڵکو فەرموویەتی: شوێنم بکەون، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَـٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾﴾ مريم. **واتە: (ئەوسا مەریەم منداڵی نازداری خۆی لە باوەش گرتو بردی بۆ لای خزمو کەسوکاری (هەموو بە سەرسامیەوە) وتیان: ئەی مەریەم بە ڕاستی کارێکی ناڵەبارو ئابڕووبەرت ئەنجامداوە.. ئەی خوشکی هارون (لەبەر تەقواو خوداناسی ئەو نازناوەیان پێدابوو) تۆ نە باوکت کەسێکی خراپو (شەڕواڵ پیس بووە) نە دایکشت ئافرەتێکی داوێن پیس!! (مەریەمیش هیچی نەگوت) بەڵکو ئاماژەی بۆ ڕۆڵەی نازداری کرد (تا لەو بپرسن)، هەموو (بە سەرسامیەوە) وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵی ناو بێشکەدا دەکرێت.. (ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفتو بە دەنگە ناسکەکەی) وتی: بەڕاستی من بەندەی خودام، کتێبی ئینجیلی پێبەخشیووەو کردوومی بە پێغەمبەری خۆی.. منی موبارەکو پیرۆزیش کردووە لە هەر کوێدا بمو ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەمو لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەبم)..**

**عیسا ﷺ نەیفەرموو: من خودام.. نەیفەرموو: کوڕی خودام، بەڵکو فەرمووی: بەندەی خودام.. سوێند بە خودا خێرو خۆشیم بۆ موسڵمانان دەوێت، هەروەها خێرو خۆشیم بۆ مەسیحیەکان دەوێت .. ئەی خەڵکینە، مرۆڤ پێویستە بە شوێن ڕزگاربووندا بگەڕێتو هەوڵی پاك ڕاگرتنی بیروباوەڕەکەی بدات.. هەوڵی باش کردنی پەیوەندی نێوان خۆیو خودا بدات.. داواکارم پەروەردگار ڕێنمایی منیشو ئێوەش بکات بۆ خێرو چاکەو چاکسازیو یارمەتیمان بدات لە یەکخواپەرستانو یەکتاپەرستان بین.. آمین..**

# ئایا ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە..؟

* جارجارێك پرسیارێك بڵاو دەبێتەوەو دەوروژێنرێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئیسلام بە هێزی شمشێر بڵاوبۆتەوەو پەرەیسەندووە؟ ئایا خەڵکی بە زۆر هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، یان بەهۆی خۆشەویستییان بۆ ئیسلامو ڕازی بوونی خۆیان موسڵمان بوون؟

ئایا موسڵمان بوونی هەموو ناوچەو شارەکان، بە شەڕو کوشتو کوشتار بوو؟

زۆرێك ژمارەو سەرژمێریم لایە، بۆتانی دەخوێنمەوەو دەنوسم، تا ڕوون دەبێتەوە کە ئیسلام بە هێزی شمشێر بڵاوبۆتەوە، یان بە ڕێگەو شێوازی تر..

ئایا ئیسلام بە زەبری هێزی شمشێر بڵاوبۆتەوە؟

ئەمە پرسیارێکی گەورەو گرنگە.. من دەزانمو دڵنیام ئەم پرسیارە، پرسیارێکی دووبارەو چەند بارەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی جارجارێك دەوروژێنرێت، پێویستە لە سەری بدوێین، چونکە نەوە دوای نەوە پێویستیان بە بیستنی وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانەیە، بۆ نمونە: من هەموو ساڵو نیوێك یان دوو ساڵ جارێك، لە وتاری هەینیدا باسی چاکەکردنو ڕێزگرتنی دایكو باوك دەکەم، کەسانێك دێن بۆ لامو پێم دەڵێن: پێش ساڵو نیوێك، لای جەنابت نوێژمان کرد، باسی هەمان بابەتت کرد، بۆچی دیسان دوبارەت کردەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: لەبەر دوو هۆکار باسەکان دووبارە دەکەمەوە:

یەکەم: وتارەکەم لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی تر دەگۆڕم، ڕاستە باسەکە هەر باسی چاکەکردنو ڕێزگرتنی دایكو باوکە، بەڵام ڕووداوو چیرۆکەکانی جیاوازن، فەرموودەکان مەرج نین هەمان فەرموودەکانی پێشوو بن..

دووەم: هەندێك بابەت هەن وەك ئەم بابەتە، جارجارێك دەوروژێنرێتو باس دەکرێت، بۆ نمونە: کەسێك پار چواردە ساڵ بووەو ئەمساڵ پانزەیەو ساڵێکی تر دەبێت بە شانزە ساڵو دەبێت بە هەرزەکارو پێویستی بەوە هەیە، ئامۆژگاری بکرێت، کە چەندە پێویستە لەگەڵ باوكو دایکیدا باش بێتو ڕێزیان بگرێت، بە هەمان شێوە باس کردنی هاوەڵی خراپ، لەبەر ئەوەی خەڵکی بەردەوام پێویستیان بەم باسانەیە، خۆ ئەگەر بە وتارێك، ئیتر خەڵکی هەموو لەگەڵ باوكو دایکیاندا باش بوونایە، منیش دوبارەکردنەوەی وتارەکان بە باش نازانم..

وەرن با لە سەر بابەتێکی گرنگ قسە بکەین..

خودا پێغەمبەری ﷺ نارد بۆ مرۆڤایەتی، قوڕەیش زۆر دژایەتیان کردو ئازاریاندا،

هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی کۆچیان کرد بۆ مەدینە..

بەڵێ.. لە مەدینە مانەوەو دەوڵەتێکیشیان دروست کرد.. ڕۆژێك لە ڕۆژان، کۆمەڵێك لە هاوەڵان، لە دەوروبەری مەدینە، پاسەوانی شارەکەیان دەکرد.. شاری مەدینە خانووەکانی لەو کاتەدا کۆن بوونو ماڵەکانیش لەیەکەوە نزیك بوون، مزگەوتی پێغەمبەریشﷺ لە ناوەڕاستی شارەکە بوو..

شاری مەدینە جگەلە موسڵمانان جولەکەو دووڕووەکانیشی تێدا نیشتەجێ بوون، شارەکەش چەندین دەروازەی هەبوو، هەر بۆیە شارەکە زۆر پێویستی بەوە هەبوو، پارێزگاری لێبکرێتو پاسەوانی هەبێتو بەردەوام چاودێری بکەن، چونکە موسڵمانان چەندین دوژمنیان هەبوو، چ لەناو شاری مەدینە، چ لە دەرەوەی شارەکە..

هەر بۆیە هاوەڵان بە خۆیانو ئەسپەکانیانەوە، چاودێری شارەکەیان دەکرد، بۆ ئەوەی ئەگەر سوپایەك یان کەسێکی خراپ بەرەو شارەکە بهاتنایە، دەستگیریان بکردایە، یان بە خێرایی موسڵمانانیان لێ ئاگادار بکردایەتەوە..

ڕۆژێك پاسەوانەکان، پیاوێکیان بینی کە جلی ئیحرامی لەبەردا بوو، بە لای مەدینەدا تێدەپەڕی.. هاوەڵان گەیشتنە سەریو لێیان پرسی: تۆ کێیت؟

پیاوەکە وتی: من گەورەی (بني حنيفة)م کە دەکاتە ناوچەی ڕیازی ئێستا..

وتیان: بۆ کوێ دەچیت؟

وتی: دەچم بۆ مەککە..

هاوەڵان دەیانزانی ناوچەی ڕیاز لە ناوەڕاستی وڵاتی نەجدو حیجازەو مەککەش دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ئەگەر کەسێك بیەوێت لە ڕیازەوە بچێت بۆ مەککە، پێویست ناکات بە مەدینەدا تێپەڕێت!! گومانیان وابوو، کە بۆ کارێك هاتووەو لەوانەیە بیەوێت سیخوڕی بە سەر موسڵمانانەوە بکات، هەر بۆیە گرتیانو بە یەکێك لە پایەکانی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداﷺەوە بەستیانەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ هات بۆ مزگەوت، پاش نوێژ ئاوڕی دایەوەو هاوەڵان ئاگاداریان کردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەم پیاوەمان دەستگیر کردووە..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە نەرمونیانی لێی نزیك بۆوەو فەرمووی: تۆ کێیت؟

پیاوەکە وتی: من ثومامەی کوڕی ئوثالم..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: تۆ گەورەی هۆزەکانی (بني حنيفة)یت لە نەجد؟

پیاوەکە وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ لە هاوەڵان نزیك بۆوەو فەرمووی: ئایا دەزانن کێتان دەستگیر کردووە؟! ئێوە گەورەی هۆزەکانی نەجدتان دەستگیر کردووە!! ئەی نازانن هەموو ئەو

گەنمو جۆو خواردنانەی کە دەچێت بۆ مەککە، لە ژێر دەستی ئەم پیاوەدایە..

بە هەر جۆرێك بێت، ئێستا ئەو پیاوە دەست بە سەرە.. پێغەمبەری خوداﷺ لێی نزیك بۆوەو فەرمووی: ئەی ثومامە موسڵمانبە.. وتی: موسڵمان نابم..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی چیت لایەو چی دەکەیت؟

وتی: ئەگەر بمکوژیت، کەسێکی کەسدار دەکوژیت، ئەم قسەیەش قسەی گەورەو پادشایەك بوو، کە متمانەی بە هێزو هۆزی خۆی هەبوو.. ئەگەر چاکەشم لەگەڵ بکەیت، ئەوا چاکە لەگەڵ کەسێکی سوپاسگوزاردا دەکەیت، ئەگەر ماڵو سامانیشت دەوێت، چەندت دەوێت داوای بکە، لەبەر ئەوەی چەندێك بڵێیت، هۆزەکەم دەتدەنێ..

پێغەمبەری خوداﷺ کوشتنو پارەی ناوێت، ناشیەوێت بە زۆر ئەو پیاوە موسڵمان بێت..

پێغەمبەری خودا ﷺوازی لێهێناو فەرمووی: لەگەڵیدا باش بنو باشترین خواردنیشی پێبدەنو هەموو بەیانییەکیش سەردانی بکەنو بیبەن بۆ لای ئاژەڵەکەی..

لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئاژەڵە سوارییەکەی خۆی خۆش دەوێت، لە ڕۆژگاری ئێستادا ئەگەر کەسێك ئۆتۆمبیلێکی هەبێتو دەعم بکات، یان شتێکی بە سەر بێت، یان بیفرۆشێت، ئەوا دەتوانێت دانەیکی تر بکرێت، بەڵام لە ڕابوردوودا ئاژەڵی سواری لە لای خاوەنەکەی زۆر بە نرخ بووە، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی ڕاهێنانی پێکردووەو ماڵی کردووەو لەگەڵ خۆیدا گونجاندوویەتی، چونکە ئاژەڵیش خاوەن هەستو ژیرییە، بە تایبەت ئەو ئاژەڵانەی هی سوارینو بەرگەی گەشتی دوورو درێژ دەگرن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد، هەموو ڕۆژێك ئەو پیاوە بەرن بۆ لای ئاژەڵەکەی، بۆ ئەوەی بزانێت ئاژەڵەکەی زیندووەو ماوە..

بۆ سبەینێ پێغەمبەری خوداﷺ نوێژە فەرزەکانی بە کۆمەڵ لەگەڵ هاوەڵاندا ئەنجامداو پیاوەکەش گوێی لە قورئانەکەی دەگرتو سەیری هاوەڵانی دەکرد، کە چۆن چۆنی هەڵسوکەوت لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ دەکەن..

ڕۆژی دواتر پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك هات، لێی پرسی؟ چیت هەیە بیڵێیت ئەی ثومامە؟

ثومامە دەڵێت: ئەوەی هەبوو، پێم وتی: ئەگەر ماڵیشت دەوێ، چەندت دەوێ داوای بکە..

پێغەمبەری خوداﷺ هیچ شتێك لەو شتانەی نەدەویست، هەر بۆیە بێدەنگ بوو، پاشان ڕۆیشت بۆ لای هاوەڵانیو پیاوەکەش سەیری دەکردن، یەکێك نوێژی دەکرد، یەکێك قورئانی دەخوێند، یەکێك یادی پەروەردگاری دەکرد.. ئەم دیمەنانە زۆر کاریان

لەسەر ثومامە دروست کرد.

بۆ ڕۆژی دواتر، پێغەمبەری خوداﷺ هەمان پرسیاری لە ثومامە کردەوەو ئەویش هەمان وەڵامی پێشووی دایەوە..

ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چی کرد؟

ئایا شمشێریان بۆ هێنا، بۆ ئەوەی لێی بپرسن موسڵمان دەبێت، یان سەرت لە لاشەت جیا بکەینەوە؟! نەخێر.. چونکە ئاینی ئیسلام بەو شێوەیە بڵاونەبۆتەوەو زۆرکردن لە ئیسلامدا نیە، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة. واتە: (بە هیچ جۆرێك زۆرکردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامدا (دینداری بە زۆر نابێت بکرێتو دین بە زۆر نادرێت بە سەر کەسدا)، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاكو دروست: ڕوونو ئاشکرا بووەو جیابۆتەوە لە گومڕاییو سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە طاغوت (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادانو بتێك)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە خودا، جا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسانو هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نیەو هەمیشە پتەوو دامەزراوە، خودای گەورەش بیسەرو زانایە)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف. واتە: (پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانە کراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێتو ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێباوەڕ بێت)..

پێغەمبەری خوداشﷺ بەبێ زۆر لێکردن، ڕوو بە هەموو خەڵکی دەفەرموێت: ((ياأيها الناس قولوا لا إله إلا ألله تفلحوا)). رواه البخاري. واتە: (خەڵکینە بڵێن جگە لە ألله هیچ خودایەکی ڕاستەقینە نیە، سەرفرازو سەرکەوتوو دەبن)..

ثومامە هەموو دەرگاکانی بە ڕووی پێغەمبەری خواداﷺ داخست، ئەی پێغەمبەری خوداﷺ دەبێت چی بکاتو چی کرد؟ لەبەر ئەوەی ثومامە خاوەن ڕێزو کەسایەتی خۆی بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ بە شێوەیەك هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد، کە لەگەڵ کەسایەتیدا گونجاو بووایە..

بۆ ڕۆژی سێیەم پێغەمبەری خوداﷺ پرسیارەکەی دووبارە کردەوەو ثومامەش هەمان وەڵامی پێشووی دایەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: بەری بدەن..

هاوەڵان فەرموویان: هەروا بەبێ هیچ بەرامبەرییەك بەری بدەین، بەبێ ئەوەی هیچ

سەروەتو سامانێکی لێبستێنین؟!

پێغەمبەری خوداﷺ دووبارە فەرمووی: بەری بدەن..

هاوەڵان دیسان وتیان: ئاخر هۆزەکەی خاوەن گەنمو جۆیەکی زۆرن؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەری بدەن..

بەڵێ.. ثومامە دوای ئەوەی ئەو هەموو هەڵسوکەوتە جوانەی لە پێغەمبەری خوداﷺ بینی، ڕۆیی هەتا گەیشتە ئاوێکی نزیك مزگەتەکەو خۆی شۆریو جلەکانی ئیحرامی لەبەرکردەوەو هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو وتی: أشهد أن لا إله إلا الله، وأنك رسول الله..

ئایا بەزۆر موسڵمان بوو؟!

نەخێر.. ثومامە دەڵێت: سوێند بە خودا لە هەموو شتێك زیاتر ڕقم لە ڕوخساری پێغەمبەری خوداﷺ بوو، بەڵام ئێستا خۆشەویسترین ڕوخسار، لە لام ڕوخساری پێغەمبەری خودایەﷺ.. سوێند بە خودا ناخۆشترین شوێن لە لام مەدینە بوو، بەڵام ئێستا خۆشترینو خۆشەویسترین شار لە لام شاری مەدینەیە.. زۆر ڕقم لە ئاینی ئیسلام بوو، بەڵام ئێستا خۆشەویسترین ئاین بە لامەوە، ئاینەکەی پێغەمبەری خودایەﷺ، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من ئێستا لە ئیحرامدام، چ فەرمانێکم پێدەکەیت، بفەرموو..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: عومرەکەت تەواو بکە..

ثومامە ڕۆیشت هەتا گەیشتە مەککەو لەباتی قسەکانی پێشووی کە دەیوت: لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، إلا شريكاً هو لك، تملكهُ وماملك، ئەمجارەیان وتی: لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، إن الحمد والنعمه لك، لاشريك لك..

قوڕەیش کاتێك گوێیان لەم قسانە بوو، لێی کۆبوونەوەو وتیان: ویردەکانت تازەو نامۆن؟!

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: من موسڵمان بووەو لەبەر چاویان شایەتمان دەهێنێت..

قوڕەیش بۆ ئەوەی پەشیمانی بکەنەوە، دەست دەکەن بە لێدانی..

سەیری ئەو جیاوازیە گەورەیە بکەن، موسڵمانان بەزۆرو بە لێدان موسڵمانیان نەکرد، بەڵام بێباوەڕان خەریکن بەزۆرو بە لێدان پەشیمانی بکەنەوە.. ئیسلام بەزۆر خەڵکی ناکات بە موسڵمان، بەڵام بێباوەڕان هەموو ڕێگەیەك بەکاردێنن بۆ ئەوەی خەڵکی لە ئیسلام دوور بخەنەوە..

کاتێك عەباسی مامی پێغەمبەری خوداﷺ بینی وا لەو پیاوە دەدەن، وتی: ئەی قوڕەیش ئەوە گەورەی بەنی حەنیفەیە، سوێند بە خودا ئەگەر ئازاری بدەنو لێی

بدەن، دەنکە جۆیەکتان بۆ نانێرن، ئێوە ئێستا دژایەتی خۆتان دەکەنو ماڵی خۆتان وێران دەکەنو ئابلۆقەی ئابوری لە سەر خۆتان دروست دەکەن..

قورەیش کاتێك گوێیان لەم قسانە بوو، وازیان لێهێنا.. پاش ئەم ڕووداوە، ثومامە وتی: بە خوای گەورە یەك دەنك گەنمتان پێناگات، هەتا پێغەمبەری خوداﷺ ڕازی نەبێت..

قورەیش نوێنەریان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو وتیان: ئەی موحەممەد ئەو پیاوە خواردنی لێ قەدەغە کردووین..

پێغەمبەری خوداﷺ ئاگاداری ثومامەی کرد کە خواردنیان بۆ بنێرێتو لێیان قەدەغە نەکات..

* ڕاپۆرتێکی ژمارەیم خوێندەوە، کە د. الراغب السرجانی ئامادەی کرد بوو، تایبەت بوو بە ژمارەی شەهیدانی موسڵمانانو کوژراوانی دوژمنانیان..

لە هەموو ژیانی پێغەمبەری خوداداﷺ لە ٦٣ جەنگدا، کە ٢٧ یان غەزاو جەنگی گەورە بوون، تەنها ٢٦٢ کەس لە موسڵمانان شەهید بوون، لە بێباوەڕانیش تەنها ١٠٢٢ کەس کوژراون.. ئەگەر ژمارەی موسڵمانانو ژمارەی شەهیدەکانیان بەراورد بکەیت، ژمارەی شەهیدەکان نزیکەی لە ١٪ دەکات، خۆ ئەگەر لەگەڵ کوژراوانی بێباوەڕاندا کۆ بکرێنەوە ئەوا نزیکەی دەکاتە ١،٥٪، کەواتە ئیسلامو موسڵمانان شەیدای کوشتو کوشتار نین..

خۆ ئەگەر سەیرێکی جەنگی دووەمی جیهانی بکەین، دەبینین ژمارەی سەربازانی بەشداربووی ئەو جەنگە بریتی بوو لە ١٥ ملیۆنو ٦٠٠ هەزار سەرباز..

ئایا دەزانن چەند کەس لەو جەنگەدا کوژرا؟!

٥٤ ملیۆنو ٨٠٠ هەزار کەس لەو جەنگەدا کوژرا!!

ژمارەی کوژراوەکان زۆر لە لە ژمارەی سەربازەکان زیاتر بوون، چونکە زۆربەی کوژراوەکان هاوڵاتیان بوون، ئەوانەی کە جەنگاوەر نەبوون لە ژنو منداڵ..

کاتێك دەوڵەتێك، دەوڵەتێك یان شارێکی دەوڵەتەکەی تری داگیر دەکرد، ژمارەیەکی زۆری لە هاوڵاتیانی ئەو دەوڵەتەی تر دەکوشتو بە جۆرەها چەك یەکتریان قڕ دەکرد، هەر بۆیە کوژراوان زیاتر بوون لە سەربازەکان!!

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك سوپایەکی بەڕێ دەکرد، پێی دەفەرموون: ((ژنو منداڵو بریندار مەکوژن))..

کاتێك دیلەکانی جەنگی بەدر کۆکرانەوەو هێنرانە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ، بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردنو فەرمانی کرد،

خواردنو خواردنەوەیان پێبدەن..

موصعەبی کوڕی عومەیرﷺ دەفەرموێت: خۆمان نانی وشکو ئاومان دەخوارد، بەلاَم نانو خورمامان دەدا بە دیلەکان، کاتێك دیلەکان ئەمەیان دەبینی، شەرم دەیگرتنو دەیان وت: ئێوەش خورما بخۆن، ئێمەش دەمان وت: ناخۆین، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی پێکردووین، بە باشیو جوانی هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکەین، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ٨﴾ الإنسان. واتە: (هەروەها نانو خۆراك دەبەخشن، ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لایان، بە هەژارو هەتیوو دیلەکان)..

ئەگەر ئیسلام بە شمشێر بلاَوبووایەتەوە، بە نەمانی شمشێرو هێز خەڵکی لە ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە، بەلاَم ئایا وایە؟!

حەفتاو سێ ساڵ شیوعیەت لە ڕوسیا فەرمانڕەوایی کردو تا ئێستاش فەرمانڕەوایە، شیوعیەت لەو وڵاتە بە ئاگرو ئاسن بلاَوبۆوە.. بەڵێ.. بلاَوبۆوەو بێباوەڕی بە دوای خۆیدا هێناو دەیان وت: ئەم بونەوەرە ماددەیەکەو هیچی ترو بانگەشەی بێ خودایان دەکرد، بەلاَم لە هەر وڵاتێکی ژێردەستی شیوعیەت، لەگەڵ یەکەم ساتی ڕووخانی ئەو بیروباوەڕە پوچەدا، خەڵکی بەرەو ئیسلام دەگەڕانەوە.. بە هەمان شێوە مەسیحیەکان بۆ مەسیحیەت دەگەڕانەوە، بەلاَم ئیسلام بە ڕەزامەندیو لە سەر بنەمای ژیری بلاَوبۆوە، نەك لە سەر بنەمای هێزو توندوتیژی..

پەروەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ...١٢٥﴾ النحل. واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەتو دانایی (بۆ هەندێك)و ئامۆژگاری جوانو بەجێ، (بۆ هەندێکی تر)و گفتوگۆو موجادەلە بە جوانترین شێوە)..

* وڵاتی ئەندەنوسیا کە ئێستا سێ یەکی موسڵمانانی جیهان پێکدەهێنێت، کە ژمارەیان زیاترە لە ٢٣٠ ملیۆن موسڵمان، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها شمشێرێك لە موسڵمان بوونی ئەو کەسانەدا بەکارنەهێنرا، بەڵکو ئیسلام لە ڕێگەی چەند بازرگانێکی موسڵمانەوە گەیشتە ئەو وڵاتە..

لە ڕێگەی زاناکانەوە نا، بەڵکو لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە.. ڕەوشتی جوانو هەڵسوکەوتی نەرمونیانیان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، بوو بەهۆی موسڵمان بوونی دانیشتووانی ئەو وڵاتە.. سەرەتا خەڵکی پێیان کاریگەربوونو بەڕەوشتو ڕەفتاریان کاریان کردە سەر خەڵکەکە، پاشان ئەم بازرگانانە مزگەوتێکیان دروست کرد، بەرە بەرە خەڵکی فێری نوێژ بوونو لەگەڵ بازرگانەکاندا نوێژیان دەکرد، پاشان مزگەوتێکی ترو کۆمەڵێك مزگەوتیان دروست کردو بە هەموو ئەندەنوسیادا بلاَوەیان کردو بلاَوبوونەوەو ئیسلامیان بلاَو

کردەوە، بەبێ ئەوەی شمشێرێك بەکاربهێننو خوێن لە لوتی کەس بێت..

بە هەمان شێوە هیندستانیش هەر لە ڕێگەی بازرگانە موسڵمانەکانەوە بڵاوبۆوە.. ئێستاش خەڵکی لە وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریکا دێنە ناو ئیسلامەوەو باوەڕ دێنن بەبێ ئەوەی هیچ زۆرێکیان لێ بکرێتو ناچار بکرێن..

حکومەتی ئەڵمانیا دەڵێت: ژمارەی ئەو کەسانەی کە موسڵمان دەبن ئەوەندە لە زیادبووندان، لە هەر دوو کاتژمێرێکدا کەسێك موسڵمان دەبێت.. ئایا ئەمانە بە شمشێرو خەنجەر موسڵمان دەبن؟! بە پێی ڕاپۆرتەکەی حکومەتی ئەڵمانیا بێت، ڕۆژی دوانزە کەس موسڵمان دەبن.. خۆ ئەگەر پرسیار لە بنکەو سەنتەرە ئیسلامیەکان بکەیت، دەربارەی ئەو ژمارەیە، دەڵێن: ژمارەکە زۆر زیاترە لەو ژمارەیە، چونکە ڕاپۆرتەکەی حکومەتی ئەڵمانیا پشت بە تۆمارە ڕەسمیەکان دەبەستێت..

بەڵێ.. ئیسلام هەروەك بە لێبوردەییو نەرمونیانی بڵاو بۆتەوە، بە جیهادو تێکۆشانیش بڵاو بۆتەوە، ئێمە کە دەڵێین ئیسلام بە شمشێر بڵاو نەبۆتەوە، مەبەستمان شمشێری هەڵەو نەزانیە.. ئیسلام بە جیهاد بڵاو بۆتەوە، بۆ نەمانی زوڵمو ستەمو ڕزگاربوونو ئازادکردنی چەوساوەکان، هەروەك بە هەمان شێوەش بە دانایيو بانگەوازی ئاشتیانە بڵاو بۆتەوەو خەڵکی باوەشیان بۆ کردۆتەوەو بە دەمیەوە هاتوونو باوەڕیان پێ هێناوە..

داوکارم لە خوای باڵادەست، ئێمەشو ئێوەش بۆ هەموو کارێکی چاك ڕێنمایی بکاتو یارمەتیمان بدات بۆ پەرستنیو بەکارمان بهێنێ بۆ خزمەت کردنی بەرنامەکەی خۆی.. آمین..

# هەندێك لە موعجیزەكانی پێغەمبەری خوداﷺ..

پێغەمبەری خوداﷺ دوای ئەوەی لە مەككەوە كۆچی كردو لە شاری مەدینە نیشتەجێ بوو.. لەگەڵ هاوەڵانیدا زۆرجار بەهۆی غەزاكانەوە دەچووە دەرەوە.. ڕۆژێك لەگەڵ هاوەڵانیدا لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، هەتا شەویان بەسەردا هات..

بەڵێ.. شەو داهاتو ئەمانیش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون.. ژمارەی هاوەڵان لە ژمارەی وشترەكان زیاتر بوون، هەر بۆیە بە چەند هاوەڵێك وشترێكیان بەردەكەوتو بە نۆرە سواری وشترەكان دەبوون..

پێغەمبەری خوداﷺ كاتێك هەستی بە ماندوویەتی هاوەڵانی كرد، فەرمانی كرد لابدەنو پشوویەك بدەن، بەڵام كێشەیەك هەبوو، ئەویش ئەوە بوو، كێ ئاگاداری هاوەڵان بكاتەوەو بۆ نوێژی بەیانی هەڵیان بستێنێت، چونكە هەموویان زۆر هیلاكو ماندوو بوون..

بزانین پێغەمبەری خوداﷺ چی دەكاتو ئەم كارە بە كێ دەسپێرێت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: كێ تا بەیانی چاودێریمان دەكات؟

بیلالﷺ فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خودا..

هاوەڵان خەوتنو بیلالﷺ دەستی كرد بە نوێژكردن..

بیلال نوێژی دەكردو هاوەڵانو پێغەمبەری خوداشﷺ خەوتبوون.. بە درێژایی شەو بیلالﷺ نوێژی دەكردو دەپاڕایەوەو قورئانی دەخوێند.. كەمێكی مابوو بۆ نوێژی بەیانی، هەربۆیە چاودێری بەرەبەیانی دەكرد، چونكە بیلالﷺ بانگدەری پێغەمبەری خوداﷺ بوو، زیاتر شارەزا بوو، دەیزانی كەی كاتی ئەوەیە شەو كۆتایی بێتو بەیان دەركەوێت، ئا لەم كاتەدا خەو هێرشی بۆ هێناو خۆی بۆ نەگیراو خەوی لێكەوت..

بەڵێ.. خەوی لێكەوتو ڕۆژ هەڵهاتو گەرمی خۆر هاوەڵانی لە خەو خەبەر كردەوە..

ئیمامی عومەرﷺ خەبەری بۆوە.. پێغەمبەری خوداشﷺ خەبەری بۆوەو چوو بۆ لای بیلالو فەرمووی: بیلال ئەی كوا قسەكەت؟!

بیلالیشﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوەی تووشی ئێوە هات، تووشی منیش هات..

پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانیش لەم ڕووداوە تووڕەو بێتاقەت بوون، چۆن دەبێت تا ڕۆژهەڵاتن بخەون.. ئەی نوێژەكەی بەیانییان؟! هاوەڵان نوێژی بەیانییان زۆر لا گەورە بوو، هەر بۆیە زۆر خەمبار بوون..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: هەستنو خۆتان ئامادە بكەن دەچین بۆ شوێنێكی

تر.. ئەم شوێنە شەیتانی لێیە.. ڕۆیشتن بۆ شوێنێکی ترو نوێژیان کرد، پێغەمبەری خوداﷺ بینی، یەکێك دوورکەوتەوەو نوێژی نەکرد، پێی فەرموو: بۆچی نوێژت نەکرد؟

پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لەشم گرانەو ئاویشی کەم لێیە هەر بەشی دەست نوێژ دەکات..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی پێکرد بەم شێوەیە تەیەموم بکات، هەر دوو دەستەکانی بدات بە خۆڵێکی پاکداو بە ڕوخسارو دەستەکانیدا بیهێنێت، ئەگەر دوایی ئاویشی دەسکەوت، ئەوا با خۆی پێ بشوات..

کەواتە زۆر پێویستیان بە ئاو هەبووە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ بانگی ئیمامی عەلیرضي الله عنهو پیاوێکی تری کردو داوای لێکردن بچن بە دوای ئاودا بگەڕێن..

ئیمامی عەلیرضي الله عنه لەگەڵ پیاوەکەی تردا ڕۆیشتنو بە دوای ئاودا دەگەڕان، لەم کاتەدا ئافرەتێکیان بینی، لە سەر وشترەکەی لە نێوان دوو مەرکانە ئاودا بوو، پێیان وت: ئەو ئاوەت لە کوێ دەستکەوتووە؟!

ئافرەتەکەش وتی: نێوانی ئێوەو ئاوەکە شەوو ڕۆژێك دوورە..

پاشان پێیان وت: کەواتە بابڕۆین..

ئافرەتەکە وتی: بۆ کوێ؟!

وتیان: بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ..

ئافرەتەکە وتی: بۆ لای ئەو پیاوەی کە ئاینەکەی خۆی گۆڕیووە؟!

دوو هاوەڵەکە لەگەڵ ئافرەتەکەدا درێژمیان بە قسە نەداو کەوتنە ڕێ.. ئافرەتەکە بە سەر وشترەکەیەوە لەگەڵیاندا کەوتە ڕێو گەیشتنە لای پێغەمبەری خوداﷺ و پرسیاری ئاوی لێکرد، ئافرەتەکەش وتی: ئاوەکە لێرەوە زۆر دوورەو ڕاشیگەیاند کە ئافرەتێکی لاوازەو دایکی کۆمەڵێك منداڵی بێباوکو هەتیوە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەستی بە سەر هەر دوو مەرکانە ئاوەکەدا هێناو پاشان داوای جامێکی گەورەی کردو ئاوی هەر دوو مەرکانەکەی تێکرد، پاشان بانگی هاوەڵەکانی کرد بۆ ئەوەی بێن ئاو بخۆنەوە.. هەیان بوو ئاوی دەخواردەوەو هەیان بوو دەفرو کەلوپەلەکانی پڕ لە ئاو دەکردو ئافرەتەکەش هەر سەیری ئاوەکەی دەکرد، کە چی لێدەکەن..

هاوەڵان ئاویان خواردەوەو دەفرو کەلوپەلەکانیان لێ پڕ کرد، ئاوەکە هیچ کەمی نەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ویستی چاکەیەك لەگەڵ ئافرەتەکەدا بکات، بۆیە داوای لە هاوەڵانی کرد کە خواردنی بۆ کۆ بکەنەوە..

هاوەڵان خورمای عەجوەو ئاردی جۆیان بۆ کۆ کردەوەو کردیانە پڕیاسکەیەکەوەو بۆیان خستە سەر پشتی وشترەکەی، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: خۆ دەزانی کە لە ئاوەکەتمان کەم نەکردەوە، چونکە پەروەردگار تێر ئاوی کردینو تینوویەتی ڕەواندینەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ بەو شێوە جوانە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئافرەتێك کرد، کە موسڵمانیش نەبوو.. ئەمەش سەلماندنی ئەو ئایەتە پیرۆزەیە، کە پەروەردگار لە بارەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەوەﷺ دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء. واتە: (ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەتو بەرەکەت بۆ هەموو جیهانییان)..

بەڵێ.. مایەی سۆزو بەزەیی بوو، بۆ موسڵمانو ناموسڵمان.. بۆ گەورەو بچوك.. بۆ ئازادو بۆ بەندە.. بەزەیی بوو بۆ سەرجەم بوونەوەر.. ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ ... ١٥٩ ﴾ آل عمران. واتە: (کەوابوو ئەی موحەممەدﷺ بەهۆی ڕەحمەتی خوداوەیە تۆ نەرمو هێمن بوویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تووڕەو قسەڕەقو بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد)..

ئەو ئافرەتە هەر چەندە بێباوەڕو گومڕاو بت پەرست بوو، کەچی پێغەمبەری خوداﷺ، بەو شێوازە جوانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد.. ئافرەتەکە زۆر سەرسام بوو، بەو شتانەی کە لە پێغەمبەری خودایﷺ بینی بوو!! چونکە هەرگیز شتی وای نەبینی بوو!!

بەڵێ.. ئافرەتەکە بەو بیابانە وشکو چۆڵەدا کەوتە ڕێ، کە ئەگەر ڕێگەی لێ وون بووایە، لەوانەبوو لەناو بچووایەو بمردایە.. ئافرەتەکە گەیشتەوە لای هۆزەکەیو پێیان وت: ئەوە بۆ دواکەوتی؟!

ئافرەتەکە وتی: ئەمڕۆ کەسێکم بینیو باسی ڕووداوی زۆربوونی ئاوەکەی بۆ گێڕانەوە، پاشان وتی: یان گەورەترین جادوگەری سەر زەویە، یان پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرانی خودا..

ڕۆژەکان تێپەڕینو سوپای موسڵمانان بە ناوچەکاندا بڵاوبوونەوە، ئافرەتەکەش بە هۆزەکەی خۆی دەوت: ئەی هۆزەکەم سوێند بە خودا نیشانەیەکی زۆر گەورەم لەو پیاوە بینی، ئیتر بۆ باوەڕی پێناکەنو موسڵمان نابن؟! پاشان ئەم ئافرەتە بوو بەهۆی موسڵمان بوونی هۆزەکەیو بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن، هەتا باوەڕیان هێنا..

چەندین نیشانەی تری هاوشێوەی ئەو نیشانەیەی ئافرەتەکەو هاوەڵان بینییانو گەورەتریش، چەندین جار لە ژیانی پێغەمبەری خواداﷺ دوبارە بوونەتەوە..﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا

رُسُلَنَا بِٱلۡبَیِّنَٰتِ ...﴿٢٥﴾ الحدید. واتە: (سوێند بە خودا بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان ڕەوانە کردووە، هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی ڕوونو ئاشکرادا)..

بەڵێ.. پەروەردگار چەندین بەڵگەو نیشانەی لەگەڵ پێغەمبەران دەنارد بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ پشتگیریو سەلماندنی پێغەمبەرایەتیەکانیان..

* جارێکی تریان، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕێکەوتنی حودەیبیەدا، کە ئەوسا وەك ئێستا حودەیبیە گەڕەکێك نەبوو لە مەککە، بەڵکو لە دەرەوەی مەککە بوو، بێباوەڕیان ڕێگرییان لە پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵان کرد، بچنە مەککەوەو عومرەکەیان ئەنجام بدەن، هاوەڵان ژمارەیان ١٤٠٠ کەس بوو، ڕووداوی حودەیبیە دوورو درێژە، لێرەدا ئێمە باسی دیمەنێك دەکەین.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ دەست نوێژی دەگرت، بینی هاوەڵان لێی کۆبوونەتەوە، پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك ئەمەی بینی فەرمووی: ئەوە چیە لە دەورم کۆبوونەتەوە؟!

هاوەڵان لە وەڵامدا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ نە بۆ خواردنەوەو نە بۆ دەست نوێژ، جگە لەو ئاوەی بەردەستی تۆ، هیچ ئاوێکی ترمان لە لا نیە، پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قسەیە بوو، پەنجە پیرۆزەکانی خستە ناو ئاوەکەوەو ئەو هەموو هاوەڵەش بەو ژمارە زۆرەوە چاوەڕێیان دەکرد..

جابرﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خودا بینیم ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەری خوداوەﷺ هەڵدەقوڵاو دەردەچوو، هەموومان تێر ئاومان خواردو دەست نوێژمان گرتو هەرچیەکیشمان پێبوو، پڕمان کرد، سوێند بە خودا ئەگەر سەد هەزار کەسیش بووینایە، بەشی دەکردین..

* عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: لە پێش موسڵمان بوونمدا شوان بووم، پێغەمبەری خوداﷺ و ئەبوبەکرﷺ بینی، پێغەمبەری خوداﷺ تینووی بوو، بانگی کردمو فەرمووی: ئەی فڵانە کەس هەندێك شیرمان بدەرێ..

عبداللەی کوڕی مەسعودیش دەڵێت: من چاودێرو پارێزەری ئەم مەڕانەمو لە لام سپاردەن..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: ئەی هیچ مەڕێکت لە لا نیە کە نەزابێتو هیچ شیری تێدا نەبێت؟

عبداللەﷺ دەڵێت: وتم: با لە لامەو بۆم هێنا..

پێغەمبەری خوداﷺ دەستی پیرۆزی بە گوانەکانیدا دەهێنێتو قاچەکانی دەکاتەوەو گوانەکانی پڕ لە شیر دەبن..

عبداللەﷺ دەفەرموێت: منیش بە سەرسامیەوە هەر سەیرم دەکرد.. پێغەمبەری

خوداﷺو ئەبوبەکرﷺ تێریان لە شیرەکە خواردو پاشان عبداللەی کوڕی مەسعودیش لێی دەخواتەوە.. عبداللەﷺ بە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: لەوەی وتت، فێرم بکە..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: (إنك غلام معلَّم). واتە: (تۆ منداڵێکی پەروەردەکراوو گۆشکراویتو زانستو زانیاریت پێدەدرێت)..

عبداللەﷺ موسڵمان دەبێتو حەفتا سورەتی قورئان لە پێغەمبەری خوداﷺ وەردەگرێت، کە کەس ڕکابەری ناکات تیایاندا..

گەورەترین بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەری ئازیزیش کە هەتا دونیا دونیا دەمێنێتو بە زیندوویی دەمێنێتەوە، قورئانەکەی پەروەردگارە کە بۆ ئەو پێغەمبەرە ئازیزەی ناردووە..

پەروەردگار لە سەر ئاینەکەت جێگیرو دامەزراومان بکە.. ئیمانو ئیسلام لە دڵو دەروونماندا خۆشەویست بکەو بۆ ڕەزامەندی خۆتو جوان پەرستنت یارمەتیمان بدە.. آمین..

# خۆبەگەورەزانینو لەخۆبایی بوون.. ڕێگەیەک بۆ بێباوەڕی..

خۆبەگەورەزانینو شانازی کردن بە خۆوە، خاوەنەکەی بەرەو بێباوەڕی دەباتو پەنا بە خودا لەوانەیە بە بێباوەڕی بمرێت..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت:((لايدخل الجنة من في قلبِهِ مثقال ذرةٍ من كبر)). رواه البخاري. واتە: (هەر کەسێك تۆزقاڵێك خۆ بە گەورە زانین لە دڵیدا هەبێت، ناچێتە بەهەشت)..

هەروەها دەفەرموێت: (( يُحشَرُ المتكبرون يوم القيامة كأمثال الذر، يطؤهم الناس بأقدامهم)). رواه البخاري. واتە: (لە ڕۆژی دواییدا ئەو کەسانەی کە خۆ بە گەورەزان بوون، لە شێوەی مێرولەی بچوکدا حەشر دەکرێنو خەڵکی پێیان پێدا دەنێن)..

*لە سەردەمی ئیمامی عومەرداﷺ یەکێك لە پادشاکانی غەسسان بە خۆیو کۆمەڵێك لە دارودەستەکانیەوە دێت بۆ شاری مەدینە.. ئەم پادشایە زۆر بە خۆگەورەزانینەوە بە ڕێگەدا دەڕۆیشتو کۆمەڵێك خزمەتکاریش بە دەوریەوە بوونو بەم شێوەیە ڕووی لە شاری مەدینە کرد، بۆ ئەوەی بچێتە لای ئیمامی عومەرﷺ..

بەڵێ.. بە تاجێکی زێڕو جلوبەرگێکی ئاوریشمەوە چووە لای ئیمامی عومەرﷺ، ئیمامی عومەرﷺ داوای لێکرد موسڵمان بێت، ئەویش موسڵمان بوو، ئیمامی عومەرﷺ داوای لێکرد تاجەکەی سەریو جلوبەرگە ئاوریشمەکەی دابنێو لە هەمان جلوبەرگی موسڵمانان لەبەر بکات..

پادشاکەش بە قسەی ئیمامی عومەری کردو پاشان ویستی بەرەو مەککە بکەوێتە ڕێو عومرە ئەنجام بدات.. ئیمامی عومەرﷺ چۆنیەتی ئەنجامدانی عومرەو لەبەرکردنی ئیحرامی فێرکردو کەوتەڕێ بەرەو مەککە، بەڵام لە ناخو دەروونیدا هەر خۆبەگەورەزانین مابوو..

بەڵێ.. ئەم پیاوە گەیشتە مەککەو دەستی بە (لبيك اللهم لبيك) کردو بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا کەوتە سوڕانەوە.. کەعبەی پیرۆز وەك ئێستاکە گەورەو فراوان نەبوو، بەڵکو زۆر بچوك بوو.. لە کاتی سوڕانەوە بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا، پیاوێکی دەشتەکی ئاسایی قاچی بەر ئیحرامەکەی دەکەوێت، ئاوڕ دەداتەوەو بە دەموچاوی کابرای دەشتەکیدا دەکێشێتو ئەوەندە ئازاری پێدەگات، خەریکە کوێری بکات..

کابرای دەشتەکی پێی دەڵێت: لە ناو حەرەمی پیرۆزدا هەموومان لە خودای گەورە دەپاڕێینەوە، کەچی بە دەمو چاومدا دەکێشیت؟! ئەم پیاوە هیچ ناکات، چونکە دەزانێت بەرپرسێکی دادپەروەریان هەیە کە ئیمامی عومەرە‌ﷺ..

پیاوەکە دەکەوێتە ڕێ هەتا دەگاتە مەدینەو دەچێتە خزمەتی ئیمامی عومەر‌ﷺو پێی دەڵێت: فلانە کەس بە شێوەیەك كێشای بە دەمو چاومدا، خەریك بوو چاوم كوێر بكات..

ئیمامی عومەر‌ﷺ ناردی بە شوێن پادشاکەداو ئامادەیان كرد بۆ دادگایی كردن.. ئیسلام لە بابەتی دادگایی كردندا، جیاوازی لە نێوان گەورەو بچوكو هەژارو دەوڵەمەندا ناكات، چونکە خەڵکی هەمووو یەکسانن..

بەڵێ.. پیاوە دەشتەکیە ئاساییەکە لەگەڵ پادشاکەدا لە بەردەم ئیمامی عومەر‌ﷺ وەستان.. ئیمامی عومەر‌ﷺ پرسی: بۆچی لەم پیاوەتدا؟

ئەویش دەڵێت: لەبەرئەوەی قاچینا بە ئیحرامەکەمدا..

ئیمامی عومەر‌ﷺ دەفەرموێت: کەسێك بە هەڵە قاچ بنێت بە جلوبەرگو ئیحرامەکەتدا، دەبێت لەبەر چاوی خەڵکی بە ڕوخساریدا بکێشیت؟! شێوازی تر هەیە، جگە لە کێشان بە دەمو چاویدا!! خۆ ئەگەر ڕێگە بدرێت هەر کەسەو خۆی مافی خۆی بسەنێت، ئەوا نەفامی دەگەڕێتەوەو خەڵکی دەست دەکەن بە خوێن ڕشتنی یەکتر، پاشان ئیمامی عومەر‌ﷺ بە پادشاکە دەڵێت: دەبێت بە هەمان شێوە لە ڕوخسارت بدرێت..

پادشاکە دەڵێت: لە ڕوخسارم بدرێت، لە کاتێکدا من پادشاو دەسەڵاتدارم؟!

ئیمامی عومەر‌ﷺ دەفەرموێت: با پادشا بیت، دەبێت تۆڵەت لێبکرێتەوە، مەگەر ڕازی بکەیتو لێت خۆش بێت، سەری ماچ بکەو داوای لێبوردنی لێبکە، ئەگەر لێت خۆش بوو، ئەوا کارەکە تەواو دەبێت، ئەگەر نا دەبێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە..

پادشاکە دەڵێت: دەڕۆمو سبەینێ دێمەوە با تۆڵەی خۆی بکاتەوە..

لە پێش دەست پێکردنی جەنگی بەدردا، پێغەمبەری خوداﷺ هاوەڵانی ڕیز دەکردو پێشو دوای پێدەکردنو ڕێکی دەخستن.. هاوەڵێکی بەڕێز بە ناوی سەوادی کوڕی غوزیە، کە لە جەنگاوەرانی بەدر بوو، هەر لەو جەنگەشدا شەهید بوو، پێغەمبەری خوداﷺ بانگی دەکاتو پێی دەفەرموێت: بچۆ دواوە، بەڵام ئەم هاوەڵە گوێی لێ نابێت، پێغەمبەری خوداﷺ دارێکی بە دەستەوە دەبێت، بە دارەکەی دەستی بە سکی سەوادا دەکێشێتو پێی دەڵێت: سەواد بچۆرە دواتر..

سەوادیش‌ﷺ دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئازارتدام..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: دەی تۆڵەی خۆتم لێبکەرەوە..
سەوادرضي الله عنه دەی دارەکەی دەستتم بدەرێو سکیشت با ڕووت بێت، وەکو چۆن من سکم ڕووت بوو..
پێغەمبەری خوداﷺ سکی ڕووت دەکاتو دارەکەی دەداتێ، بەڵام ئەم هاوەڵە بەڕێزە چۆن دڵی دێت ڕوناکی چاوی ئازار بدات، هەر بۆیە خۆی بە سکی پێغەمبەرەوەﷺ دەنوسێنێتو ماچی دەکات..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: سەواد ئەوە بۆ وات کرد؟!
سەوادرضي الله عنه دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ حەزم کرد کۆتا جەستە کە بەر جەستەم دەکەوێت، جەستەی پیرۆزی تۆ بێت. (رواه البخاري)..
بەڵێ.. پادشاکە ڕازی نەبوو تۆڵەی لێبکرێتەوە، هەر بۆیە وتی سبەینێ دێمەوە، بەڵام ئایا دێتەوە یان نا؟!
نەخێر نەهاتەوە، خۆی پێچایەوەو بە سواریی لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانیدا بەرەو شامو ناوچەی خۆیان گەڕانەوەو دوبارە بووەوە بە گاورو لەباتی یەکتاپەرستیو یەکخواپەرستی دەیوت: سێ خودا هەیەو وازی هێنا لە: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤﴾ الإخلاص. واتە: (ئەی موحەممەدﷺ، ئەی ئیماندار بڵێ: ئەو خودایەی کە ناوی الله یە خودایەکی تاکو تەنهایە.. خودا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نیەو هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێتو پێویستیو داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات.. هیچ کەسی لێنەبووەو خۆیشی لە کەس نەبووە.. هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێتو هاوشانی بێت)..
بەڵێ.. بووەوە بە گاور، تەمەنی بەرەو پیری ڕۆییو زۆر پەشیمان بوو لەوەی کردی، بیری لەو چەند ساتە دەکردەوە، کە باوەڕی هێناو یەکخواپەرست بوو، هەر بۆیە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا دەست بە گریان دەکاتو دەڵێت:

يااليت أمي لم تلدني وليتني — رجعت إلى القول الذي قال لي عمر
ويااليت لي بالشام أدنى معيشة — أجالس قومي ذاهب السمع والبصر..

بەڵێ.. خۆزگە دەخوازێت کە دایکی ئەمی نەبووایە، هەروەها خۆزگە دەخوازێ کە بە قسەی ئیمامی عومەریرضي الله عنه بکردایە، خۆزگە دەخوازێ هەژارو نەدار بووایە، تەنانەت خۆزگە دەخوازێت شوانی وشتر بووایە، نەك بگەڕایەتەوە بۆ سەر ئاینی مەسیحیو وازی لە یەکتاپەرستی نەهێنایە..
پەنا بە خودا خۆبەگەورەزانین وای لێکرد، بە بێباوەڕی بمرێتو لە ڕاستە ڕێگەی

ئیسلام لابداتو نەفامی هەڵبژێرێت..

* ئیمامی عەلیﷺ کاتێك ئەمیری باوەڕداران بوو، ڕۆژێك دەچێتە بازاڕ، قەڵغانەکەی یان کەرستەیەکی جەنگی خۆی بە دەستی جولەکەیەکەوە دەبینێتو بە جولەکەکە دەڵێت: ئەوە هی منە..

جولەکەکەش دەڵێت: نا.. هی تۆ نیە، بەڵام ئەگەر دەتەوێت، دەتوانیت لێمی بکڕیت..

ئیمامی عەلیﷺ دەڵێت: من ئەمیری باوەڕدارانمو درۆت لەگەڵ ناکەم، ئەوە هی منە..

جولەکەکەش دەڵێت: نەخێر.. هی تۆ نیەو کێشەکەیان دەبەنە لای قازی..

کاتێك دەچنە بەردەم قازی، قازییەکە بە ئیمامی عەلیﷺ دەڵێت: لە تەنیشت جولەکەکەوە بوەستەو قسە بکە بزانم چیت دەوێت؟

ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو قازیە فەرمانبەرێکی فەرمانڕەوایەتیەکەی ئیمامی عەلیەﷺ، لەبەر ئەوەی هاوڵاتیان لە بەردەم دادگای ئیسلامدا هەموو هاوشێوەی یەك یەکسانن..

ئیمامی عەلیﷺ دەفەرموێت: ئەو قەڵغانە هی منەو فلانە ڕۆژ لێم کەوتووەو وون بووە..

جولەکەکەش دەڵێت: نەخێر.. هی ئەو نیە، من کڕیومەو دەمەوێت بیفرۆشم..

قازی بە ئیمامی عەلیﷺ دەڵێت: شایەدت هەیە؟

ئیمامی عەلیﷺ دەفەرموێت: بەڵێ.. حەسەنی کوڕم شایەدمە..

قازی دەڵێت: شایەدی کوڕ بۆ باوك وەرناگیرێت، شایەدی ترت هەیە؟

ئیمامی عەلیﷺ دەفەرموێت: نەخێر..

قازییەکەش دەڵێت: دەی کەواتە قەڵغانەکە هی ئەو پیاوە جولەکەیەیە..

کابرای جولەکە کاتێك ئەمە دەبینێتو سەیری قازییەکەو ئیمامی عەلیﷺ دەکات، دەڵێت: پاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگار، ئەم ئایینە چەند دادگەرە، قازییەك لە دژی ئەمیری باوەڕدارانو سودی جولەکەیەك بڕیار دەدات!!

جولەکە خاوەنی ئەو هەموو وتە نابەجێیانەن، لەوەی کە دەڵێن: عوزێر کوڕی خودایە!! خودا هەژارە!! خودا دەستی بەستراوە!! کەچی لە بەرژەوەندی جولەکەیەك بڕیارێك دەردەچێت.. بڕیارەکەش بە سەر کێدا، بە سەر ئەمیری باوەڕانداراندا دەردەچێتو وتەکانی لێ وەرناگیرێت، چونکە تەنها شایەدێکی هەیە، ئەویش کوڕەکەیەتی، ئەو کوڕەی کە گەورەی لاوەکانی بەهەشتە!!

بەڵێ.. کاتێك کابرای جولەکە ئەم دیمەنە دەبینێت، دەڵێت: أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد

أن محمداً رسول الله.. ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەوە قەڵغانەکەتە بیگرە، ڕاستەکەیت لێت کەوتو منیش هەڵمگرتەوە..

ئیمامــی عەلی﷛ دەفەرموێت: مادام موســڵمان بوویت، ئەوا وەکو دیارییەك با بۆ تۆ بێت..

بەڵێ.. خەڵکی یەکسانن.. نابێت لە بەرژەوەندی بەهێزەکان بڕیار بە سەر لاوازەکاندا دەرچێت، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنما أهلك الناس قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد). رواه البخاري. واتە: (بە دڵنیاییەوە خەڵکانێك پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناوچوون، کاتێك کەسێکی بەناوبانگو ناسراو دزی بکردایە، وازیان لێدەهێناو سزایان نەدەدا، بەڵام ئەگەر کەسێکی لاوازو بێ دەسەڵات دزی بکردایە، سزایان دەدا)..

کێشەو گرفتی خۆبەگەورەزانین، ئەوەیە زۆرجار دەبێتە هۆی ئەوەی حەقو ڕاستی وەرنەگرێتو پشتی تێبکات.. چەندین کەس هەن خۆبەگەورەزانین، وای لێکردوون ڕێنماییو ڕاستی وەرنەگرن، چەندین کەسیش هەن خۆبەکەم زانینو خاکی بوونیان، بەرەو هیدایەتو ڕێنمایی بردوونو دونیاو دوارۆژی خۆیان ڕۆشن کردۆتەوە..

بە دڵنیاییەوە ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانن، لە بەزەیی خودا دوور دەخرێنەوەو ڕێگەی ڕاست ون دەکەن، ئەوەتا ئەبوجەهل کاتێك دەربارەی ڕاستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ پرسیاری لێدەکەن، ئەویش دەڵێت: بە خودا من دەزانم کە ڕاست دەکاتو پێغەمبەرەو پەرستنی بتەکانمان هیچ سودێکمان پێناگەیەنن، بەڵام ئێمە لە هۆزی (بەنی مەخزوم) ینو ئەویش لە هۆزی (بەنی عبدالمناف)ەو هەر دوو هۆزەکەش دەگەڕێنەوە سەر قورەیشو بەردەوامیش لەگەڵ یەك لە کێبڕکێو پێشبڕکێ داینو هەر یەکەمان دەمانەوێت دەست بە سەر گەورەیی مەککەدا بگرین، هەر بۆیە کاتێك ئەوان خواردنیان دا بە میوانانو حاجیانی ماڵی خودا، ئێمەش وامان کرد، ئەوان ئاویان پێدان، ئێمەش کردمان، بەردەوام وەکو دوو ئەسپ لە پێشبڕکێی یەکتردا بووین، ئێستا پێغەمبەرایەتی لە هۆزی ئەوان هاتووەو پێمان دەڵێن: پێغەمبەر لە ئێمەیە، ئێمەش بێجگەلە بە درۆخستنەوەو باوەڕ پێنەهێنانی هیچی ترمان بە دەستەوە نەماوە!!

سەیرکە خۆبەگەورەزانین چۆن بەرەو هەڵدێرو بێباوەڕیو گومڕایی برد..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ ﴾ البقرة. واتە: (خۆ ئەگەر پێی بوترێت: لە خودا بترسە، (هەروا بۆت نالوێت)، غەرڕایی دەیگرێتو شانازی بە گوناهو تاوانەوە دەکاتو سوور دەبێت لە سەری، تۆڵە لە ئیمانداره دڵسۆزەکە دەسێنێتو تاوانباریشی دەکات، جا ئەو خودا نەناسە

دۆزەخی بەسە، سوێند بە خودا ئەو دۆزەخە شوێنو جێگەو لانکەیەکی نالەبارە)..

چەندین کەس هەن کاتێك پێیان دەڵێیت: مافی خەڵکت بە سەرەوەیەو بۆیان بگێڕەوە، دەڵێت: ئەوە کەی کاری تۆیە، خۆم باش دەزانم چی بکەمو چی نەکەم!!

بەڵێ.. زۆرجار ئامۆژگاری خێری کەسێك دەکەیت، خۆبەگەورەزانین نایەڵێت بە گوێت بکاتو پشت هەڵدەکاتو دەڕوات..

* کەسێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کێشەی هەبوو، هاوسەرەکەی چووەوە بۆ ماڵی باوکیو کێشەکە خەریك بوو گەورە دەبوو، ئێمەش پێمان وت: فلانە کەس هەڵەکە لە تۆوەیە، جا دانی پێدا بنێیت یان نا، تۆ هەڵەکەت ئەنجامداوەو تاوانبار تۆیت، چی تێدایە بچۆ بۆ لایو پۆزشی بۆ بهێنەرەوەو داوای لێبوردنو لێخۆشبوونی لێبکە، منداڵەکانت دەربەدەرن، ماڵەکەت بگێڕەوە بۆ ئەو حاڵەتەی پێشتر تیایدا بوون، خۆ هاوسەرەکەشت داوای پارەو پولی لێنەکردوویت، تەنها دەڵێت: با داوای لێبوردن بکات، چونکە بەڕاستی بوهتانت بۆ کردووە، تۆ گومانت بردووەو گومانەکەشت هەڵە بووە..

لە وەڵامدا پیاوەکە وتی: من داوای لێبوردنی لێبکەم؟! من؟!

تەنها خۆبەگەورەزانین بوو نەیهێشت، داوای لێبوردن لە هاوسەرەکەی بکات!!

جاری وا هەیە، لە سەر نان خواردن بە کەسێك دەڵێیت: فلانە کەس خودا پاداشتی خێرت بداتەوە، بە دەستی ڕاستت بخۆ.. خۆبەگەورەزانین وای لێدەکات، هەر ئاوڕیشت لێ ناداتەوە..

* جارێکیان پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا لە شوێنێك دانیشتبوون، پیاوێکی لێدەبێت بە دەستی چەپی نان دەخوات، پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە نەرمونیانی پێی دەفەرموێت: بە دەستی ڕاستت بخۆ..

پیاوەکەش دەڵێت: ناتوانم، بەڵام نەتوانینەکەی تەنها لەبەر خۆبەگەورەزانین بوو، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: با دەتوانیت..

گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: دەستی پیاوەکە وشك بوو، ئیتر نەیتوانی بۆ دەمی بەرێت. (رواه البخاري)..

سەیرکەن خۆبەگەورەزانین چی لەو پیاوە کرد؟!

خەڵکانێك هەن کاتێك ئامۆژگارییان دەکەیت، بۆ ئەوەی موسڵمان بن، بەهۆی خۆ بەگەورە زانینیانەوە، باوەڕ ناهێنن..

* کەسانێك کاتێك پێیان دەڵێیت: وەرن بۆ مزگەوت نوێژەکانتان ئەنجام بدەن، خۆبەگەورەزانین نایەڵێت بێن بۆ مزگەوت، هەروەك کاتێك بە حەجاجی کوڕی ئەرتەرەیان وت: وەرە بۆ مزگەوت نوێژەکانت بکە، لە وەڵامدا دەڵێت: من بێم لەگەڵ

کەسانێکدا بوەستمو نوێژ بکەم، کە لە بازاڕ خەریکی بارهەڵگریو کۆڵ کێشانن، منیش بەو هەموو جلوبەرگە جوانو بۆنی خۆشەمەوە؟! لە کاتێکدا دەڵێن: ئەم پیاوە کەسێك بووە لەو کەسانەی کە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، بەڵام هەندێك دەڵێن: ئەو بۆچوونە لاوازە..

بەڵێ.. چەندین کەس ئەمڕۆ بەهۆی خۆ بەگەورە زانینیانەوە نایەن بۆ مزگەوت، بۆ نمونە: کەسانێك کە بەڕێوەبەری فەرمانگە یان کۆمپانیا، یان ڕاگری کۆلێج، یان سەرۆکی زانکۆ، یان وەزیرن، نایەن بۆ مزگەوت نوێژەکانیان بکەن، بەڵکو لە ماڵەوە دەیکەن، ئەگەر بیکەن؟!

لە کاتێکدا پەروەردگار بانگت دەکاتو داوات لێدەکات لەگەڵ کڕنوشبەراندا کڕنوش بەریت.. ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقرة. واتە: (نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیەوەو زەکاتیش بدەن، لەگەڵ کڕنوشبەراندا کڕنوش ببەن)..

دەی ڕاگری کۆلێژ، بەڕێوەبەری فەرمانگە، بڕۆ بۆ مزگەوتو لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کڕنوش بۆ پەروەردگارت بەرە.. مزگەوت بۆ ئەوە کراوە نوێژی تێدا بکەین، نەك هەر کەسەمان شوێنێك بۆ خۆمان دیاری بکەینو نوێژی تێدا بکەین، کەسانێك هەن دەڵێن: لەگەڵ قوتابیەکانم نوێژ دەکەم، یان لەگەڵ کرێکارەکانم نوێژ دەکەم، تەنها خۆبەگەورەزانینە، کە ئەم قسانەی پێدەکات، بێگومان خۆ بەگەورە زانانیش لە ڕۆژی دواییدا وەکو مێرولەی بچوك زیندوو دەکرێنەوەو خەڵکی پێیان پێدا دەنێن، هەر کەسێکیش هێندەی تۆزقاڵێك خۆ بەگەورە زانین لە دڵو دەروونیدا هەبێت، ناچێتە بەهەشت..

پەروەردگار داوای خۆبەکەم زانینو خاکی بوونت لێدەکەین، پەنات پێدەگرین لە خۆ بەگەورە زانینو خۆ بەگەورە زانان.. آمین..

# پاراستنی چاو..
# لێرەوە بەندایەتی بۆ خودا دەردەکەوێت..

* سەیرکردنو بەرەڵاکردنی چاو، چیرۆکو ڕووداوێکی سەیری هەیە، پەروەردگار باوکە ئادەمی دروست کردو هەموو پێداویستییەکی وەك خواردنو خواردنەوەو پۆشاكو ڕووبارو خۆشیەکانی بۆ دابین کرد..﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ ...﴿٣١﴾﴾ فصلت. واتە: (مژدەتان لێبێت لە بەهەشتدا هەرچی ئارەزووی دەکەن).. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، باوکە ئادەم پێویستی بە کەسێك هەبوو، لە بەهەشتەکەی پەروەردگاردا لەگەڵیدا بژێت..

با بزانین پەروەردگار چ جۆرە دروستکراوێکی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژێت؟! ئایا باڵندەیەکی بۆ هەڵبژاد، بۆ ئەوەی بە دەنگی خۆش بۆی بچریکێنێت؟! یان پشیلەیەك لەگەڵیدا یاری بکات؟! یان ئەسپێکی جوان کە هاتوچۆی پێبکات؟! پەروەردگار دەیزانی کە ئادەم نێرەو پێویستی بە مرۆڤێکی مێینە هەیە، بۆ ئەوەی ژیانی لەگەڵ بەسەربەرێتو دڵی هۆگری بێت، هەر بۆیە پەروەردگار دایکە حەوای دروست کرد..﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ...﴿١٨٩﴾﴾ الأعراف. واتە: (خودا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە یەك نەفسو لە یەك شت دروست کردووەو هەر لەویش جووتەکەی بەدیهێنا، بۆ ئەوەی ئارامی لە لا بگرێت)..

بەڵێ پەروەردگار دایکە حەوای لە پەراسووی باوکە ئادەم ﷺ دروست کرد..

وەرن با پێکەوە، هەڵوێستەیەك لە سەر چەند چیرۆکێکی عاشقانو ئەویندارا‌ن بکەین، کە چۆن عاشق بوون؟ وە بۆ عاشق بوون؟ ئەی بزانین هەواڵی ئەویندارانو عاشقەکان چیەو چ باسە؟

* دوو ساڵ لەمەوبەر لە شام بووم، لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانمدا چووین بۆ چێشتخانەیەك لە دەرەوەی شار، لە تەنیشت چێشتخانەکەوە چیایەك هەبوو، لە سەر چیاکە بەردێکی گەورە هەبوو کە وێنەی دڵێکی لە سەر هەڵکۆڵرا بوو.. لەگەڵ یەکێك لە کارگوزارەکانی چێشتخانەکەدا دواینو پرسیاری ئەو بەردەمان لێکرد، لە وەڵامدا وتی: ئەو بەردە ناوی بەردی ئەویندارانو عاشقانە..

سەیری چیاکەم کرد، چیایەکی سەختو دژوار بوو، سەرکەوتن بە سەر ئەو چیایەدا ئاسان نەبوو، لە سەر بەردەکەش بەڕاستی وێنەی دڵ هەڵکۆڵرا بوو، پاشان بە کارگوزارەکەم وت: بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە؟!

کارگوزارەکە وتی: لەبەر ئەوەی کاتێك کەسێك، کەسێکی خۆش دەوێتو ناتوانێت بە

خۆشەویستەکەی بگات، دەچێتە سەر ئەو بەردە بەرزەو خۆی فڕێ دەداتە خوارەوەو خۆی دەکوژێت!!

بەڕاستی من نازانم ئەم ڕووداوە ڕاستە یان نا، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە عەشق هەندێك جار یاری بە دڵ دەکات، سەرەتاو بنەمای ئەو عەشقەش نەپاراستنی چاوە.. هەر لەبەرئەوە کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە سەر وشترەکەی، لە نزیك فەزڵی کوڕی عەباسی ئامۆزایەوە دەڕۆیشت، ئافرەتێك دێت بۆ لایو پرسیاری لێدەکاتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ دەبێت حەج بۆ باوکم بکەم، چونکە باوکم پیرەو ناتوانێت لە سەر ئاژەڵ خۆی بگرێت؟

ئافرتەکە، ئافرەتێکی جوان بوو، فەزڵیش گەنج بوو، پێغەمبەری خوداﷺ بە دەستی پیرۆزی ڕووی فەزڵی وەرگێڕا، بۆ ئەوەی سەیری نەکات، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ((کوڕو کچێکی لاوم بینی، شەیتان لە بۆسەدا بوو بۆیان)). (رواه البخاري)..

ئەمە لە کاتێکدا کە لە مەراسیمی حەجدا بوون، نەك لە بازاڕو لە بەرامبەر ئینتەرنێتو بەرامبەر کامێرا.. ئەمڕۆ ئافرەتان لە زانکۆکانو بازاڕەکان بە جلوبەرگی زۆر تەسكو تەنکەوە دەردەکەونو بە دەنگو وێنەو ڕەنگەوە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە شەونخونی لەگەڵ یەکتر دەکەن..

بەڵێ.. لە کاتی حەجداو لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺو ئافرەتێك بۆ پرسیارکردن دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوداﷺ بە دەستی پیرۆزی ڕووی ئامۆزاکەی وەردەگێڕێ بۆ لایەکی تر، لەبەر ئەوەی با ئەو گەنجە لە خزمەت پێغەمبەری خواشدا بێت، بەڵام شەیتان زیرەکەو بەرامبەر بە خودای پەروەردگار دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ نەوەکانی ئادەم‌ﷺ ڕاگەیاندوەو وتویەتی: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾ ص. واتە: (ئینجا شەیتان وتی: سوێند بە دەسەڵاتی بێ سنورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕاو سەرگەردان بکەم)..

پاشان وتی: ﴿ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف. واتە: (پاشان سوێند بە خودا لە بەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە، لە لای ڕاستیانەوە، لە لای چەپیانەوە، بۆیان دێمەو (دنیایان لا خۆشەویست دەکەمو گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەم)و دەست ناکەوێت زۆربەیان سوپاسگوزاربن)..

بەڵێ.. لەو شوێنو جێگەو مەراسیمە پیرۆزەدا، پێغەمبەری خوداﷺ ڕووی گەنجێك لە سەیرکردنی ئافرەتێکی نامەحرەم وەردەگێڕێ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((من غض بصره عن محاسن إمرأةٍ وهو قادرٌ على أن ينظر إليها أورثهُ الله إيماناً يجد حلاوته في قلبه)). رواه البخاري. واتە: (هەر کەسێك چاوەکانی لە

ئاستی جوانییەکانی ئافرەتدا دابخات، لە کاتێکدا توانای هەبێت، سەیری بکات، ئەوا پەروەردگار باوەڕو ئیمانێکی پێدەبەخشێت، شیرینی ئەو باوەڕو ئیمانە لە دڵیدا هەست پێدەکاتو دەردەکەوێت)..

پاراستنی چاو لە جوانییەکانی ئافرەت، لە ڕێگەی سەتەلایتو کەناڵە ئاسمانیەکان.. هەروەها لە ڕێگەی ئینتەرنێت.. لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان.. لە بازاڕو زانکۆکانو فرۆکەخانەکانو لە هەر شوێنێکی تر کە ئافرەتانی لێبن.. ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ...(٣٠)﴾ النور. واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی نامەحرەم) هەروەها ناموسو عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان)..

* پیاوێکی دەشتەکی لە ڕابوردوودا، ئەوەندە عاشقی کەنیزەکەکەی دەبێت، زۆری خۆش دەوێتو بە تەواوی عاشقو شەیدای دەبێت، بە جۆرێك کە سەیری دەکات، ئارامی لێدەبڕێت.. ئەم خۆشەویستییە، خۆشەویستی یەکێك لە کاربەدەستانی ئەندەلوسم بیر دێنێتەوە..

دەگێڕنەوە ئەو کاربەدەستە، شەیدای یەکێك لە کەنیزەکەکانی دەبێت، ڕۆژێك پێکەوە دانیشتنو بەدەم یەکەوە پێدەکەنن، بەڵێ.. کەنیزەکەکە پێدەکەنێتو پیاوەکەش ترێ دەکاتە دەمی کەنیزەکەکەوەو لە بۆری هەناسەی دەگیرێتو دەخنکێت.. پیاوەکە کاتێك ئەمە دەبینێت، باوەشی پێدا دەکاتو ماچی دەکاتو دەست دەکات بە گریانو زۆر دەیجوڵێنێت، بەڵام بۆی دەردەکەوێت کە بەڕاستی مردووە، هەر بۆیە نایەڵێت کەس لە شوێنەکەی خۆی بیجوڵێنێو حەوت ڕۆژ لە ژوورەکەی ناچێتە دەرەوەو بەرامبەری دادەنیشێت، گۆڕانکاری بە سەر جەستەی کەنیزەکەکەدا دێتو قسەی لەگەڵ دەکەن، تا قەناعەتی پێدەکەن کە مردووە..

بەڵێ.. عەشقی زۆر بە تین، ئەگەر دەستی بە سەر دڵدا گرت، ئەوا شەیتانو دەست بەتاڵی، لەوانەیە ئاینو ژیری ئەو کەسە تێك بدەنو خراپی بکەن..

با بێینەوە سەر ڕووداوی کابرا دەشتەکیەکە.. ئەم پیاوە ڕۆژێك بەندەیەك دەبینێت سەیری کەنیزەکەکەی دەکات، کە ئەم زۆری خۆش دەوێت، هەر بۆیە زۆر تووڕە دەبێتو دەڵێت: چۆن دەبێت جگە لە من کەسێکی تر سەیری بکات؟!

پیاوەکە دەچێت بۆ لای کەنیزەکەکەو ڕمێك دەکات بە قوڕگیداو دەیکوژێت!! کاتێك هۆشی دێتەوەو دەزانێت چی کردووە، دەست بە گریانێکی بە کوڵ دەکات، بەڵام تازە گریان چ سودێکی هەیە!!

سەیرکە لە خۆشەویستیدا کوشتی!!

ئەمڕۆ کەسانێك بەناو خۆشەویستەکانیان دەفرێنن!! جاری وا هەیە سەیرکردنی

زۆر سەردەکێشێ بۆ کاری خراپتر، من خۆم لە بەندیخانەدا گەنجێکم بینی حەزی لە گەنجێکی کوڕ کرد بوو!! لە بەندیخانەدا گەنجانێکی زۆرم بینی، ساڵێك یان دوو ساڵ بە بەندکردن سزادرا بوون، بەهۆی کوشتنی خۆشەویستەکانیانەوە هەیان بوو سزای کوشتنیان بۆ بڕیاردرا بوو، هەیان بوو گەنجێکی ڕەگەزی خۆی فڕاند بوو، پاشان دەستگیر کرا بوو، هەیان بوو دوای فڕاندنی کوشتبووی، پەنا بە خودا!!

خۆ ئەگەر پەنایان بە خودا بگرتایەو وازیان لەو کارە خراپە بهێنایە، مایەی سەلامەتی هەردوو دونیا دەبوون..

کەسانێکی تر، کاتێك شەیدای ئافرەتێك بوون، بە فێڵ هەڵیان گرتبوون، کاتێکیش منداڵ کەوتبووە نێوانیان، لەبەر ئەوەی گرێبەستێکی شەرعی لە نێوانیاندا نەبوو، نکوڵییان لەوە کرد بوو، کە ڕەچەڵەکی منداڵەکەی بۆ بگێڕنەوەو بیکەن بە منداڵی ئەو، هەموو ئەمانەش بەهۆی بەرەڵاکردنی چاوو پەیوەندی نادروستەوە ڕوویانداوە..

ئەمڕۆ کارەکە زۆر گەورەتر بووە لە جاران، هەروەك یەکێك لە شاعیران باسی دەکاتو ئەندەلوسی لە کتێبی (بهجة المجالس) دا گێڕاویەتیەوەو دەڵێت: جاران شەیدایانو عاشقان، عەشقو ئەوینەکەیان پاكو خاوێن بوو، ڕاستە هەندێك ناشەرعی تێدا بووە، بەڵام پاكو ڕەوشت بەرز بوونو چەندین هۆنراوەو وتەی جوانیان لە سەر یەك وتووە، نەوەك عیشقی ئەمڕۆ، کە بەڕاستی خراپەکاریو بەدڕەوشتیە، نەك عەشقو خۆشەویستی.. ئەمڕۆ شەیتان لە ڕێگەی ئینتەرنێتو ژوورەکانی پاڵتاكو ماسنجەرو چاتو پەیوەندییە دەنگیو ڕەنگیەکانەوە، خراپەکارییەکانی زۆر زۆر ئاسان کردووە..

لە کۆندا کاتێك شەیتان بیویستایە کەسانێك لە خشتەبەرێ، چەندین ڕێگرو بەربەست هەبوون، ئافرەت لە لایەن کەسوکارییەوە چاودێری دەکرا، تەلەفۆنو مۆبایلو ڕێگەکانی پەیوەندی کردن نەبوو، ئەگەر تەلەفۆنێکیش هەبووایە، هی هەمووان بوو، لەبەر چاوی هەمووان دادەنرا، ئێستا هەر کەسەو مۆبایلی خۆی، بگرە چەند مۆبایلێکی هەیە، جاری وا هەیە لەوانەیە هەر گیرفانەی ژمارەیەك یان مۆبایلێکی تێدابێت، هەر بۆیە لێرەوە پەرستنی پەروەردگار دەردەکەوێتو دەتوانین خۆمان تاقی بکەینەوە، کە چەندێك لەگەڵ خۆمانو خودای گەورەدا ڕاستگۆین..

* ئیبن جەوزی رحمه الله باسی چیرۆکی یوسف عليه السلامو ژنەکەی عەزیزی میسر دەکاتو دەڵێت: کاتێك ئافرەتەکە هەموو ئامادەکارییەکی کردو بە یوسف عليه السلامی وت: من ئامادەم، بەڵام یوسف عليه السلام فەرمووی: پەنا بە خودا، پەروەردگار یان عەزیزی میسر چاکەی لەگەڵ کردووم، چۆن خیانەت دەکەم؟!

پاشان لەبەر دەستی هەڵدێتو ڕادەکات، هەتا جلوبەرگەکەی لە لایەن ئافرەتەکەوەو لە دواوە دەدڕێنرێت، پاشان بۆ چەندین ساڵ لە بەندیخانەدا ژیان بەسەر دەبات، لێرەدا

ئیبن جەوزیﷺ دەڵێت: ئا لێرەدا پەرستنی ڕاستەقینە بۆ پەروەردگار دەردەکەوێت، نەك لە ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژدا..

بەڵێ لەم هەڵوێستانەدا پەرستنی ڕاستەقینە دەردەکەوێت، لەو کاتانەی کە مرۆڤ دەتوانێت کاری خراپ ئەنجام بدات، بەڵام لەبەر پەروەردگار بە سەر دەروونیدا زاڵ دەبێتو پشت لە تاوانو گوناه دەکات..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ...﴿٣٠﴾﴾ النور. واتە: (ئەی پیغەمبەرﷺ بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی نامەحرەم) هەروەها ناموسو عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان)..

پاشان دەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ...﴿٣١﴾﴾ النور. واتە: (بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه).. تەنانەت ئافرەتانیش دەبێت چاوەکانیان بپارێزن لە سەیرکردنی کەسانی نامەحرەم.. لە دوای پاراستنی چاو، مرۆڤی ئیماندار، پێویستە لە شوێنو جێگەی خراپ دوور بکەوێتەوە، بازاڕێك کە ئافرەتی زۆری لێیە، بەبێ کارو بەبێ ئیش پێویست ناکات بۆی بچێت، ئەگەر ئەو پێویستییانەی کە پێویستت پێیانەو لە بازاڕێکی تر هەن، پێویستە بچیت بۆ بازاڕێکی تر بیکڕیت، زانکۆیەك بەناوبانگە بەوەی ئافرەتی دانەپۆشراوی زۆری لێیە، دەتوانیت لە زانکۆیەکی تر ناوت تۆمار بکەیتو درێژە بە خوێندن بدەیت..

پەروەردگار لە تاقیکردنەوەیەك بمان پارێزێت، کە بەرگەی ناگرینو لە هەموو خراپەیەکی ئاشکراو نهێنی بمان پارێزە.. آمین..

# ئەو خاوەن گوێدرێژەی بوو بە فەرمانڕەوا..

مرۆڤەکان جیاوازن، مەبەستو هیواو بەرنامەو بیرکردنەوەیان بۆ ژیان لەگەڵ یەك جیاوازە.. هەیانە تەنها بە هیواو ئومێد واز دەهێنێت، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾﴾ النساء. واتە: (پاداشتو ڕێزو نرخ نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێتو هیچ کەسو هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خودا پشتگیری بکاتو یارمەتی بدات)..

بەڵێ.. پەروەردگار دەفەرموێت: چوونە بەهەشت نە بە ئارەزووی ئێوە، نە بە ئارەزووی گاورو جولەکەکان نابێت.. چوونە بەهەشت تەنها بە هیواو ئوێدو بە ئارەزوو نابێت..

نەخێر.. تەنها ئومێدو ئارەزوو، سەرکەوتن بەدی ناهێنێت.. دوژمنانیش تێك ناشکێنێت.. تەنها باڵندەیەکیش ڕاو ناکات.. مرۆڤ هەر چەندە سەیری باڵندەکانی ئاسمان بکاتو هێوای ئەوە بخوازێت، کە ئەو باڵندەیە بە برژاوی یان سورەوەکراوی بێتە بەردەستی، نایاتو ئەو کارە ڕوو نادات..

مرۆڤ کاتێك بە بەردەم خانوویەکی جوانو سەیارەیەکی جواندا تێپەڕێتو ئارەزووی بکاتو هیوای بۆ بخوازیت، ئەگەر کاری بۆ نەکات، هیچ سودێکی نابێت..

* باسی ڕووداوێکی سەیری پیاوێك دەکەین، کە ئەم پیاوە بە گوێدرێژ کەلوپەل دەگوازێتەوەو کارەکەی لە سەر ئەوە دەبێت، پاشان دەبێت بە فەرمانڕەواو خەلیفە!!

پیاوەکە خەڵکی ئەندەلوسەو ناوی موحەممەدی کوڕی ئەبی عامر دەبێت، لەگەڵ دوو هاوەڵیدا بە گوێدرێژەکانیان ئیش دەکەنو کەلوپەل دەگوازنەوە، جاری واش هەبوو، بە گوێدرێژەکانیان خەڵکیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگواستەوەو بژێوی ژیانیان بەم ڕێگەیە بە دەست دەهێنا..

ڕۆژێکیان هەر سێکیان لە ڕێگەدا شەویان بەسەردا دێتو لە شوێنێك دەمێننەوەو گوێدرێژەکانیان لە تەنیشت خۆیانەوە دەبەستنەوەو دەست دەکەن بە نان خواردنو گفتوگۆکردن..

موحەممەدی کوڕی ئەبی عامر پێیان دەڵێت: هیوای چی دەخوازن؟

یەکێکیان دەڵێت: هیوام وایەو خۆزگە بەوە دەخوازم کە پێنج گوێدرێژم هەبێتو

لەجیاتی ئەوەی ڕۆژانە درهەمێك یان دوو درهەم پەیدا بکەم، دە درهەم پەیدا بکەم..

دووەمیان دەڵێت: خۆزگەی ئەوە دەخوازم، لەباتی ئەم گوێدرێژە لە بازاڕ دوکانێکم هەبێت..

پاشان ئەوانیش بەمیان وت: ئەی تۆ خۆزگەو هیوای چی دەخوازیت؟

ئەمیش دەڵێت: هیوام وایەو خۆزگەی ئەوە دەخوازم ببم بە فەرمانڕەواو خەلیفە..

وتیان: چۆن چۆنی؟! تۆ لەم جیهانەدا تەنها ئەم گوێدرێژەت هەیە، کەچی دەبیت بە فەرمانڕەواو خەلیفە؟!

لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ.. پاشان دەڵێت: ئەگەر بووم بە خەلیفە، چیم لێ داوا دەکەن؟

یەکێکیان دەڵێت: دەمەوێت کۆشکێکم بدەیتێ..

چی تر؟

کۆشکەکە باخچەیەکی گەورەشی لەگەڵ بێت..

چی تر؟

دەمەوێت چوار هاوسەریشم هەبێت..

چی ترت دەوێت؟

یەکەمیان دەڵێت: بەسمە..

پاشان سەیری دووەمیان دەکاتو دەڵێت: ئەی تۆ چیت دەوێت؟

دووەمیان دەڵێت: ئەگەر تۆ بووی بە خەلیفە، بە پێچەوانەوە سواری گوێدرێژم بکەنو بەناو شاردا بمگێڕنو پێم بڵێن: ئەوە دەجاڵو درۆزنە، پاشان وتی: دەمەوێت دەمو چاویشم ڕەش بکەن، ئەوسا بمگێڕن..

دوای ئەم گفتوگۆیە، چوونە جێگەی خۆیان بۆ ئەوەی بخەون..

ئەگەر کەسێك مەبەستو ئامانجێکی هەبێت، پێویستە نەخشە ڕێژی بۆ بکات، هەر بۆیە ئەم پیاوە دەیوت: ئەگەر من بمەوێت ببم بە خەلیفە، پێویستە چ ڕێگەیەك بگرمەبەر؟ هەر لە سەر کارەکەی خۆم بەردەوام بمو ئیش بە گوێدرێژەکەم بکەم؟

نەخێر.. پێویستە نەخشەیەك دابڕێژمو بڕوانم بزانم بە چ ڕێگەیەك دەتوانم ببم بە خەلیفە؟! جا ئەم کارە دە، یان بیست، یان سی ساڵیشی پێبچێت، هیچ گرفت نیە.. گرنگ ئەوەیە سەرەتای ڕێگەکە دەست پێبکەمو هەنگاوی یەکەم بنێم، هەروەك وتراویشە، ڕێگەیەکی هەزار میلی، بە هەنگاوێك دەست پێدەکات..

پێغەمبەری خوداﷺ سەرەتای پێغەمبەرایەتیەکەی تەنها بە وشەی (إقرأ) دەستی پێکردو پاشان هەنگاو هەنگاو دەستی بە بانگەواز کردو ئاینی ئیسلام بەم شێوەیە

گەشەی کردو بلاوبۆوە.. بۆ هەموو کارێکی چاکو باش بە پشتبەستن بە خودا دەست پێبکە، بە دڵنیاییەوە خودای پەروەردگار یارمەتیت دەدات..

بەڵێ ئەم پیاوە بیری کردەوە، یەکەم کارێك کە پێویستە بیکات، دەبێت گوێدرێژەکەی بفرۆشێتو ببێت بە پۆلیس، بۆ ئەوەی لانی کەم لە دارودەستەی فەرمانڕەواو خەلیفەوە نزیك ببێتەوە.. ڕۆژ بۆوەو کابرا گوێدرێژەکەی فرۆشت..

دوو هاوەڵەکەی پێیان وت: ئەوە گوێدرێژەکەت فرۆشت؟! ئینجا خۆ لە برسا دەمریت؟! ئەمیش وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت: نا.. نا.. من مەبەستی لەوە گەورەترم هەیە، پاشان ڕۆیشتو کەلوپەلی سەربازیو پۆلیسی کڕیو دەستی کرد بە کارە تازەکەی.. لەبەر ئەوەی زیرەكو لێهاتوو بوو، هەر بۆیە زوو زوو پلەی بەرز دەبۆوە، هەتاوەکو بە تەواوی لە خەلیفە نزیك بۆوەو چووە ڕیزی دەستەو تاقمەکەیەوە..

پاش ماوەیەك خەلیفە کۆچی دوایی دەکاتو کوڕەکەی لە جێگەی باوکی دادەنێن، کوڕەکەشی تەمەنی دوانزە ساڵ دەبێتو پێویستە سەرپەرشتیارێکی بۆ دابنرێت، هەر بۆیە دایکی کوڕەکەو خێزانی خەلیفەی کۆچکردوو، موحەمەدی کوڕی ئەبی عامرو دوو کەسی تر کە ناویان ئیبن ئەبی غالبو ئیبن تومەیح دەبێت، وەکو سەرپەرشتیاریکاری کوڕەکەی دادەنێتو پێیان دەڵێت: هەر سێکتان دەبێت سەرپەرشتیکاری کوڕەکەم بکەن..

ڕۆژی دواتر، ئیبن ئەبی عامر دەستی کرد بە پیلان گێڕان لە دژی ئیبن ئەبی تومەیح، هەتا وای لە دایکی کوڕەکە کرد، دووریخستەوەو پێی وت: تۆ شایەنی ئەوە نیت کە سەرپەرشتیکاری کوڕەکەم بیت، تەنها خۆیو ئیبن ئەبی غالب مانەوە، ئەم پیاوە هەستا بە داخوازی کردنی کچەکەی ئیبن ئەبی غالب بۆ کوڕەکەییو لێی مارە کرد، کاتێك کچەکەی ئیبن ئەبی غالبی بۆ کوڕەکەی هێنا، بە تەواوی بوو بە هاوەڵی ئیبن ئەبی غالبو قسەی بە سەریدا دەڕۆیشتو زاڵ بوو بە سەریدا، هەتا وای لێهات سەرپەرشتیاری تەواوی کوڕەکەی خەلیفە، بە تەنها ئیبن ئەبی عامر بوو..

کوڕەکە بەبێ پرسی ئیبن ئەبی عامر تەنانەت لە ماڵیش نەدەهاتە دەر.. وەزیرەکانیش بەبێ فەرمانی ئەم هیچ کارێکیان نەدەکرد.. ئەم کارەش لە نێوان شەوو ڕۆژێکدا ڕووینەدا، بەڵکو نزیکەی بیست دانە ساڵی پێچوو، هەتا ئەم پیاوە گەیشت بەم پلەیە..

بەڵێ.. ئەم پیاوە وای لێهات سوپاشی بەڕێدەکردو بە تەواوی بوو بە خەلیفە.. تەنانەت هەندێك لە زانایان ناوی ئەو دەوڵەتەیان نەنا دەوڵەتی ئەندەلوس، بەڵکو بە ناوی ئیبن ئەبی عامرەوە ناویان نا دەوڵەتی عامری..

ئێستا نزیکەی سی ساڵ بەسەر قسەی ئەم پیاوەو هاوەڵەکانی تێپەڕیووە.. ڕۆژێك هاوەڵەکانی بیر دەکەوێتەوە، هەر بۆیە بانگی پیاوێك دەکاتو پێی دەڵێت: بچۆ بۆ فلانە

بازاڕو هەواڵی فلاّنە کەسو فلاّنە کەسم بۆ بپرسەو بیان دۆزەرەوەو بیان هێنە بۆ لام..

کابرا دەچێتو دوای هەواڵ پرسین دەیان دۆزێتەوەو دەیان هێنێت بۆ لای خەلیفەی تازە.. خەلیفە سەیر دەکات لە سەر کارەکەی خۆیان بەردەوامن، هەر یەکەیان گوێدرێژێکیان هەیەو کۆڵکێشی دەکەنو ڕۆژی درهەمێك یان دوو درهەم پەیدا دەکەنو ماوەی سی ساڵە بەم شێوەیە ژیانیان دەگوزەرێنن.. کاتێك لە بەردەم خەلیفەدا دەوەستن، پێیان دەڵێت: ئایا دەمناسنو منتان بیر دەکەوێتەوە؟

ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.. ئەی بیرتان دەکەوێتەوە کاتێك پێم وتن: ئەگەر بووم بە خەلیفە، چی داوا دەکەنو خۆزگەی چی دەخوازن؟

وتیان: بەڵێ..

وتی: دە ئەوە بووم بە خەلیفە، فلاّنە کەس تۆ چیت داوا کرد؟

یەکەمیان وتی: داوای کۆشکێکم کرد باخچەیەکیشی تێدا بێت، هەروەها داوام کرد کە چوار هاوسەرم هەبێت..

خەلیفە وتی: ئەوە کۆشکو باخچەکەو ئەوەش مارەیی چوار ئافرەت، خۆ ئەگەر کاتی خۆی خۆزگەی زیاترت بخواستایە، ئەوا ئێستا پێم دەدایت..

پاشان بەوەی تریانی وت: ئەی تۆ داوای چیت کرد؟

کەسی دووەمیان دەڵێت: ئەی خەلیفە لێم ببورە..

خەلیفە دوبارە دەڵێت: خۆزگەی چیت خواست؟!

ئەویش دەڵێت: خۆزگەی ئەوەم خواستو داوای ئەوەم کرد، کە پاشەو پاش سواری گوێدرێژم بکەنو ڕوخسارم ڕەش بکەنو بە شاردا بمگێڕنو پێم بڵێن: ئەمە دەجاڵو درۆزنترین کەسە..

خەلیفە بڕیاریداو خۆزگەو ئاواتەکەی ئەمیشیان جێبەجێ کرد..

بەڕێزان لێرەدا مەبەست ئەوە نیە ئەم ڕووداوە ڕاستە یان نا، هەر چەندە بۆچوونی بەهێز لە سەر ئەوەیە، کە ئەم ڕووداوە ڕاستەو ڕوویداوەو لە پەڕتووکە مێژووییەکاندا تۆمار کراوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەم پیاوە متمانەی بە خۆی هەبووەو گومانی باشیشی بە خودای خۆی بردووە، هەروەك پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: ((يقول تعالى أنا عند ظنِّ عبدي بِهِ)). رواه البخاري. واتە: (خودای پەروەردگار دەفەرموێت: من لەگەڵ ئەو گومانەم، کە بەندەکەم پێمی دەبات، یان لەگەڵ ئەو گومانەم، کە بەندەکەم بە منی هەیە)..

کەواتە گومانی چی بە خودا بەریت، ئەویش ئەوەت بۆ دەکات.. مرۆڤ کاتێك گومانی لێخۆشبوون بە پەروەردگاری دەبات، إنشاءالله پەروەردگار لێی خۆش دەبێت..

دەی گومانی ئەوە بە پەروەردگارت بەرە، کە قەرزەکانت بۆ ئاسان دەکات.. گومان بەرە لە بواری خوێندندا سەرکەوتووت دەکات، هەرگیز گومانی خراپ بە پەروەردگارت مەبە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾﴾ الفتح. واتە: (بەڕاستی گومانی خراپو ناقۆڵاتان بردبوو، ئێوە هەمیشە هۆزو تاقمێکی بێ کەڵکو بێ خێرن)..

دەی مرۆڤ چۆن گومانی باش بەرێت؟! کەی مرۆڤ دەتوانێت بگات بە چڵەپۆپەو پلە بەرزەکان.. ئەو مرۆڤەی دەیەوێت بگات بە پلە باڵاکان، بێگومان دەبێت بەرنامەو نەخشەی هەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، پاشان دەبێت هاوەڵی کەسانی سەرکەوتوو بکات، کە هانی دەدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیو دوورکەوێتەوە لە هاوەڵی کردنی کەسانی دەست بەتاڵو بێکار، ئەو کەسانەی کە پێت دەڵێن: ناتوانیت ئەو کارە بکەیت.. خۆ فلانە کەس لە تۆ زیرەکترو بە تواناتریش بوو نەیتوانی ئەو کارە بکات.. بە هەموو شێوەیەك لەو کەسانە دوور بکەوەرەوە..

* کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی کرد، عبداللەی کوڕی عەباس (خودا لێیان ڕازی بێت) مێردمناڵ بوو، بە کەسێکی هاوتەمەنی خۆی دەڵێت: تازە ئەو هەلەمان لە دەستچوو، کە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ زانستو زانیاری وەربگرین، وەرە با لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ زانست وەربگرین..

مێردمنداڵەکەش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: تۆ هیوات وایە ببیت بە زانا.. دەی باشە ئەوا زانستو زانیاریشمان وەرگرتو فەرموودەشمان لەبەرکرد، لەناو خەڵکانێکدا دەبیت بە زانا کە ئیمامی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلییان تێدایە (خودایان لێ ڕازی بێت)؟! ئەوانە هەموو پلەو پایەیەی خۆیان هەیە!! ئایا شان لە شانی ئەوان دەدەیت؟! برۆ بۆ خۆت فێری پیشەیەك ببە، بۆ ئەوەی ببیت بە دارتاش یان ئاسنگەر، یان هەر شتێکی تر..

سەیری ورەو هیواو ئاواتی ئەم دوو کەسە بکە!!

عبداللەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) کاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، دەفەرموێت: ئیتر من بەرەو زانستو زانیاری هەنگاوم ناو ئەو کەسەش بەرەو کارو کاسبی خۆی ڕۆییو دەستی کرد بە کاری ئاسنگەری.. ئەگەر سەیر بکەیت ئەو گەنجە هەوڵی فێربوونی پیشەکەیداو دوکەڵو گەرمی ئاسنو ئاگری قبوڵ کرد، تا بوو بە ئاسنگەر..

عبداللەی کوڕی عەباسیش (خودایان لێ ڕازی بێت) هەوڵی زۆریدا تا بوو بەو زانا گەورەیە، ئەوەتا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: سیانزە ساڵ بووم، چووم بۆ لای یەکێك

له هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی پرسیاری بابەتێکی لێبکەم، کاتێك چووم لە دەرگامدا، پێیان وتم: خەوتووە..

دەفەرموێت: منیش سەیری دەرگاکەم کردو لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر بگەڕێمەوەو بڕۆم، لەوانەیە لە ماڵ دەرچێتو دەستم لێی گیر نەبێت، ئەگەر چەند جارێکیش لە دەرگا بدەم، لەوانەیە بێزاری بکەمو لە خەو هەڵیبستێنمو بە خەوالوویی وەڵامم بداتەوە.. ئەی چی بکەم باشە؟!

دەفەرموێت: چاوم بڕیە دەرگاکە، هەتا خەوم لێکەوت، خۆڵو تەپوتۆز دەمو چاویان داپۆشیم..

دەفەرموێت: کاتێك هاوەڵەکەی پێغەمبەری خوداﷺ خەبەری بۆوەو دەرگاکەی کردەوە، منی بینی ئاوا تەپوتۆز لە سەر دەمو چاوم نیشتووە، فەرمووی: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوداﷺ چیت دەوێت؟

منیش وتم: دەمەوێت فەرمودەکانی پێغەمبەری خوداتﷺ لێ ببیستم..

پێی وتم: ئەی بۆ هەڵتنەستاندم؟!

منیش وتم: نا.. ویستم پشوو بدەیتو بە دەروونێکی خۆشەوە وەڵامم بدەیتەوە..

* عبداللەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ڕۆژێك لەگەڵ زەیدی کوڕی سابتڕضي الله عنهدا بووم، زەیدی کوڕی سابتڕضي الله عنه شارەزاترین کەس بوو لە زانستی میراتدا، عبداللەڕضي الله عنه دەفەرموێت: لغاوی وشترەکەیم گرت بوو، زەیدڕضي الله عنه پێی فەرمووم: وازی لێبێنە..

منیش وتم: ئێمە فەرمانمان پێکراوە ئاوا ڕێزی زاناکانمان بگرین..

ئەویش فەرمووی: دەستتم بدەرێ..

عبداللەڕضي الله عنه منداڵێکی بچوك بوو، دەفەرموێت: دەستەکانم دایە دەستی، ئەویش ماچی کردو فەرمووی: ئێمەش فەرمانمان پێکراوە ئاوا ڕێز لە کەسوکاری پێغەمبەرەکەمانﷺ بگرین..

بە هەر حاڵ لە ئەنجامی کۆتاییدا، دەبینین عبداللەڕضي الله عنه چی بە دەست هێناو بوو بە چی؟ چۆن گەیشت بە پلە بەرزو باڵاکان؟! ئەمەش جیاوازی کەسەکان دەردەخات..

بەڕێزان ئەمە پەیامێکە بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێت بگەنە چڵە پۆپەو پلە باڵاکان، جا گەیشتن بە پلە بەرزەکان لە بانگەوازدا، یان لە زانستو زانیاریدا، یان لە لەبەرکردنی قورئانو فەرموودەدا، یان لە بازرگانیدا بێت، یان لە پیشەگەریو داهێنانو نوسینو وتاربێژیدا بێت..

تەنها خۆزگە خواستن بەس نیە، ئایا خۆزگە هیچ سوودێکی هەیە؟ خۆزگە

گەنجێتی بفرۆشرایەو منیش بمکڕیایە!! بەڕاستی خۆزگە خواستن هیچ سوودێکی نیە، ئەوەی سوودی هەیە پشت بەستنە بە پەروەردگارو پاشان هەوڵو تێکۆشان..

سەیر بکەو بزانە عبداللەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) چی بەدەست هێناو گەیشت بە چ پلەو پایەیەك..

* یەکێك لە هاوەڵان بە ناوی ئەبوصالحﷺ کە ئیمامی زەهەبی لە کتێبی (سیرة عن النبلاء) باسی کردووە، دەفەرموێت: عبداللەی کوڕی عەباسم (خودایان لێ ڕازی بێت) لە حەجدا بە شێوەیەك بینی، سوێند بە خودا ئەگەر گاورو جولەکەو بەربەرەکان بیانبینیایە، هەموویان باوەڕیان دەهێناو موسڵمان دەبوون..

پێیان وت: چیت بینی؟!

دەفەرموێت: خەڵکیم بینی هەموو کۆببوونەوە، حاجیەکان لە ئیحرامدا بوون زیکرو یادی خودایان دەکرد، عبداللهﷺ هەستاو وتاری بۆدان.. خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوونو گوێیان گرت، عبداللهﷺ سورەتی (البقرة)ی دەخوێندو شی دەکردەوەو ماناکەی لێکدەدایەوە.. سوێند بە خودا ئایەت ئایەت ڕاڤەی ئایەتەکانی دەکرد، بەبێ ئەوەی تەنها ئایەتێکی بیر بچێت.. سوێند بە خودا نازانم بە چ شتێکی عبداللهﷺ سەرسام بم؟! بە بەهێزی لەبەرکردنی قورئانەکەی، یان زانیاری لێکدانەوەو ڕاڤەکردنەکانی؟!

* هاوەڵێکی تر دەفەرموێت: ڕۆژێك بە دوای عبداللەی کوڕی عەباسدا (خودایان لێ ڕازی بێت) دەگەڕام‌و دەمویست بیبینم، کاتێك ویستم بچم بۆ ماڵیان، سەیرمکەم هەموو ڕێگەکان گیراون، خەڵکێکی زۆر وەستا بوونو دەیانویست عبداللهﷺ ببینن..

ئەم هاوەڵە دەفەرموێت: بە هەر شێوەیەك بوو، خۆم لە خەڵکەکە ڕزگارکردو لە دەرگای ماڵیانمدا، ئەو ماڵەی بە ڕوناکی زانستو سەرکەوتنو پاکی دەدرەوشایەوە..

دەفەرموێت: کاتێك لە دەرگامداو چوومە ژوورەوە، وتم: ئەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) ئەمانە کێن؟!

فەرمووی: ئەمانە فێرخوازو قوتابی زانستو زانیارینو لە میسرو عێراقو شامەوە هاتوونو پرسیاریان هەیە..

منیش وتم: پاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگار، دەی بچۆرە دەرەوە بۆ لایان تیشکی خۆر سوتاندنی..

ئەویش فەرمووی: بەڵێ، باش..

عبداللەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) دەست نوێژی شۆریو لە حەوشەی ماڵەکەیدا دانیشت، پاشان فەرمانی بە کەسێك کردو کەسەکەش چووە دەرەوەو هاواری کرد: هەر کەسێك دەربارەی قورئانو لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان،

پرسیاری هەیە با بێتە ژوورەوە..

کۆمەڵێك لەو خەڵکەی بەر دەرگا هاتنە ژوورەوەو دەستیان بە پرسیارکردن دەکرد، یەکێك پرسیاری فلانە ئایەتی سورەتی (البقرة)ی دەکرد، یەکێکی تر لە سورەتی (ال‌عمران)، یەکێکی تر پرسیاری هۆی دابەزینی ئایەتێکی تری دەکردو بەم شێوەیەو ئەمان چوونە دەرەوەو دوبارە هاوار کرایەوە، کێ پرسیاری شەریعەتو ئەحکامی هەیە با بێتە ژوورەوەو کۆمەڵێکی تر هاتنە ژوورەوە..

ئەو هاوەڵە دەفەرموێت: سوێند بە خودا پرسیارێکی لێنەکرا بڵێ: نازانم.. لە لێکدانەوەی قورئان، لە فەرموودە، لە مێژوو، لە هۆنراوە.. هتد.. ئەگەر قورەیش هەتاهەتایە شانازییان بەو کۆڕو کۆبوونەوەیەی عبداللەی کوڕی عەباسەوە بکردایە، شایەنی بوو..

بەڵێ.. هاوەڵەکەی عبداللهﷺ بوو بە ئاسنگەرێکی گەورە، کاتێك بە لای عبداللهﷺ دا دەڕۆی، دەیبینی یەکێك سەری ماچ دەکا، یەکێك پرسیاری لێدەکات، دەیوت: سوێند بە خودا عبدالله تۆ لە من شارەزاتر بوویت..

ئازیزان ئەمەیە ورە بەرزی، جاری وا هەیە کەسێك لەگەڵ کەسێکی تردا دەست دەکات بە خوێندن، پاش ماوەیەك دەبێت بە زانا، یان کەسێکی تر دەبێت بە پێشنوێژی مزگەوتو قورئانی پیرۆز لەبەر دەکات.. ئافرەتێك دەبێت بە بانگخوازو فەرمان بە خەڵکی دەکات چاکە بکەنو ڕێگرییان لێدەکات لە خراپەو تاوان.. ئەمانە هەموویان مرۆڤی ئاساییین، تەنها ورەو هیممەت بەرزییان لە یەکیان جیا دەکاتەوە..

خودایە هیممەت بەرزیمان پێببەخشەو لە کاری چاکەدا سەرکەوتوومان بکە.. آمین..

# وره بەرزی..

خەڵکی لە ڕووی وره بەرزیو ڕوانینیان بۆ ژیان جیاوازن، هەندێك لە خەڵكی بە هەندێ پلە نەبێت ڕازی نابن، هەندێکی تر بە پێچەوانەوە، هەندێك سەیری لوتکەی شاخەکان دەکەنو ڕازی نابن پلەیان لەوە نزمتر بێت..

* کاتێك یەزیدی کوڕی موهەلەب، هەوڵی دەدا ببێت بە ئەمیر، جێگەو خانوویەکی دیاریکراوی نەبوو، لەم ماڵەوە دەچوو بۆ ئەو ماڵ، پێیان وت: کەی خانوویەك بۆ خۆت دروست دەکەیت؟!

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ماڵی من یان شوێنی ئەمیرێکەمە (دار الأمارة)، یان زیندانە، یان گۆڕە.. وتراویشە:

ونحن قوم لاتوسُّط عندنا لنا الصدر دون العالمين أو القبرُ..

واتە: ئێمە گەلێکین مامناوەندیمان نیە.. یان پێشەنگو پێشەوای جیهان دەبین، یان ژیانمان ناو گۆڕە..

با لە هەندێك ڕووداو ڕامێنین، کە لە بنەماوە جیاوازی ورەو هیممەت بەرزی کەسەکانمان بۆ دەردەخات، بابزانین چۆن مرۆڤ دەتوانێت لە ژیاندا ببێت بە شتێك باسو خواسی هەبێت؟

* دەگێڕنەوە بازرگانێکی گەورە، دەیەوێت کوڕەکەی لە سەر بازرگانی ڕابهێنێت، نایەوێت تەنها بخواتو بخواتەوەو بخەوێت، بەڵکو دەیەوێت وەکو خەڵکی کار بکاتو بێتو بچێتو فێر بێت، هەر بۆیە بە کوڕەکەی دەڵێت: کوڕە شیرینەکەم ئەم هەزار درهەمە بگرەو برۆ بۆ فلانە شار، کەلوپەل بکڕەو وەرەوە بۆ ئەوەی بەقازانج بیفرۆشیت..

باوکەکە دەیویست کوڕەکەی فێری کڕینو فرۆشتن بێت، لەگەڵ ناڕەحەتیەکانی ڕێگەدا ڕابێتو ببێت بە بازرگانێکی سەرکەوتوو..

بەڵێ.. کوڕەکەی هەزار درهەمەکەی وەرگرتو ڕۆی.. کاتێك کەوتە ڕێو ماوەیەکی لە ڕێگەکە بڕی، بۆ ئەوەی پشوویەك بدات، چووە ژێر سێبەری دارێکەوەو دانیشت، لەم کاتەدا ڕێوییەکی لاوازی بینی کە لە برسانا خەریك بوو بەملاولادا دەکەوت.. ڕێوییەکە هات لە سێبەری دارێکی تەنیشتی کوڕەکەوە لێی پاڵ کەوت..

پاش کەمێك کوڕەکە ئاسکێکی بینی بە خێرایی ڕایدەکردو شێرێکیش بە شوێنیدا.. ئاسکەکە ڕایدەکردو شێرەکەش هەنگاو بە هەنگاو بەدوایەوە.. ئاسکەکە هەر ڕایدەکرد، بەڵام شێرەکە بەردەوام بوو لە شوێنکەوتنیو سوور بوو لە سەر ڕاوکردنی..

بەڵێ.. شێرەکە ئاسکەکەی گرتو کەمێکی لێخواردو ڕۆی، پاشان ڕێوییە لاوازو

تەمەڵەکە هاتە سەر حازری، بەبێ ئەوەی ماندوو بێتو بەبێ ئەوەی ڕابکاتو بێتو بچێت، بەبێ ئەوەی تەپوتۆزێکی بەرکەوێت، تێری لە ئاسکەکە خواردو چووەوە ژێر سێبەری دارەکە بۆ ئەوەی پشوو بدات..

کوڕەکە کاتێك ئەم دیمەنەی بینی، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەو شێرە ئەوەندە خۆی ماندوو کردو بە ڕاستو چەپدا ڕایکرد، کەچی ڕێوییەکە هاتە سەر خواردنێکی حازرو تێرو پڕی لێخوارد، ئیتر من بۆچی خۆم هیلاك بکەم؟! کێ لە برسا مردووە؟! هەر بۆیە بڕیاری گەڕانەوەی بۆ شارەکەی خۆیداو کەوتە ڕێ..

کاتێك گەڕایەوەو چووە لای باوکی، باوکی پێی وت: کوڕم تۆ بەیانی ڕۆیشتیو ئێوارە هاتیتەوە؟! دەبێت هەفتەیەك دووان بمێنیتەوە!! ئەی کوا کەلوپەلەکان؟!

کوڕەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: باوکە گیان بۆچی خۆم ماندووو هیلاك بکەم، خۆ لە برسانا نامرم، پاشان بە وردی ڕووداوی شێرو ڕێویو ئاسکەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە..

باوکی کاتێك گوێی لەم قسانەی کوڕەکەی بوو، وتی: کوڕی خۆم من دەزانم تۆ لە برسانا نامریت، بەڵام من دەمەوێت وەکو شێر بژیت، نەك وەکو ڕێوی!! من دەمەوێت تۆ بەڕێزو پێشەواو پێشڕەو بیت، نەك پاشکۆ.. دەمەوێت خەڵکی گوێت لێبگرنو ڕاوێژت پێبکەن، دەمەوێت بەڕێوەبەر بیت، نەك بەڕێوەبراو..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((الید العلیا خیر من الید السفلی)). رواه البخاري. واتە: (ئەو دەستەی کە لە سەرەوەیەو دەبەخشێت، باشترو چاکترە لەو دەستەی کە لە خوارەوەیەو وەردەگرێت).. کوڕە شیرینەکەم من دەمەوێت تۆ پزیشك بیت نەك نەخۆش.. ئەندازیار بیتو باڵەخانەو خانوو دروست بکەیت نەك دانیشتوو.. دەمەوێت کاریگەریت لە سەر کۆمەڵگە هەبێت..

بەڵێ.. ئەمەیە جیاوازی کەسەکان.. جیاوازی لە نێوان ئەوانەی کە هیمەتیان بەرزەو ئەوانەی نەك هەر هیمەت بەرز نین، بەڵکو زۆرجار ڕوخێنەریشن..

* ڕووداوێکی خۆش کە بە سەر خۆمدا هاتووە، کاتێك یەکەم هەفتە بوو چووبوومە زانکۆ، پێش نزیکەی بیستو دوو ساڵ.. لە قۆناغی یەکەمی کۆلێژ بووم، ئێوەش دەزانن کاتێك قوتابی لە دواناوەندییەوە دەچێتە زانکۆ، گۆڕانکاری لە ژیانیدا دروست دەبێتو قۆناغەکان جیاوازن..

کاتێك دەچیتە زانکۆ هەست دەکەیت گەورە بوویت، زۆرجار باوك ئۆتۆمبیل دەدات بە کوڕەکەی، یان هەر نەبێت سویچی ئۆتۆمبیلەکەی دەداتێ بۆ ئەوەی پێی بڕوات بۆ زانکۆو بگەڕێتەوە، هەر بۆیە ئەو قوتابیە هەست دەکات گەورە بووەو چووەتە کۆتا قۆناغی خوێندن، کە زانکۆیەو دوای ئەوە دادەمەزرێتو بیر لە هاوسەرگیریو ژیانی داهاتووی دەکاتەوە..

لە هەفتەی یەکەمدا، کتێبیان بە سەردا دابەش کردین، یەکێك لەو کتێبانەش

(فتح القدير في التفسير)ی شێخ شەوكانی بوو، ئەم كتێبە شەش بەرگ بوو.. ئێمە لە دواناوەندی لەگەڵ ئەم كتێبانەدا ڕانەهاتبووین، چونكە كتێبەكانی دواناوەندیمان جاری وا هەبوو، لە هەشتا پەڕە تێناپەڕی، بەڵام ئێستا لە یەك وانەدا كتێبی شەش بەرگیمان دەدەنێ، هەر بۆیە كتێبەكانمان وەرگرتو كردمانەوە، ویستم ناوی خۆمیان لە سەر بنووسم، نوسیم د. محەمەد عەریفی..

یەكێك لە هاوەڵانم لە تەنیشتمەوە بوو، دواناوەندیشمان هەر بەیەكەوە تەواو كرد، سەیری كردم.. من لە قۆناغی یەكەمی زانكۆدا بووم، بەڵكو لە وەرزی یەكەمیش بووم، نەك هەر ئەوەندە لە هەفتەی یەكەمیشدا بووم، وا گومانەبەم لەو كاتەدا تەمەنم حەڤدە ساڵو چەند مانگێك بوو.. كاتێك هاوەڵەكەم ئەم نوسینەی بینی، كە نوسی بووم د. محەمەد عەریفی، پێی وتم: (د) مانای دكتۆرە؟! واتە: دەبیت بە دكتۆر؟!

وتم: بە ویستی خودا.. من كە هاتوومەتە ئەم بەشە، بەتەمام بەردەوام بم تا دكتۆرا تەواودەكەم..

هاوەڵەكەم پێكەنیو وتی: لە تۆوە دوورە، پیتی (د) هەمیشە بە مانای دكتۆر نایات، دەگونجێت بە مانای (دجاجة ـ مریشكیش) بێت، یان بە مانای فلانە شتو فلانە شتیش دێت، چەند وشەیەكی ناخۆشی تریشی وت..

سەیری جیاوازی ورەو هیواكان بكە.. منیش پێكەنیمو وتم: با تەمومژەكان بڕەوێتەوە، ئەوسا دەزانیت؟! هەر لەو ساتەوە خودای پەروەردگار یارمەتیدامو سوپاس بۆ خودا ئەوەتا ئێستا بڕوانامەی دكتۆرام بەدەست هێناوە.. ورەو هیوا پێویستی بە ئامانجو نەخشەیە، هەر لە سەرەتاوە نابێت بە هەموو شتێك ڕازی بیت، مەڵێ: برا تەواو خۆ دەژین.. پێغەمبەری خوداشﷺ لە هەموو كارێكدا بە دوای باشترینیدا دەگەڕا، ڕازی نەبوو بەوەی هەر ئیشەكەی بڕواتو بەس..

* پێغەمبەری خوداﷺ مامۆستاو سەركەوتووی سەركەوتووان، كاتێك وتاری هەینی دەدا، پاڵی بە كۆتەرە دار خورمایەكەوە دەدا، ئافرەتێكی خەڵكی مەدینە هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من كوڕێكم هەیە دارتاشە، فەرمانی پێبكەم مینبەرێكت بۆ دروست بكاتو لەباتی ئەو كۆتەرە دارە بچیتە سەریو وتاری لە سەر بدەیت؟

ئافرەتەكە دەیزانی پێغەمبەری خوداﷺ گوێ لە ڕاو بۆچوون دەگرێتو داهێنانی پێخۆشە..

بزانین پێغەمبەری خوداﷺ چی وەڵام دایەوە؟

با بزانین فەرمووی: بە پارەی ئەو مینبەرە چەند هەژارێك تێر بكە؟ یان فەرمووی: مەبەست گەیاندنی دەنگی منە بەو خەڵكە، جیاوازی چیە لە سەر مینبەر بم، یان بە پێوە؟

نەخێر بەڵکو فەرمووی: بەڵێ.. فەرمان بە کوڕەکەت بکە با مینبەرێك دروست بکات..

لە ماوەی هەفتەیەکدا گەنجەکە مینبەرێکی دروست کرد کە سێ پلەی هەبوو، پێغەمبەری خوداﷺ بەسەریدا سەردەکەوتو وتاری لە سەر دەدا.. بەم شێوەیە گۆڕانکاریو پێشکەوتنێك ڕوویدا.. پێشتر پێغەمبەری خوداﷺ بە پێوە ڕادەوەستا، ئێستا لە سەر بەرزایی مینبەر دەوەستا.. پێشتر کەمتر خەڵکی لێوە دیار بوو، خەڵکەکەش کەمتر پێغەمبەری خودایانﷺ دەبینی، جاران هەر سێ چوار ڕیز، پێغەمبەری خودایانﷺ دەبینی، بەڵام دواتر بەهۆی مینبەرەکەوە، خەڵکێکی زیاتر پێغەمبەری خودایانﷺ دەبینی..

* پێش ڕوودانی جەنگی خەندەق، سەلمانی فارسیرضي الله عنه هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە لە وڵاتی فارس، کاتێك دوژمن هێرشی دەکردە سەرمان، چاڵو خەندەقێکی گەورەمان لە نێوان خۆمانو ئەواندا هەڵدەکەند، ئێستاش وا ژمارەیەکی زۆر لە دوژمنان بەرەو ڕوومان دێن، بۆچی هەمان کار ئەنجام نەدەین؟

پێغەمبەری خوداﷺ نەیفەرموو: نەخێر.. پشت بە خودا دەبەستینو خەندەقمان بۆچیە؟ نەیفەرموو: ئێمە فریشتە لە دژی دوژمنەکانمان لەگەڵمان دەجەنگن.. ڕاستە فریشتەیان لەگەڵەو پشتیوانیان خودایە، بەڵام ئەمانە ڕێگر نین بۆ ئەوەی هۆکارەکان بگرینە بەر، هەروەها ئەمانە نابنە ڕێگر لەوەی شێوازی پێشکەوتوو لە هەموو بوارێکدا بەکاربهێنین، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زۆر باشە، پاشان فەرمانی کرد خەندەقەکە هەڵکەنن، بۆ هەر دە کەسێك، پێوانەی دە باڵی دیاری کرد، نزیکەی سێ تا چوار مەترو ئاگاداری کردن ئەگەر شوێنێکی ڕەق یان بەردیان هاتە ڕێ لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقدا، چی بکەن..

کەواتە خۆشەویستان، ئایینەکەمان کە پەروەردگار پێی بەخشیوینو داواکارین دامەزراومان بکات لە سەری، ئاینێکی بەرزو جوانو سەنگینە، مرۆڤ دەتوانێت لە پەنای ئەم ئایینەوەو لە ڕێگەی هیواو ئاواتی بەرزەوە بگات بە هەر شتێك کە بیەوێت، بەڵام ئەو کەسانەی کە بە نزمیو تەمەڵی ڕازین، بێگومان هیچ شوێنەوارێك لە سەر ژیانیان دروست ناکەنو کاریگەرییەکیان نابێت..

* ئەبوهورەیرەرضي الله عنه کاتێك کەوتەساڵەوەو تەمەنی زۆر بوو، زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودایﷺ بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، هەندێك لە خەڵکیش دەیان وت: ئەبوهورەیرەرضي الله عنه فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە، وەك ئەوەی بڵێن: خۆی هەندێکیانی داناوەو دروستی کردوون.. (پەنا بە خودا)..!!

کاتێك ئەبوهورەیرەرضي الله عنه ئەم قسانە دەبیستێتەوە، دەڵێت: پێم دەڵێن:

ئەبوهورەیرە ﷺ فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە، وەك ئەوەی خۆم زۆرم کردبێتن!!
کاتێك هەندێك لە هاوەڵان خەریکی کاری کشتوکاڵیو هەندێکیان لە بازاڕدا خەریکی بازرگانیو کڕینو فرۆشتن بوون، منێکی هەژارو برسی، زۆربەی کاتەکانم لە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ بەسەردەبردو فەرموودەم لێوەردەگرت..
ڕۆژێك بە پێغەمبەری خودامﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووده لەبەر دەکەم، پاشان بیرم دەچێتەوە..
پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەبوهورەیرە جلوبەرگەکەی سەرشانت دابنێو ڕایبخە.. منیش جلەکانم داکەندو لە سەر زەوییەکە ڕام خست، سوێند بە خودا ئەوەندە هەژارو نەدار بووم، ئەسپێم دەبینی  بە سەر جلوبەرگەکەمدا هاتوچۆی دەکرد..
پێغەمبەری خوداﷺ بۆم پاڕایەوەو پاشان فەرمووی: جلوبەرگەکانت کۆبکەرەوە، جلوبەرگەکانم کۆکردەوەو نوساندمن بە سنگمەوە، سوێند بە خودا، لە دوای ئەوەوە هیچ شتێکم لە پێغەمبەری خوداﷺ نەبیستووە، بیرم چوو بێتەوە..
سەیرکەن چۆن ئەو هەلەی قۆستەوە.. جاری وا هەیە هەلێکت لەپڕ بۆ دێتە پێش، پێویستە سوودی لێببینیت، چونکە هەل نابەخشرێت، بەڵکو دەپچڕێنرێتو وەردەگیرێت، هەروەك وتراویشە:

ومانيل المطالب بالتمني ولكن تُؤخذ الدنيا غِلاباً..

هەر  ئەو ورە بەرزییە بوو، کە ئەمڕۆ گەورەو بچوك ئەبوهورەیرە ﷺ دەناسن، ئەگەر ئێستا پرسیار لە هەندێك قوتابی قۆناغی سەرەتایی بکەیتو پێیان بڵێیت: ئەبوهورەیرە دەناسن؟
لە وەڵامدا لەوانەیە بڵێن: بەڵێ.. دەیناسین.. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەبوهورەیرە ﷺ لە ساڵی حەوتەمی کۆچیداو لە ڕزگارکردنی قەڵاکانی خەیبەردا موسڵمان بوو، بەڵام بەهۆی ورەی بەرزەوە، ئەو کاریگەرییەی لە سەر ئیسلامو موسڵمانان دروست کردووە..
بە هەمان شێوە هاوەڵانی هیممەت بەرز زۆرن، وەکو خالیدی کوڕی وەلید ﷺ، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عوسمانو ئیمامی عەلیو چەندانی تر (خودایان لێ ڕازی بێت)..
هەموو ئەو هاوەڵانەی ناویان ماوەتەوەو بە ناوهێنانی ئیسلامو موسڵمانان ناویان دەهێنرێت، بێگومان کاریگەرییان لە سەر ئەم ئایینە هەبووە، لەبەر ئەوەی بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ بوونو لە جەنگەکاندا زۆر ئارامگر بوونو هەرگیز بە نزمی ڕازی نەبوونو هەمیشە بۆ لوتکەی چیاکان ڕوانیوویانە، پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە ورە بەرزی هاوەڵانی دڵخۆشو شادومان بووە..
* ڕەبیعەی کوڕی کەعب ﷺ مێردمنداڵێکی تازە پێگەیشتوو بوو، لە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، کاروباری دەست نوێژی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ ڕێکدەخست..




پێغەمبەری خوداﷺ سەرسام بوو پێی، لە کاتێکدا تەمەنی سیانزە ساڵێک دەبوو.. ئەم مێردمنداڵە ئاوی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ نزیک دەکردەوە، بۆ ئەوەی دەست نوێژی پێبگرێت، جاری وا هەبوو لەبەر دەرگای ژوورەکەی پێغەمبەری خوداﷺ شەوی دەکردەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر پێغەمبەری خوداﷺ پێویستی بە دەست نوێژ بووایە، ئاوی بۆ ئامادە دەکرد..

ڕۆژێک کاتێک پێغەمبەری خوداﷺ دەست نوێژی دەگرت، فەرمووی: ئەی ڕەبیعە، داوای شتێکم لێبکە..

ڕەبیعەرضي الله عنه چونکە تەمەنی کەم بوو، پێغەمبەری خوداﷺ لەوانەیە وای زانیبێت داوای پارچەیەک جلوبەرگ، یان شتێکی لەو شێوەیە دەکات..

ڕەبیعەرضي الله عنه وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوات لێبکەم؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەڵێ..

ڕەبیعەرضي الله عنه وتی: دەی چاوەڕێ بکە، تا بیری لێدەکەمەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ سەیری ڕەبیعەی دەکردو ئەویش بیری دەکردەوە، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوای ئەوەت لێدەکەم لە بەهەشتدا هاوەڵت بم..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: داوای شتێکی جگە لەمە ناکەیت؟

ڕەبیعە دەڵێت: بە شەرمەوە وتم: هەر داوای ئەوە دەکەم..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی سەرسام بوو، هەر بۆیە پێی فەرموو: دەی بە زۆر سوجدە بردن یارمەتیم بدە، واتە: دەی زۆر نوێژ بکەو زۆر لە سوجدەدا بمێنەرەوە، بۆ ئەوەی لە بەهەشتدا هاوەڵم بیت..

داوا لە پەروەردگاری بەتوانا دەکەین، لە ورەبەرزانو هیممەت بەرزانمان بگێرێتو یارمەتیمان بدات بۆ ئەنجامدانی کارە چاکەکان.. آمین..

# ورەیەك بەرزتر لە هەورەكان..

هیممەت بەرزی بۆ بانگەواز كردنی ئاینی پەروەردگار، هەموو كۆسپو لەمپەرەكان تێك دەشكێنێتو ڕادەماڵێت.. ئەم هیممەت بەرزیە، پشت بە زۆری سەروەتو سامانو هێزی جەستەو زیرەكی لە ڕادەبەدەرو هۆزو گەلو نەتەوە نابەستێت، بەڵكو پشت بە دڵێك دەبەستێت، كە بەڕاستی ئاینی ئیسلامی ناسیووەو خەمەكانی خستۆتە سەر شان..

* ماوەیەك لەمەو پێش لە سەردانێكمدا بۆ وڵاتی سوید، بەتایبەت بۆ شاری مالمۆی باشوری سوید، لە مزگەوتێكی ئەو شارەدا مێرد منداڵێكم بینی، تەمەنی پانزە ساڵێك دەبوو، بە ڕەچەڵەك سۆماڵی بوو، بەڵام ڕەگەزنامەی سویدی هەبوو، بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر ئەم مێرد منداڵە كەم ئەندام بوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین كەس لە سەر دەستی موسڵمان ببوون!! بە چاوی خۆم من ئەو مێرد منداڵەم بینی!! بەڵام چۆن لە سەر دەستی ئەم كەسە كەم ئەندامە چەندین كەس موسڵمان ببوون؟! ئەمەش هەواڵی سەیرو سەمەرەی تایبەتی خۆی هەیە؟!

كۆمەڵێك برا بانگیان كردم بۆ یەكێك لە ناوەندە ئیسلامیەكان بۆ چاوپێكەوتنی كۆمەڵە گەنجێكی موسڵمانی سویدیو بۆئەوەی چەند ئامۆژگاریەكیش پێشكەش بكەم.. دوای نیوەڕۆ چوومە ناوەندەكەو بینیم لە شێوەی بازنەیەكدا دانیشتبوونو چاوەڕێمن..

سەرنجم چووە سەر مێرد منداڵێك كە تەمەنی لە پانزە ساڵ كەمتر دەبوو.. ناوی محەمەد بوو.. لە سەر كورسیەكی جوڵاو دانیشتبوو.. دەستەكانی بە تەنیشتەكانی كورسیەكەوە بەسترابونەوە، لەبەرئەوەی بەردەوام دەستەكانی دەجوڵاو نەیدەتوانی بە سەریاندا زاڵ بێت.. سەرەڕای ئەمەش لاڵیش بوو، نەیدەتوانی قسە بكات.. سەریشی بە بەردەوامی دەجوڵاند..

كاتێك بەم شێوەیە بینیم بەزەییم پیایدا هاتەوەو سۆزم بۆی جوڵا.. لێی نزیك بوومەوە.. زەردەخەنە كەوتە سەر لێوی‌و سەیری دەكردمو ئەگەر بیتوانیایە لەبەرم هەڵدەستا.. سڵاوم لێكرد.. لە ئینگلیزیو سویدی بە باشی تێدەگەیشت، بەڵام عەرەبی تێنەدەگەیشت.. سەرەتا هەندێك باسی نەخۆشیو پلەوپایەو پاداشتی نەخۆشیم بۆ كرد.. سەری دەجوڵاندو بە ئاماژە بەڵێی بۆ دەكردم..

تێبینم كرد لە بەرامبەریەوە لەوحەیەكی بچوك هەیەو هەندێك لاپەڕەی پێدا هەڵواسراوە، كە چوارگۆشەی بچوك بچوكی تێدایە.. لە هەر چوارگۆشەیەكیشدا ڕستەیەكی مانابەخشو بەسود نوسراوە، وەك: من برسیمە.. ناتوانم.. پەیوەندی بە هاوڕێكەمەوە بكە.. هتد..

سەرم لەم لاپەڕانە سوڕما!! یەکێك لە ئامادەبووان هەواڵی پێدام، کە ئەم کوڕە ئەگەر بیویستایە قسەیەك بکات، حەڵقەیەکی خڕیان دەکردە سەری کە شتێکی وەك گۆچانی پێوەبوو، کام داواکاریەی بیویستایە بە سەری ئەو نوسینەیانی دەجولاند، بۆئەوەی تێی بگەن کە چی دەوێت، ئەمەش تاکە ڕێگە بوو بۆئەوەی تێ ی بگەن.. چونکە قسەی نەدەکرد.. نەشیدەتوانی دەستەکانی بجوڵێنێت..

دەربارەی نیعمەتەکانی خودا لەگەڵی دوام.. مرۆڤ کاتێك ئاینی ئیسلامی هەبێت، ئەگەر هەموو دنیاشی لە دەست بچێت زەرەری نەکردووە.. باسی ئەو پلەوپایانەم بۆ کرد کە خودا بەهۆی ئیسلامەوە پێی بەخشیوین، پاشان بۆم دەرکەوت کە محەمەد بانگخوازێکی زۆر گەورەیە.. چۆن؟! تێتدەگەیەنم؟!

وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی سویدی دوو کارمەندی پیاوی لە بەیانیانداو دوو کارمەندیشی لە ئێواراندا دانابوو، بۆئەوەی خزمەتی محەمەد بکەن، کاتێك یەکێك لەو کارمەندە نا موسڵمانانە دەهاتن، لە ڕێگەی ئاماژەوە بەهۆی کاغەزە هەڵواسراوەکانەوە تێی دەگەیاند کە پەیوەندی بە فڵانە هاوڕێمەوە بکە.. کارمەندەکەش پەیوەندی بە هاوڕێکەیەوە دەکرد.. محمدیش بەهۆی کاغەزەکانەوە داوای دەکرد کە پرسیار لە هاوڕێکەی بکاتو لێی بپرسێت: ئیسلام چیە؟ هاوڕێکەشی وەڵامی دەدایەوە.. کارمەندەکەش وشەکانی لەبەردەکردو پاشان بۆ محەمەدی باس دەکرد..

پاشان محەمەد داوای لێدەکرد، کە پرسیاری لێبکاتو پێی بڵێت: جیاوازی لە نێوان ئیسلامو مەسیحیەتدا چیە؟ بە هەمان شێوە وەڵامی دەدایەوە.. پاشان دەیوت پرسیاری لێبکەو پێی بڵێ: لە ڕۆژی دواییدا موسڵمانو ناموسڵمان حاڵیان چۆن دەبێت؟ هاوڕێکەی وەڵامی دەدایەوەو کارمەندەکەش بۆی باس دەکرد.. هەتا کارمەندەکە لە هەموو قسەکان تێدەگەیشت..

پاشان محەمەد ئاماژەی بۆ دەکرد کە کتێبخانەکە بکاتەوەو کارمەندەکەش کتێبی بانگخوازی بۆ لای ئیسلامی دەبینیو دەریدەهێناو دەیخوێندەوە.. بەم هۆیەشەوە کاری کردۆتە سەر چەندان کەس..

بە ڕاستی محەمەد لە سەر هەڵوێستێکی جوانە.. خاوەن هیممەتێکی بەرزە.. نەخۆشییەکەی نەیتوانیوە وازی لە بانگەواز پێ بهێنێ.. بەڵکو نەیتوانیوە خۆشیو کامەرانیشی لێ بتۆرێنێ..

ڕازی بە بەو بەشەی کە خودای گەورە پێی بەخشیوی دەبیت بە ئیماندار.. بشزانە هەموو مرۆڤێك بەرپرسیارە لەو توانایەی کە خودای پەروەردگار پێی بەخشیوە.. بیستن.. بینین.. زمان.. ژیری.. زۆرجار خەڵکی ئامۆژگاری لە نەخۆشێکەوە زیاتر وەردەگرن، وەك لە کەسێکی لەش ساغ..

ئەی بۆ بانگەواز ناکەی بۆ ئاینی خودا؟! پشت بە خودا ببەستەو دەستەوەستانو

بێتوانا مەبە..

لەوانەشە لێم بپرسیو پێم بڵێی: بانگەوازی کێ بکەم؟!

پێت دەڵێم: بانگەوازی پزیشکەکان.. کارمەندەکانی نەخۆشخانە.. بانگەوازی نەخۆشەکان بکە.. ئەو میوانانەی کە سەردانی نەخۆشەکان دەکەن.. ببە بە کەسێکی پیرۆز.. ئامۆژگاری خەڵکی بکە بەوەی کە گرنگی بە نوێژەکانیان بدەن.. بە پاراستنی چاوو داوێنیان.. بەوەی کە سود لە کاتەکانیان وەرگرنو خۆیان بە کاری بێسودەوە خەریك نەکەنو هەروەها چەندان ئامۆژگاری تر..

بەڵێ.. بەڕاستی ئەم ورەو هیممەت بەرزییە، هەورەکانیش ڕادەماڵێت..

بەڕێزان ئەم کەسە کەم ئەندام بوو، بەڵام نەیوت: ناتوانم بجوڵێم.. ناتوانم قسە بکەم.. تەنانەت نەیدەتوانی قسە بکات، نەشی دەتوانی بە دەستەکانی بنوسێتو بانگەواز بۆ ئاینی خودا بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی هیممەتی بەرز بوو، لە ڕۆژی دواییدا لە هاوشانی هەندێك لە پێغەمبەراندا دەیهێنن، چونکە هەندێك لە پێغەمبەران تەنها چەند کەسێکی کەم لە سەر دەستیان موسڵمان بوون، ئەمیش کۆمەڵە کەسێك لە سەر دەستی موسڵمان بوونو شوێنکەوتەو میراتگری پێغەمبەرانە، هەر بۆیە پەروەردگار کەسانێك دەکات بە کلیل، بۆ کرانەوەی دەرگا خێرەکانو داخستنی دەرگا شەڕەکان..

ئیمامی مالیكﷺ دەفەرموێت: چیرۆکو ڕووداو، سەربازێکن لە سەربازانی خودای پەروەردگار.. واتە: لەوانەیە کەسانێك بەهۆی گوێ بیستی چیرۆکێکەوە، پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە..

* لە شاری ڕیاز نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە کەم ئەندامانی لێیە، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە ڕادەی کەم ئەندامییەکەیان زۆرە، وەك شکانی بڕبڕەی پشتو مل، ئەوانەی تەنها توانای جوڵانی سەریان هەیەو بەس.. جاری وا هەیە سەردانیان دەکەینو باسی ئارام گرتنیان بۆ دەکەین..

سەردان کردنی نەخۆش خۆی لە خۆیدا خێرە، ئەی سەردانی ئەو کەسانە دەبێت چەندە خێر بێت کە ماوەیەکی زۆر، بەڵکو جاری وا هەیە چەندین ساڵ لە نەخۆشخانە دەمێننەوە؟!

بەڵێ.. چووم بۆ ئەو نەخۆشخانەیە، کە نەخۆشخانەیەکی زۆر کۆن بوو.. کاتێك دەچوویتە نەخۆشخانەکەوە، وەك ئەوە وابوو، بچیتە جەنگەڵستانێکەوە، لەبەر ئەوەی ژمارەی نەخۆشەکانی کەم بوون، کەمیش گرنگی بە نەخۆشخانەکە دەدرا..

لەگەڵ برایەکدا چووینە ژوورەوە، سەردان کردنیش بیستو چوار کاتژمێر ڕێگەدراو بوو.. چووینە یەکێك لە ژوورەکان، گەنجێکی تێدا بوو، تەمەنی حەفدە ساڵ دەبوو، بەهۆی ئەوەی وشترێك ڕێگەکەی گرتبوو، تووشی ڕووداوی هاتوچۆ ببوو، تەنها سەری کاری دەکرد.. چووینە ژوورەوە بۆ لای، لە ژوورەکەیدا هەندێك شتی سەیر هەڵواسرا

بوو، نمونەی هیممەت بەرزی ئەو گەنجەی نیشان دەدا..

هیممەت بەرزییەك، كە زۆرێك لە ساغەكانیش نیانە!! ئەم گەنجە نەیدەتوانی لاپەڕەكانی قورئان هەڵداتەوە، نەشیدەتوانی كاتێك كاسێتێك تەواو دەبێت، بیكاتە دیوەكەی تر، یان بیگۆڕێت، هەر بۆیە داوای لە كەس‌وكاری كرد بوو كە وێنەی لاپەڕەكانی قورئانی بە گەورەیی بۆ كۆپی بكەن‌و لە بەرامبەریدا هەڵیواسن..

بۆ نمونە: كاتێك من چووم بۆ لای خەریكی لەبەركردنی سورەتی (المجادلة)بوو، ئەم سورەتە لە قورئاندا سێ لاپەڕەو نیوەی لاپەڕەیەكە، لە سەر لاپەڕەی مەتر بە مەتر بۆیان كۆپی كرد بوو، لە بەرامبەریدا هەڵیانواسی بوو، ئەمیش لە سەر جێگەكەی خۆیەوە دەیخوێندەوەو لەبەری دەكرد، بەم شێوازە زیاتر لە دە جوزئی قورئانی لەبەركردبوو..

لە تەنیشتیەوە لەناو كارتۆنێكدا هەندێك كاغەز هەبوون، وتم: ئەمە چیە؟

وتی: یاشێخ ئەوە لاپەڕەی پانزە جوزئی قورئانە.. پاكو بێگەردی بۆ خودا!!

ئەم گەنجە سەرەڕای ئەو نەخۆشییە قورسەی، كەچی توانیوویەتی ئەوەندە قورئان لەبەر بكاتو نەیوت: من چەندین نەخۆشیم هەیەو من ناتوانم قسەش بە تەواوی بكەم..

بیرم چوو باسی ئەوە بكەم كە ئەم گەنجە نەیدەتوانی قسە بكات.. كاتێك بەشێكی هەڵواسراوی لە لاپەڕەكانی قورئان لەبەر دەكرد، ئاماژەی بۆ دەكردن، كە ئەو لاپەڕانە لێبكەنەوەو لاپەڕەی تری بۆ هەڵبواسن..

پاش ماوەیەك چوومەوە بۆ لای، سوپاس بۆ خودا بە ڕێژەی ١٥٪ دەیتوانی دەستێكی بجوڵێنێت..

زۆرێك لە منداڵەكانمان، لە خوشكو براكانمان، كاتێك بازنەیەكی لەبەركردنی قورئان دەبینن، یان منداڵێك دەبینن كە قورئانی لەبەرە، خۆزگەی پێدەخوازن.. كەسی واهەیە تەمەنی لە چل ساڵیدایەو خۆزگە دەخوازێتو دەڵێت: بەخوا ناتوانم وەكو ئەوان وابم تازە قورئانم بۆ لەبەر ناكرێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانێت.. خۆ دەتوانیت بانگەوازی خەڵكی بكەیتو فەرمانیان بە چاكەو ڕێگرییان لە خراپە لێبكەیت.. دەتوانیت قورئانیش لەبەر بكەیت، بەڵام هەمووی پەیوەندی بە هیممەت بەرزی كەسەكان خۆیانەوە هەیە..

* عبداللەی كوڕی ئوم مەكتومﷺ نابینا بوو، بەڵام دەیتوانی ئامانج بپێكێتو بە هیممەتی بەرزی بە ئاواتی خۆی بگاتو خزمەت بە موسڵمانان پێشكەش بكات..

شەوێك پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەكرﷺو ئیمامی عومەرداﷺ دەچنە دەرەوەو بە نزیك مزگەوتدا تێدەپەڕن، گوێیان لە دەنگی كەسێك دەبێت زۆر بە جوانیو بە خۆشی قورئان دەخوێنێت..

لە مزگەوتی پێغەمبەری خوداﷺو کاتێك خەڵکی لەماڵەکانیان دەست لە ملی خەونو لەو تاریکی شەوەدا، کەسێك قورئان دەخوێنێت..

پێغەمبەری خوداﷺ لە دەرەوەی مزگەوتەکە دەوەستێتو گوێ لە قورئانەکە دەگرێت، قورئان خوێنەکەش عبداللەی کوڕی ئوم مەکتومرضي الله عنه دەبێت.. پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قورئان خوێندنە جوانە دەبێت دەفەرموێت: ((من أحبَّ أن يقرأ القرآن غضاً كما أنزل، فليقرأه على قراءة عبدالله)).. واتە: (هەر کەسێك پێی خۆشەو حەز دەکات قورئان بەو شێوە ڕوونو پاراوە بخوێنێت، کە دابەزیووە، ئەوا با بەو شێوەیە قورئان بخوێنێت، کە عبداللە دەیخوێنێتو لە سەریەتی)..

پاشان عبداللە کاتێك لە قورئان خوێندنەکەی بووەوە، دەستی بە نزاو پاڕانەوە کردو نەشیزانی، کە پێغەمبەری خوداﷺ ئاگای لێیەتی.. عبداللە دەپاڕایەوەو پێغەمبەری خوداشﷺ دەیفەرموو: داوا بکە پێت دەدرێت.. داوا بکە پێت دەدرێت.. زیاتر داوا بکە خودا پێت دەبەخشێت. (رواه البخاري)..

عبداللەرضي الله عنه تەمەنی بەرەو پێشەوە چوو، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوداﷺ چەند جەنگو غەزایەك ڕوویاندا، هەر بۆیە فەرموی: دەمەوێت منیش لەگەڵ موسڵماناندا بچم بۆ جەنگو جیهاد..

موسڵمانانیش پێیان وت: پەروەردگار مۆڵەتی تۆی داوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ... ﴿٦١﴾ ﴾ النور. واتە: (کوێرو نابینا گوناهو گلەییان لەسەر نیە، هەروەها شەل، نەخۆش)..

عبداللەرضي الله عنه لە وەڵامدا فەرمووی: من دەمەوێت بێم بۆ جەنگو جیهاد، ئاڵایەك لە ئاڵاکانم بدەنە دەست، لەبەر ئەوەی من کەسێکی نابینام، توند ئاڵاکە دەگرمو ناتوانم ڕابکەم، هیچ نەبێت موسڵمانان ئاڵاکە دەبینن‌و لە دەوری ئاڵاکە کۆدەبنەوەو لەباتی چاوساغێك ئاڵاکە بگرێت، چاوساغەکە دەتوانێت، کوشتاری دوژمنان بکات..

بەڵێ.. عبداللەرضي الله عنه لەگەڵ جەنگاوەرە موسڵمانەکاندا دەرچوو بۆ جەنگو ئاڵای موسڵمانانی بە دەستەکانی گرتو جەنگ دەستی پێکرد.. دەنگی شمشێرو تیرو حیلەی ئەسپو هاوار هاوار دەستی پێکرد، ئاڵای موسڵمانانیش بە دەستی عبداللەوەرضي الله عنه دەشەکایەوە..

بەڵێ.. ئاڵای موسڵمانان وەکو ئەوە وابوو بە شاخێکدا چەقێنرا بێت، هەموو ساتێکیش چاوەڕوان دەکرا، تیرێك یان شیرێك بیپێکێتو شەهیدی بکات.. عبداللەرضي الله عنه زۆر خۆڕاگرانە ئاڵاکەی بەرنەداو تا دوا هەناسەی لە شوێنەکەی خۆی نەجوڵاو لە پێناوی پەروەردگاردا گیانی پاکی سپارد..

نەخێر.. بیانوو بۆ هیچ کەس نیە.. بیانوو بۆ ئەو کەسانە نیە کە چاویان نیەو بیکەن بە بیانوو، دەستەو ئەژنۆ دابنیشن‌و هەوڵ بۆ ئەم ئاینە نەدەن، بە هەمان شێوە

هیچ یەکێك لە ئێمە بیانووی ئەوەی نیە، بە هەر هۆکارێك واز لە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بهێنێت..

هەمووماں لە لای پەروەردگار بەرپرسیارینو پرسیارمان لێدەکرێت، لە بارەی ئەو هێزو تواناو زانستو زانیاریانەی کە پێی بەخشیوین.. ئەی ئەو کەسەی زمانێکی پاراوت هەیە، بۆ بانگەواز بۆ ئاینەکەی پەروەردگارت نەکرد؟!

ئەی ئەو کەسەی قاچەکانت ساغە، بۆ نەچووی بۆ مزگەوت؟!

ئەی ئەو کەسەی خاوەن سەروەتو سامانیت، بۆ خزمەتی ئاینەکەی پەروەردگارت نەکرد؟! بۆ خزمەتی هەژارانو نەدارانت پێنەکرد؟!

هەر یەك لە ئێمە دەتوانێت، کاریگەری لە دوای خۆی جێبهێڵێتو شوێن دەستی دیار بێت.. باوك.. دایك.. ژن.. مێرد.. مامۆستا.. قوتابی.. پێش نوێژ.. فەرمانبەر.. پزیشك.. هەموو ئەمانە پێویستە سوور بن لە سەر ئەوەی کاریگەرییەکیان هەبێتو سوودو بەرژەوەندییەك بە دەوروبەرو بە مرۆڤایەتی بگەیەنن..

ئەو کەسانەی کە باسمان کردن، سەرەڕای ئەو هەموو کەموکوڕییەی هەیان بوو، کەچی کاریگەرییان دروست کرد بوو، بە ورەیەکی بەرزەوە ڕووبەڕووی کێشەکانیان بوونەوەو سەرکەوتووش بوون، ئەی ئەبێت چ بیانوویەك بۆ کەسانێك هەبێت، کە پەروەردگار بە چەندین نازو نیعمەتو لەش ساغیو هێزو توانا بەسەری کردوونەتەوە؟!

داواکارم پەروەردگار بۆ ئاینەکەی خۆی بە کارمان بهێنێتو سەرفرازی دونیاو دواڕۆژمان بکات.. بمانکات بە کلیلێك بۆ کردنەوەی دەرگا چاکەکانو داخستنی دەرگا خراپەکان..

پەروەردگار وامان لێبکات کاریگەری چاك لە سەر دەوروبەرمان دروست بکەینو لە خزمەتی ئاینە پیرۆزەکەتدا بین..

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ یس. واتە: (بێگومان هەر ئێمە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەرچی کردوویانەو دەیکەن تۆماری دەکەین لەگەڵ ئاسەوارەکانیشیاندا، هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ئاشکرادا (تۆمارگەی تایبەتیدا) بە وردی تۆمارو ئامار کردووە)..

کەسانێك دەمرن، لەگەڵ خۆیاندا خراپەو کەموکوڕییەکانیشیان دەمرن، بەڵام چاکەکانیان دەمێنێتەوە.. بە پێچەوانەشەوە کەسانێك لەگەڵ مردنی خۆیاندا، چاکەکانیشیان دەمرنو خراپەکانیان دەمێنێتەوە.. مرۆڤەکان وەك چۆن پێویستە کاریگەری چاکە بەجێ بهێڵن، ئاواش پێویستە هەوڵدەن لە دوای خۆیانو لە ژیانی ئێستایاندا کاریگەری خراپ جێنەهێڵن..

# بەرەو لوتکە..

* ئەو نارەحەتییانەی کە تووشی مرۆڤەکان دەبن، بۆ ئەوەی بگەن بە لوتکە جیاوازن، کەسانێك هەن دەتوانن کۆڵی قورسی ئەو نارەحەتیانە هەڵگرن، کەسانێکیش بە پێچەوانەوە، چۆك دادەدەنو دەکەونە چاڵەوە..

ومن لايحب صعود الجبال          يعيش أبَدَ الدهر بين الحفر..

بەڵێ.. ئەوەی حەز نەکات بەسەر چیاکاندا سەرکەوێتو بگات بە لوتکە، بە درێژایی تەمەنی دەبێت لە چاڵەکاندا ژیان بەسەربەرێت..

گریمان سەرکەوتن لە سەر لوتکەی چیایەکی بەرزە، ئەو کەسانەش کە بەسەر چیاکەدا سەردەکەونو دەیانەوێت بیگەنێ جیاوازن، هەیانە لەوانەیە چوار یەکی چیاکە ببڕێت، بەڵام دابەزێتو بگەڕێتەوە.. هەیانە تا نیوە بڕوات.. هەیانە لە نیوەش زیاتر سەردەکەوێت، بەڵام دادەبەزێتو ناگاتە لوتکە.. هەشیانە دەگاتە لوتکەو کاتێك دەگات بە ئامانجەکەی، هەست بە سەرکەوتن دەکات..

گەیشتن بە لوتکە لە زانستدا، لە بازرگانیدا.. لە وتاربێژیدا.. لە پەروەردە کردنی منداڵاندا.. گەیشتن بە لوتکە لە جوان هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هاوسەردا.. گەیشتن بە لوتکە لە ڕەوشت بەرزیدا.. گەیشتن بە لوتکە لە لای کەسەکان جیاوازە.. هەیانە بوونی هەیەو خەڵکیش هەست بەو بوونەی دەکەن، بە پێچەوانەشەوە هەیە بوونو نەبوونی وەك یەك وایە..

* ئێمە لێرەدا باسی چیرۆکی کەسێك بە ناوی عبدالملیکی کوڕی قریب دەکەین، کە لەناو زمانزانو ڕەوان بێژاندا بە (ئەصمەعی) ناسراوەو لە بەناوبانگ ترین هۆنراوەکانیشی ئەو هۆنراوەیەیە، کە نوسەری ئەم کتێبە د. عەریفی هۆکاری نوسینی ئەم هۆنراوەیەی نەنوسیووە، تەنها هۆنراوەکەی هێناوە، لێرەدا بەکورتی هۆکاری دانانی هۆنراوەکەیتان بۆ دەنوسم:

خودای گەورە بەهرەیەکی وای دابوو، بە هارونە ڕەشید کە بۆ جارێکیش گوێی لە هۆنراوەیەك، یان قسەیەك ببووایە لەبەری دەکرد.. وەزیرێکیشی هەبوو بە دووجار گوێگرتن لەبەری دەکرد، خزمەتکارێکیشی هەبوو بە سێ جار گوێگرتن لەبەری دەکرد..

هەر بۆیە هارونە ڕەشید بانگەوازێکی بڵاوکردەوە کە هەر کەسێك هۆنراوەیەکی تازەی بۆ بێنێت، دیارییەکی گەورەی دەداتێ.. خەڵکانێکی زۆر هاتنو هەر هۆنراوەیەکیان دەخوێندەوە، هارونە ڕەشید دەیووت: ئەم هۆنراوەیە کۆنە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە،

ئەوەتا من لەبەرمەو دووباری دەكردەوە، كاتێكیش دوبارەی دەكردەوە، وەزیرەكەش لەبەری دەكردو كاتێك وەزیرەكەش سێ بارەی دەكردەوە، خزمەتكارەكەش لەبەری دەكرد، هارونە ڕەشیدیش قسەكەی بۆ دەچووە سەرو دەیووت: ئەوەتا نەك هەر من، بەڵكو ئەم وەزیرەو كارگوزارەكەشم لەبەریانەو بیستوویانە..

بەم شێوەیە كەس نەیتوانی پارەو دیاری لە هارونە ڕەشید وەربگرێت، ماوەیەك ڕەوان بێژان لە هەوڵدا بوون، هیچیان بۆ نەكرا ئەوەی ئەم بەربەستەی شكاند ئەصمەعی بوو، هۆنراوە بەناوبانگەكەی نوسیو ئەوەندە قورسو گران بوو، هارونە ڕەشیدو دوو كەسەكەی دەوری، نەیانتوانی لەبەری بكەنو دیارییە بەنرخەكە درا بە ئەصمەعی، بەڵام ئەصمەعی دەمو چاوی داپۆشی بوو، چونكە لە كۆشكدا گەورە ببوو، هەر بۆیە هارونە ڕەشید گومانی برد ئەو كەسە زیرەكو لێهاتووە ئەصمەعی بێت، كاتێك چوون بە دوایداو دەمو چاویان دەرخست، ئەصمەعی بوو، ئەمەش هۆنراوەكەیەتی:

صـوت صفـير البلبـل هَيّـج قلبـي الثَّمِـل
الماء والزَّهر مــــعـاً مـع زهـر لحـظِ المُقَـل
وأنـت يـــاسـيدلي وســــيدي ومولـلي
فــكم فكــم تيمني غـــزيــلٌ عـقـيقل
قــطفته مــن وجنة مـن لثـم ورد الخجـل
فــقــــل لالالالا وقـد غـدا مهـرول
والـخود مالت طـــربا مـن فعـل هـذا الرَّجـل
فولـــوت وولـــولت ولي ولي يـــاويللي
فقــــالت له حين كذا انهـــض وجـدٌ بِالمُقَـلِ
وفتية ســقــونني قـهـوة كـــالعسلل
شـــممتهـــا بأنفي أزكى مـــن الـقـرنفـل
في وســط بستـان حُلي بالزهــر والسُّـرور لي
والعـــود دنـــدن لي والطبـل طبطـب طبـلي
طــبطــب طــبطب طبطـب طبطـــب لي
والـــرقـص قد طا لي والسقف سـقسق سق لي..

بابزانین ئەصمەعی چۆن گەیشتە لوتكە، ئەم ڕووداوە (التنوخي) لە پەرتوكی (الفرج بعد الشدة)دا باس كردووەو دەڵێت:

ئەم پیاوە لە شاری بەسرە دەژیاو زۆر هەوڵی بە دەست هێنانی زانستو زانیاری دەداو هەموو ڕۆژێك بۆ فێربوونی فەرموودەو ڕاڤەی قورئانو زمان لە ماڵ دەردەچوو، دوای تەواوبوون ئینجا دەگەڕایەوە، هەر بۆیە کاتی ئەوەی نەدەما بچێت ئیش بکاتو سەروەتو سامان کۆ بکاتەوە، بەردەوام خەریك بوو زانست فێر دەبوو، پەرەی بە تواناو کەسایەتی خۆی دەدا..

لە تەنیشت ماڵەکەیەوە دوکانێك هەبوو.. هەموو جارێك کاتێك ئەصمەعی دەچوو بۆ مزگەوت، یان بۆ فێربوونی زانستەکانی، خاوەنی دوکانەکە ئەم گەنجەی دەبینی، کە تەمەنی لە خوار بیست ساڵەوە بوو، لێی دەپرسیو دەیووت: ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟!

ئەصمەعیش لە وەڵامدا دەیووت: دەچم بۆ لای فلانە مامۆستا بۆ فێربوونی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ..

کاتێك عەسر یان ئێوارە دەهاتەوە، دووبارە دوکاندارەکە لێی دەپرسی: ئەوە لەکوێ دێیتەوە ئەصمەعی؟!

ئەویش دەڵێت: لە لای فلانە مامۆستا دێمەوە..

بۆ سبەینێ بە هەمان شێوەی ڕۆژی ڕابوردوو، لێی دەپرسێت: ئەم بەیانیە بۆ کوێ دەچیت؟!

ئەویش دەڵێت: بۆ لای فلانە مامۆستا دەچم، کە لە بواری شەرعدا شارەزایە..

ئێوارە کە دێتەوە دیسانەوە لێی دەپرسێت: ئەوە لەکوێ دێیتەوە ئەصمەعی؟!

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: لە لای فلانە مامۆستا کە شارەزایە لە ڕاڤەکردنی قورئان، بەم شێوەیە ئەصمەعی بەیانیو ئێوارە لە نێوان ئەم مامۆستاو ئەو مامۆستادا هاتوچۆی دەکردو خەریکی فێربوونی زانستو زانیاری بوو..

ڕۆژێك دوکاندارەکە ئەصمەعی دەگرێتو پێی دەڵێت: کوڕەکەم خۆت لەگەڵ ئەو کەسانەدا خەریك مەکەو وازیان لێبهێنە، لە کۆتاییدا هیچ شتێك بە دەست ناهێنیتو هیچ سوودێکیان لێنابینیت..

ئەصمەعی دەڵێت: ئاخر من خەریکی فێربوونی زانستو لەبەرکردنی قورئانو هۆنراوەو پەخشانو زانستەکانی ترم..

دوکاندارەکە دووبارە پێی دەڵێت: کاتی خۆت لەگەڵ ئەو شتانەدا بەفیڕۆ مەدە..

ئەصمەعی دەڵێت: نا بە دڵنیاییەوە سوودمەند دەبم..

سەیری وەرە بەرزیو وەرە نزمی ئەم دوو کەسە بکە..

دوکاندارەکە پێی دەڵێت: من بۆچوونێکم هەیە، ئەویش ئەوەیە هەموو ئەو پەڕتوکانەی بەیانییانو ئێواران دەیان هێنیتو دەیان بەیت، بیانخەرە ناو بەرمیلێك

ئاوەوەو بەیەکەوە سەیری دەکەین بزانین، ئاوەکە چ ڕەنگێکی لێدەردەچێت، ڕەش.. سوور.. شین!! پەڕتوکی ئەو کاتەش ئەوەندە بچوك نەبووە، بەڵکو هەڵگرتن‌و نوسینەوەشی زۆر ناڕەحەت بووە..

بەڵێ.. ئەمە جۆرێك بوو لە سوکایەتی کردن بە ئەصمەعی.. ئەصمەعی کە ئەو کاتە مێرد منداڵێك بوو، دەڵێت: بێدەنگ بووم‌و ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، لەو ڕۆژە بە دواوە بەیانییان پێش خۆرهەڵاتن‌و زۆر زوو دەڕۆیشتم بۆ ئەوەی دوکاندارەکە نەمبینێت، کاتێکی درەنگی شەویش دەگەڕامەوە بۆ ئەوەی دوکاندارەکە لە کاتی گەڕانەوەشدا هەر نەمبینێت.. ئەوەندە هەژار بووم، کەلوپەلەکانی ماڵەکەم فرۆشت، تەنانەت جل‌وبەرگەکانیشم فرۆشت، تەنها جلێکی چڵکن‌و پیسم لەبەردا مابوو، سەرو قژم ئەوەندە درێژ بوو، پارەی ئەوەم نەبوو، بچم بۆ لای سەرتاشێك‌و کەمێك سەرو قژم چاك بکەم..

بەڕاستی لە حاڵێکی زۆر ناخۆش‌و دژواردا بووم.. ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی کە لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری بەسرەدا دەسوڕامەوە، پیاوێك بانگی دەکردو دەیووت: کێ ئەصمەعیم نیشان دەدا؟

خەڵکەکەش ئاماژەیان بۆ من دەکردو منیان نیشان دەدا..

ئەصمەعی دەڵێت: پیاوەکە هات بۆ لام‌و سەیرێکی کردم‌و وتی: تۆ ئەصمەعی ئەدیب‌و ڕەوان بێژو شاعیریت؟!

وتم: بەڵێ..

پیاوەکە پێی دەڵێت: من لە لایەن ئەمیری بەسرە (موحەممەدی کوڕی سولەیمانی هاشمی)ەوە هاتووم‌و دەیەوێت بتبینێت، بەڵام بەخوا بەم شکڵ‌و شێوەیەتەوە گونجاو نیت‌و بە کەڵکی ئەوە نایەیت، ئاوا بتبینێت!! جل‌و بەرگەکانت زۆر چڵکن‌و پیس‌و پۆخڵن‌و سەرو قژت تێکچووەو ئاڵۆسکاوە!!

ئەصمەعیش دەڵێت: سوێند بە خودا پارەی چوونە حەمام‌و چوونە لای سەرتاشم نیە..

ئەصمەعی دەڵێت: پیاوەکە پێی وتم: چاوەڕێ بکە.. چووەوە بۆ لای ئەمیرو پاشان هاتەوەو پێی وتم: ئەوە هەزار درهەمە، ئەمیر بۆی ناردوویت‌و دەڵێت: با خۆی ڕێکوپێك بکات‌و پاشان بێت بۆ لام..

ئەصمەعی دەڵێت: وتم: سوپاس بۆ خودا.. ئەمە یەکەم دەرگای خێرە لێم دەکرێتەوە.. نەشم دەزانی ئەمیر منی بۆچیە؟! بە هەر حاڵ چووم بۆ لای ئەمیر.. ئەمیر وتی: تۆ ئەصمەعی ئەدیب‌و شاعیریت؟!

وتم: بەڵێ..

ئەمیر وتی: هارونە ڕەشیدی خەلیفە، لە بەغدادەوە داوای لێکردووم کەسێکی شارەزا بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانی بنێرم، کاتێك پرسیارم کرد، وتیان ئەصمەعی کەسێکی شارەزاو ئەدیبو خوێنەرو نوسەرە، دەتوانیت ببیت بە مامۆستای تایبەتی کوڕەکەی خەلیفە هارونە ڕەشید؟

منیش وتم: بەڵێ..

ئەمیر وتی: دەی ئەوە پارەو بڕۆ بۆ بەغداد.. ئەصمەعی دەڵێت: گەڕامەوە بۆ ماڵەکەمو هەندێك لەو شتومەکانەم هەڵگرت، کە لە ماڵەکەمدا مابوو، پاشان کەوتمە ڕێ بەرەو بەغداد..

کاتێك گەیشتمە بەغدادو چوومە لای خەلیفە، خەلیفە بە هەڵسوکەوتو قسەو شارەزاییم سەرسام بوو.. بەم شێوەیە ئەصمەعی لە ئەنجامی سوور بوون لە سەر بە دەست هێنانی زانستو زانیاریو بەردەوام ئەژنۆنان بە ئەژنۆی شارەزایانو مامۆستایانەوە، پەرەی بە خۆیداو ئەو پلەیەی بە دەست هێنا، کە بوو بە جێگەی متمانەی خەلیفەو مامۆستای تایبەتی منداڵەکەی..

بەڵێ.. خەلیفە پێی سەرسام بوو، پاشان وتی: دەمەوێت ببیت بە پەروەردەکارو مامۆستای کوڕەکەم..

ئەصمەعی دەڵێت: خانوو جێگەو ڕێگەیەکی باشیان لە کۆشکدا بۆ ئامادە کردمو ئیتر بووم بە پەروەردەکارو مامۆستای کوڕەکەی خەلیفە..

بەم شێوەیە ئەصمەعی چەندین ساڵ لە لای خەلیفەو کوڕەکەی مایەوەو کوڕەکەی فێری قورئانو هۆنراوەو بنەماکانی زمانی عەرەبی دەکردو خەلیفەش موچەیەکی وای پێدەدا، کە لێی زیاد بوو، چونکە هەموو خواردنو خواردنەوەو پێویستیەکانی لە کۆشکدا بۆ دابین دەکرا، هەر بۆیە زۆرێك لە موچەکەی پاشەکەوت دەکردو دەینارددەوە بۆ بەسرە، هەر بەو پارەیە خانوویەك لە شاری بەسرە دەکڕێت..

ئەصمەعی وای لێدێت، کاتێك خەڵکی بیان ویستیایە سەردانی خەلیفە بکەن، داوایان لە ئەصمەعی دەکرد، شتێکیان بۆ بنوسێت، چونکە ئەو دەیزانی چۆنیان بۆ بنوسێت، هەر بۆیە ئەگەر خەلیفە پێداویستیو داواکاری ئەو کەسانەی جێبەجێ بکردایە، ئەو کەسانەش دیارییان دەدا بە ئەصمەعیو جاری واش هەبوو، بەهۆی ئەوەی کە پەروەردەکارو مامۆستای کوڕەکەی بو، خۆی نوسراوەکانی دەبردە ژوورەوە بۆ لای خەلیفەو ڕازی دەکرد، کە داواکاری ئەو خەڵکە جێبەجێ بکات، ئەوانیش پارەو دیارییان دەدا بە ئەصمەعی، بەم شێوەیە ماڵو سامانێکی باشی کۆکردەوەو ڕەزو باخو بێستانیشی

له شاری بەسره کرێ..

ڕۆژێك خەلیفه داوا له ئەصمەعی دەکاتو پێی دەڵێت: دەگونجێت کوڕەکەم وتاری هەینی بخوێنێتەوە؟!

ئەصمەعیش دەڵێت: بەڵێ..

کوڕەکەی خەلیفه تەمەنی حەفدە، هەژدە ساڵێك دەبێت.. ئەصمەعیش نزیکەی حەوت ساڵە دەرسی پێدەڵێت.. هەر چۆنێك بێت، کوڕەکەی خەلیفە سەر دەکەوێتە سەر مینبەرو وتار بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوەو خەڵکەکە هەموو پێی سەرسام دەبنو له هەموو لایەکەوە پارەو دیاری دەدەن بە منداڵەکەو بە ئەصمەعیش، چونکە دەزانن ئەصمەعی ئەم منداڵەی فێری ئەو هەموو زانستو زانیاریو قسە جوانانە کردووە..

ئەصمەعی دەڵێت: پاش وتارەکە خەلیفه پێی وتم: ئەی ئەصمەعی خودا بەرەکەت بڕژێ بە سەرتا، شکور کوڕەکەم قورئانی لەبەر کردووەو شارەزاییەکی باشی له زمانی عەرەبیدا بە دەست هێناوەو شارەزایی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداشﷺ بووەو له کۆڕو کۆبوونەوەکاندا لەگەڵی دادەنیشێتو ئیتر پێویستی بە تۆ نیەو پێویست ناکات لەگەڵیدا بیت، ئەگەر دەتەوێت له لامان بمێنیتەوە، سەرچاومان، ئەگەر دەشتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ بەسره ئەوا خۆت دەیزانیت..

ئەصمەعی دەڵێت: منیش وتم: دەگەڕێمەوە بۆ بەسرە..

خەلیفه دەڵێت: چیت دەوێ پێتی ببەخشم؟

ئەصمەعی دەڵێت: سوپاس، من له بەسره کێڵگەو ڕەزو باخو خانووم هەیە، هیچم پێویست نیە..

پاشان دەڵێت: ئەی هیچ هیواو خۆزگەیەکت هەیە؟

ئەصمەعی دەڵێت: وتم: بەڵێ..

وتی: چی؟

وتم: دەمەوێتو داوات لێدەکەم نوسراوێك بۆ ئەمیری بەسره (موحەممەدی کوڕی سولەیمانی هاشمی) بنوسیتو داوای لێبکەیت، کاتێك هەواڵی گەڕانەوەی منیان پێدەگات، بێن بەرەو پیرمو پێشوازیم لێبکەن، پاشان خەڵکەکە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بێن بۆ لامو سڵاوم لێبکەن..

خەلیفەش دەڵێت: بەڵێ.. باشەو خەلیفه ئەمیری بەسره ئاگادار دەکاتەوە، بۆ ئەوەی داواکارییەکەی ئەصمەعی جێبەجێ بکەن..

بەڵێ.. ئەمیری بەسرە، (موحەممەدی کوڕی سولەیمانی هاشمی)و وەزیرەکانی له بیابان چاوەڕێی هاتنی پەروەردەکارو مامۆستای کوڕی خەلیفەیان دەکرد.. ئەصمەعی

هاتو خەڵکانێکی زۆریش بۆ بەڕێکردنی لە بەغداوە بەرەو بەسرە لەگەڵی هاتبوون.. ئەمیری بەسرە بە گەرمی پێشوازی لێکردو پاشان بەرەو کۆشکەکەی بردی..

ڕۆژی یەکەم بازرگانو پیاوە گەورەو ناودارەکان هاتن بۆ بەخێرهاتنەوەو سڵاو لێکردنی.. ڕۆژی دووەم ئەو کەسانە هاتن کە لە خوار ئەمانەوە بوون.. ڕۆژی سێیەم خەڵکە ئاساییەکە هاتن بۆ سڵاو لێکردنو بەخێرهاتنەوەی..

ئەصمەعی وەستا بوو، خەڵکەکەش سڵاویان لێدەکردو پێیان دەوت: سڵاو لە هاوەڵی خەلیفە.. سڵاو لە پەروەردەکارو مامۆستای کوڕی خەلیفە.. لەناو خەڵکەکەدا پیاوێکی جلو بەرگ شڕ هەبوو، کاتێك هاتە پێشەوە بە هیچ نازناوێك بانگی ئەصمەعی نەکرد، بەڵکو هەر بە ناوەکەی خۆی بانگی کرد، پاشان وتی: دەمناسیتەوە؟

ئەصمەعی دەڵێت: بەڵێ.. تۆ دوکاندارەکە نیت؟!

پیاوەکە دەڵێت: بەڵێ..

ئەصمەعی دەڵێت: لە بیرتە ئامۆژگاریت کردم بەوەی بچم هەموو پەڕتوکەکانم بخەمە بەرمیلێك ئاوەوەو پاشان چاوەڕێی بکەم، بزانم چ ڕەنگێکی لێدەردەچێت؟! ها لە بیرتە؟!

پیاوەکە دەڵێت: لە بیرمە..

ئەصمەعی دەڵێت: بەڵام من پەڕتوکەکانم لەباتی ئاو، سوور بوونم کرد بە سەریانداو خوێندمنەوەو لەبەرم کردنو لە سەر دڵو سنگم دامنان، پاشان ئەومیان لێدەرچوو کە ئێستا بووم بەم کەسە، خودای گەورە پێش ڕۆژی دوایی، هەر لەم دونیایەدا، ئاوا پێی بەخشیووم..

زانستو زانیاری پێش دواڕۆژ، هەر لە دونیادا مایەی سەرفرازیو سەربەرزییە، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت:﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾ المجادلة. واتە: (خودای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوەو ئەوانەشتان زانستو زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەوپایە بەرزیان دەکاتەوە، خودایش ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).. شارەزایانو زانایان دەفەرموون: (درجات) واتە: چەندین پلەی بەرز، لە دونیاو لە ڕۆژی دوایی.. هەروەها پەروەردگار ڕێزی لێناونو زانایان ڕووناکیو چرای وڵاتن..

ئەصمەعی بەهۆی شارەزایی لە زمانو وێژەو هۆنراوەوە، ئاوا پلەی بەرز بۆوەو خەڵکی سوودیان لێبینی، ئەی ئەگەر ئاوا شارەزای قورئانو فەرموودەو شەرع بووایە، بێگومان پلەی بەرزتر دەبووەوەو خەڵکیش زیاتر سوودیان لێدەبینی..

بەڵێ.. ئەصمەعی بە پیاوەکە دەڵێت: ئامۆژگارییەکەم بە قسە کردی، بەڵام لەباتی

فرێدانی پەڕتوکەکانم‌و خستنە ناو بەرمیلی ئاو، فرێمدانە سەر سنگو دەروونم‌و لەباتی ئەوەی ئاویان بەسەردا بکەم، هەوڵ‌و سوور بوونم بەسەردا کردن‌و ئێستاش ئەوەتە بەرهەم‌و ئەنجامەکەی دەبینی، خۆ تۆ وتت: هەموو پەڕتوکەکانت کۆبکەرەوە، ئینجا من دەسکێ فەریکە نۆکی پێنادەم!!

پیاوەکە دەڵێت: ئێستا کارێکم بۆ بدۆزەرەوەو لە سەر کارێك دام بمەزرێنە..

ئەصمەعی پێی دەڵێت: باشە.. دەتکەم بە پاسەوانی هەندێك لە ڕەزو باخەکانم..

لێرەوە بە هەموو کچان‌و کوڕان‌و برایان‌و خوشکانم دەڵێم:

لاتحسبنَّ المجد تمراً أنت أكله لن تبلغ المجد حتى تلعق الصبرا..

واتە: وامەزانە شکۆمەندی خورمایەکەو دەیخۆیت.. بە شکۆمەندی ناگەیت، تا تاڵی ئارامگری نەچێژیت.. مرۆڤەکان کاتێك دەگەن بە لوتکەو هیواو ئاواتەکانیان، جا ئەو گەیشتن بە لوتکەیە لە هەر بوارێکدا بێت، لە بواری بانگەوازکردندا بێت، ئەوسا بۆی دەردەکەوێت، کە گەیشتن بە لوتکە پێویستی بە بەکارهێنانی ڕێگەو شارەزایی هەیە..

ئەوەتا ئەصمەعی بەیانییان زوو لە خەو هەڵدەستا بە تاریکی دەڕۆیی‌و شەوان بە تاریکی دەگەڕایەوەو زۆربەی کاتەکانی بە هەژاری‌و بە فێربوونی زانست‌و زانیارییەوە بەسەردەبردو لە سەر زۆرێك لە ناڕەحەتی‌و دژوارییەکان ئارامی گرت، هەتا ئەوە بوو گەیشت بە لوتکەو تا ئێستاش باسی ئەصمەعی دەکرێت‌و زۆربەمان ناوبانگمان بیستووە..

هەر بۆیە پێویستە مرۆڤ وەکو ئەصمەعی هەوڵ بداتو لە سەر دژوارییەکان ئارام بگرێت، بۆ ئەوەی بگات بە ئامانج.. پێویستە کاتەکانی لە کاری پڕ سووددا بەسەربەرێت.. پێویستە هاوەڵی سەرکەوتووان بکات، هاوەڵی ئەو کەسانە بکات کە بەرەو سەرکەوتن هانی دەدەن..

داواکارین پەروەردگار منیش‌و ئێوەش ڕێنمایی بکات بۆ لای کارە چاکو پڕ سوودەکان.. بە دڵنیاییشەوە لە گێڕانەوەی چیرۆکو بەسەرهاتەکاندا پەندو ئامۆژگاری هەیە..

# لە نێوان ترس‌و هیوادا..

* ئایا فڕێی دەداتە ناو ئاگرەوە؟!

ئەمە ئەو پرسیارە بوو، کە پێغەمبەری خوداﷺ ئاڕاستەی هاوەڵانی کرد.. لە جەنگی هەوازندا، موسڵمانانو هۆزی هەوازن بە یەکگەیشتن.. هەوازن لە جەنگدا، توندوتیژو بەهێز بوون، موسڵمانانیش بە هەما شێوە..

هەر دوو سوپا کەوتنە جەنگو هاوارو دەنگی پیاوانو حیلەی ئەسپو ماین تێکەڵ بە یەك بوون.. بە ڕاستو چەپدا هەر کوشتو کوشتار بوو.. کاتێك جەنگ کۆتایی هاتو موسڵمانان تیایدا سەرکەوتوو بوون.. دیلەکانو هەموو ئەو ژنو منداڵانەیان لە شوێنێك کۆکردەوە، کە لە جەنگدا گیرا بوون..

هێشتا پێغەمبەری خوداﷺ هیچ بڕیارێکی نەدابوو.. ئەم کەسانە ناکوژرێن، بەڵام جارێ بڕیار نەدرابوو ئازاد بکرێن، یان پارەیان لێبستێنن، یان لەگەڵ دیلی موسڵماناندا ئاڵوگۆڕیان پێبکرێت؟

لە نێوان ئەو کەسانەدا ئافرەتێك هەبوو، دەگەڕاو دەسوڕایەوەو لەو منداڵانە ورد دەبۆوە کە لە لای ئافرەتانو دایکیان بوون.. بە ڕوونی بە ئافرەتەکەوە دیار بوو، کە بە دوای منداڵە شیرەخۆرەکەیدا دەگەڕێت..

پێغەمبەری خوداﷺ سەیری ئافرەتەکەی دەکرد، دوای ئەوەی ئافرەتەکە منداڵەکەی دۆزییەوە.. دوای ئەوەی مەمکەکانی، لە دووری کۆرپەکەی خەریك بوو شیریان لێدەرژا.. دوای ئەوەی تێر تێر گوشی بە سنگیەوەو بۆنی دەکرد..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ سەیری ئافرەتەکەی دەکرد، کە چۆن کەمێك پێشتر ئافرەتەکە بۆ منداڵەکەی دەگریاو دونیای لەبەر چاو تاریك ببوو.. سەیری ئافرەتەکەی دەکردو بڕوای وابوو، کە هەموو هێزی دونیا ناتوانن منداڵەکەی لێبستێنن..

پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ئایا ئەو ئافرەتە منداڵەکەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە؟!

هاوەڵان تێکڕا فەرموویان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، سوێند بە خودا فڕێی ناداتە ناو ئاگرەوە.. چۆن فڕێی دەداتە ناو ئاگرەوە، لە کاتێکدا توند بە سنگیەوە گوشیووەو مەمکەکانی کردۆتە دەمیەوەو وا شیری ئەداتێ؟!

چۆن ئاوا بە ئاسانی جگەرگۆشەکەی فڕێدەداتە ئاگرەوە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ((والذي نفسي بيده، إن الله أرحم بعباده من هذه الأم

بولدها)). رواه البخاري. واتە: (سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، خودای پەروەردگار بەسۆزو میهرەبانترە بۆ بەندەکانی، لە سۆزو میهرەبانی ئەو دایکە بۆ کۆرپەکەی)..

پێغەمبەری خوداﷺ بۆ هەلێك دەگەڕا، بۆ ئەوەی نمونەیەك بۆ هاوەڵان بهێنێتەوە.. جا نمونەکە لە سەر بەزەیی پەروەردگار بێت، یان لە سەر بەخشین، یان بۆ هاندانیان بۆ کاری چاکەو ئاگادارکردنیان لە کاری خراپە بێت..

بەڵێ.. پەروەردگار بە بەزەیی ترە بۆ بەندەکانی، لە بەزەیی ئەو دایکە بۆ کۆرپەو جگەرگۆشەکەی، هەر بۆیە هەندێك لە پێشینان فەرموویانە: سوێند بە خودا ئەگەر پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا سەرپشکمان بکات، لە نێوان ئەوەی خودا لێپرسینەوەمیان لەگەڵ بکات، یان دایکمان، دەڵێین: نا پەروەردگار، توخوا خۆت لێپرسینەوەمان لەگەڵ بکە، لەبەر ئەوەی تۆ لە دایکمان زیاتر بۆمان بە بەزەیی ترو میهرەبان تری..

* ئەنەسﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووین، پیرەمێردێکی پیر هات بۆ لامان، کە پشتی چەمی بۆوە، ئێسقانەکانی لاوازو بێ توانا ببوون، سەریشی سپی ببوو، خۆی بەسەر هەر دوو قاچە لاوازەکانیو گۆچانەکەی دەستیدا دابوو، هاتو لە بەردەم پێغەمبەری خواداﷺ وەستا..

پیاوێکی پیر، برۆکانی لەبەر پرچی چاوەکانیان داپۆشی بوو، هاتە پێشەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئایا پیاوێك دەبینی، هەر چی تاوانێك هەبێت، ئەنجامیداوەو تاوان نەماوە نەیکرد بێت؟! ئەگەر گوناهو تاوانەکانی بەسەر هەموو خەڵکی زەویدا دابەش بکرێت، بەشیان دەکاتو لێیان دەمێنێتەوە، ئایا بۆ ئەو کەسە پەشیمانیو گەڕانەوە هەیە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ سەری پیرۆزی هەڵبڕیو چاوەکانی تێبڕیو فەرمووی: موسڵمان دەبیت؟

پیاوە پیرەکە وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بە دڵنیاییەوە پەروەردگار لێت خۆش دەبێت..

پیاوە پیرەکە وتی: لەو هەموو خراپەو تاوانو گوناهەم؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەڵێ.. لە هەموو خراپەو تاوانو گوناهەکانت..

پیاوە پیرەکە خۆیدا بەسەر گۆچانەکەیداو ڕۆیشتو لەبەر خۆیەوە دوبارەی دەکردەوەو دەیووت: الله أكبر.. الله أكبر.. الله أكبر..

ئەنەسﷺ دەفەرموێت: هەتا بە تەواوی دوورکەوتەوە، هەر گوێمان لە دەنگی الله اکبری بوو. (رواه البخاري)..

پێغەمبەری ئازیزﷺ مژدەدەرو دڵخۆشکەر بوو، نەك تۆقێنەرو ترسێنەر.. خەڵکی لە بەزەیی پەروەردگار ئاگادار دەکردەوەو ئاگاداری خەڵکی دەکردەوە، کە نەکەن دەرگای بەزەیی پەروەردگار بە ڕووی کەسانی تردا دابخەن، هەروەك دەیفەرموو: ((إنما بعثتم مُیَسِّرِین لامعسِّرین)). رواه البخاري. واتە: (ئێوە نێردراون بۆ ئەوەی کار ئاسانی کار بن، نەك بۆ ئەوەی کاری خەڵکی قورس‌و گران بکەن)..

هەروەها کاتێك مەعازی کوڕی جەبەل‌و ئەبی موسای ئەشعەری(خودایان لێ ڕازی بێت) نارد بۆ یەمەن، پێی فەرموون: ((بشرا ولاتنفرا)). رواه البخاري. واتە: (مژدەدەر بن نەك ترسێنەر).. مژدەی خۆش بدەن بە خەڵکی.. باسی بەزەیی پەروەردگاریان بۆ بکەن.. باسی ئەوەیان بۆ بکەن، کە پەروەردگار چەندێك بەندەکانی خۆی خۆشدەوێت..

بەڵێ.. مژدەدەرو دڵخۆشکەر بن، نەك ترسێنەرو تۆقێنەر.. کار ئاسان بکەن، نەك قورس‌و گران.. ڕێك‌و تەبا بن، نەك ناکۆك‌و جیاواز..

پێغەمبەری خوداﷺ دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە لەناو ئێوەدا، کەسانێك هەن خەڵکی لە ئاینی خودا دوور دەخەنەوە، ئەگەر کەسانێك لە ئێوە پێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکەن، با نوێژەکانیان زۆر درێژ نەبێت، بەڵکو کورت بێت. (رواه البخاري)..

هەر چەندە نوێژ پەرستنی پەروەردگاریش بێت، بەڵام زۆر درێژ بوو، خەڵکی لە ئاینی پاکی ئیسلام دوور دەخاتەوە!!

پێغەمبەری خوداﷺ بۆ نوێژ وا بفەرموێت، ئەی ئەو کەسانەی بە تەواوی مافی کرێکارو بەردەستەکانیان نادەن، ئایا نابنە هۆی دوورخستنەوەی خەڵکی لە ئاینی پەروەردگار؟! ئەو کەسانەی هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ دراوسێکانیاندا جوان نیە، جا دراوسێکانیان موسڵمان بن، یان نا، ئایا نابنە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئاینی پەروەردگار؟!

ئەو کەسەی هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانیدا جوان نیە، ئایا نابێتە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئاینی پاکی پەروەردگار؟! هەڵس‌وکەوتی ئەو جۆرە کەسانە کەلێنێك دەخاتە ناو جوانیەکانی ئیسلام، هەر بۆیە پێویستە زیاتر پابەند بین بە ئاینی ئیسلامەوە، ئەوکاتە زیاتر نزیکتر دەبین لە پەروەردگارەوە، پەروەردگاریش بەو هەموو بەزەیی‌و ڕەحمەتەیەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەبێت ئەوە بزانین پەروەردگار هەر چەندە خاوەنی ڕەحمەت‌و بەزەییەکی فراوانە، لە هەمان کاتیشدا خاوەنی سزایەکی قورس‌و پڕ ئێش‌و ئازاریشە..

* لە سەردەمی پێغەمبەر موسا﷣ پیاوێك هەبوو، زۆر ئازاری موسا﷣ی دەدا.. موسا﷣ سکاڵای خۆی بردە لای پەروەردگارو فەرمووی: فلانە کەس ئازارم دەداتو بە

درۆزن ناوم دەباتو لە هەر شوێنێك دەرکەوم سوکایەتیم پێدەکات، پەروەردگار تۆڵەی منی لێبستێنە..

پەروەردگار وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئەی موسا سزای ئەو کەسە دەدەم بە دەستی تۆ، ئەگەر ویستت فەرمان بە ئاسمان بکە بەردی بە سەردا دەبارێنێت، یان فەرمان بە زەوی بکە بە ناخی خۆیدا بیباتە خوارەوە..

چەند ڕۆژێك تێپەڕی، پیاوەکە لە یەکێك لە ڕێگەکاندا تووشی موسا ﷺ بوو، دەستی کرد بە جنێودانو قسەی ناشیرین بە موسا ﷺ..

موساش ﷺ زۆر تووڕە بوو، فەرمووی: ئەی زەوی بە ناخی خۆتدا بیبەرە خوارەوە.. زەوی لەت بوو، تا ئەژنۆی پیاوەکەی بە ناخی خۆیدا بردە خوارێ، پیاوەکە هاواری کردو وتی: ئەی موسا پەشیمانم..

بەڵام موسا ﷺ دووبارە فەرمانی بە زەوی کردو فەرمووی: ئەی زەوی بە ناخی خۆتدا بیبەرە خوارەوە، پاشان تا سەر سنگی پیاوەکە بە زەویدا چووە خوارەوە، هەر هاواری دەکرد، هەتا بە تەواوی لە زەویدا دیار نەماو مرد..

پەروەردگار بە موسا ﷺی فەرموو: ئەی موسا چەند دڵ ڕەقیت، سوێند بە گەورەیم، ئەگەر داوای ڕزگاربوونی لە من بکردایە، ڕزگارم دەکرد..

* ڕاستە، پەروەردگار بە بەزەییە، بەڵام خاوەنی سزای توندوتیژیشە، وەك لەم ڕووداوەدا دەردەکەوێت، کە لە کاتی لافاوەکەی پێغەمبەر نوح ﷺدا، ڕوویداوە..

ڕووداوەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات، پەروەردگار کاتێك تووڕە بێت، بەڕاستی تووڕە دەبێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ بەم شێوەیە ڕووداوی لافاوەکەی نوح ﷺ بۆ هاوەڵانی دەگێڕێتەوە..

نوح ﷺ بەم چەند ئایەتە پیرۆزەی قورئان داوا لە پەروەردگار دەکاتو دەفەرموێت:
﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ﴿١٠﴾ فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ﴿١١﴾ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ ﴾ القمر.

واتە: (نوح ﷺ دوای ٩٥٠ ساڵ هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: خودایە: بەڕاستی من شکستم خواردووەو سەرکەوتنم پێببەخشە.. ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردەوە.. هەموو زەویشمان کرد بە کانیاوو ئاومان لێ هەڵقوڵاند، ئیتر ئاوی ئاسمانو زەوی بە تەقدیرو ویستی خودا بەیەکگەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەردرا بوو.. ئەوسا نوحمان لەسەر چەند تەختەو بزمارێك هەڵگرت (مەبەست کەشتیەکەیە).. لەژێر چاودێری خۆماندا (لەناو ئەو زریانە سامناکەدا)

دەهاتو دەچوو، ئا بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسەمان دایەوە کە بڕوای پێنەکرا)..

ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان بەردەوام دەبن لە باسکردنو گێڕانەوەی نقوم بوونی گەلی نوحﷺو باسی ئەوەمان بۆ دەکات، ئاو چی پێکردن.. ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾﴾ الحاقة. واتە: (بەڕاستی ئێمە کاتێك ئاو لە سنور دەرچوو، ئێوەمان لە کەشتیدا هەڵگرت))..

هەمووومان دەزانین، کاتێك لافاو هەڵدەستێت شەپۆلی ئاو، چۆن دارو درەخت دەشکێنێتو خانوو تێکدەداتو ئۆتۆمبیل وەکو یاری منداڵان بەملاولادا دەبات، دەبینین چۆن خەڵکی هاوار هاوار دەکەنو داوای یارمەتی دەکەنو دەست بە دارو بەردەوە دەگرن.. کەشتیەکان لەناو زەریاو دەریاکاندا، جاری وا هەیە شەپۆلە بەهێزەکان، بە ڕاستو چەپدا یارییان پێدەکەن، بەڵام پەروەردگار هەر خۆی دەیان پارێزێت.. ﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾﴾ الحاقة. واتە: (تا بیکەینە یادگاریو بێدارکەرەوە بۆ ئێوەو لە گوێی بگرێت ئەو گوێیانەی هۆشمەندن)..

بەڵێ.. بۆ بیرخستنەوەیە.. لێرەدا وەك بیرخستنەوەیەك شتێك باس دەکەین..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ باسی کارەساتەکەی گەلی نوحﷺی بۆ هاوەڵانی دەکرد، هەتا گەیشتە باسی ئەو ئافرەتەی کە لە کاتی زریانو لافاوەکە لە ماڵ دەرچوو، زریانو لافاوەکەش لە هەڵکشاندا بوو.. ئاسمان بە لێزمە بارانی دەباراند.. زەویش ئاوی هەڵدەقوڵاند.. ئافرەتەکەش بە منداڵێکەوە ڕایدەکردو سەیری ڕاستو چەپی دەکرد، بۆ ئەوەی پەنایەك بدۆزێتەوە، هەتا شاخێکی بەرزی بەر چاو کەوتو سەرکەوتە سەر لوتکەی شاخەکەو ئاوی لافاوەکەش بەرە بەرە بەرزبۆوە، هەتا لە سەر لوتکەی شاخەکە گەیشت بە ئافرەتەکە..

سەرەتا ئاوەکە خەریك بوو دەگەیشتە سەر سەری منداڵەکە، هەر بۆیە ئافرەتەکە منداڵەکەی هەڵگرتو بە سنگیەوە نوساندو کردیە باوەشی.. ئاوەکە بەرز بۆوە، ئافرەتەکەش منداڵەکەی خستە سەر شانی.. ئاوەکە هەر بەرز دەبۆوەو ئافرەتەکەش منداڵەکەی زیاتر بەرز دەکردەوە، هەتا هەردووکیان نقوم بوونو خنکان..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((لو كان الله راحماً أحداً من قوم نوح لرحم المرأة وصبيّها)). رواه البخاري. واتە: (ئەگەر پەروەردگار ڕەحمی بە کەسێك لە گەلی نوح بکردایە، ئەوا ڕەحمی بەو ئافرەتەو منداڵەکەی دەکرد)، بەڵام هەروەك خودا فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾﴾ القمر. واتە: (بڕوایان بە هەر هەموو نیشانەو بەڵگەکانی ئێمە نەکرد، ئەوسا ئیتر ڕاپێچیمان کردنو لەناومان بردن ئەویش بە دەستی قودرەتی خودایەکی باڵادەستو بەتوانا)..

ئێمە دەزانین کە پەروەردگار زیاتر بۆمان بە بەزەیی ترە لە باوکانو دایکانمان، بەڵام خۆشەویستان ئەم بەزەییەی پەروەردگار نابێت، بەرەو تاوانو سەرپێچیمان بەرێت.. کەسێك سوو بخواتو بڵێت خودای پەروەردگار لە باوكو دایکم بە بەزەیی ترە بۆم.. کەسێك ماڵی خەڵکی بە ستەم بخوات، کەسێك دزی بکات، کەسێك خیانەت بکاتو بڵێت: پەروەردگار لە دایكو باوکم بە بەزەیی ترە بۆم..

نەخێر.. ڕاستە، پەروەردگار میهرەبانو بەخشندە ترە لە باوكو دایك، بەڵام نابێت ئەو بەخشندەییو میهرەبانییە بەرەو ئەوەت بەرێت، سەرپێچیو تاوانی بەرامبەر ئەنجام بدەیت، بەڵکو دەبێت زیاتر پەروەردگارت لە لا گەورە بێتو زیاتر ملکەچی فەرمانەکانی بیت.. هەر بۆیە زانایان دەفەرموون: مرۆڤەکان هەر چەندێك هیوایان بە میهرو لێخۆشبوونی پەروەردگار زیاتر بێت، دەبێت ئەوەندە زیاتر ملکەچی فەرمانەکانی بنو لە گوناهو تاوان خۆیان بە دوور بگرن، پێغەمبەری خوداش ﷺ پێش گوناهە گەورەکان، لە گوناهە بچوکەکان ئاگاداری کردووین..

لە یەکێك لە جەنگەکاندا پێغەمبەری خودا ﷺو هاوەڵانی دەگەڕانەوە، مێردمنداڵێك هەبوو خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺی دەکرد، پێش گەڕانەوەیان بێباوەڕان تیرێکیان هاویشتو بەر ئەو مێردمنداڵە کەوتو کوژرا..

هاوەڵان دەنگی الله أکبریان لێبەرزبۆوەو خۆزگەیان پێدەخواست، کە خودای گەورە شەهیدی پێبەخشی.. گەنجێك لەو تەمەنەیدا خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بکات.. گەنجێك ماڵو کەسوکاری جێهێشت بوو، لە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺدا بوو.. کەواتە شەهیدە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نەخێر.. پێش دابەشکردنی دەسکەوتەکان، ئەو پارچە قوماشەی کە دزی بووی، ئاگر لە گۆڕەکەی بەردەدا..

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ... ﴿١٦١﴾﴾ آل عمران. واتە: (هەر کەس ناحەقیو خیانەتو نادادی بکات لە دابەشکردنی دەسکەوتدا، لە ڕۆژی قیامەتدا نادادیەکەی یەخەی پێدەگرێتو بە کۆڵیەوەیەتی)..

لە دوای ئەو ڕووداوە هاوەڵێك هاتو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمەم لێبگرە لە دەسکەوتەکان، هەڵمگرتبوو..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوە وەکو لەپێکردنی نەعلێکی ئاگر وایە. (رواه البخاري)..

فراوانی بەزەیی خودا، هۆکارێکە بۆ ئەوەی لە بەزەیی پەروەردگار بێهیوا نەبین، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ

ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ الزمر. واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: خودا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاستو دروست بکەن، خودا لە هەر هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خودایە زۆر لێخۆشبووو لێبوردەیەو زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە)..

بەڵێ.. ڕاستە پێویستە بێهیوا نەبین لە بەزەیی خودا، بەڵام نابێت ترسیشمان نەمێنێتو ئەنجامدانی گوناهو تاوان لە لامان ئاسایی ببێتەوە..

ڕاستە پەروەردگار زۆر میهرەبانو لێخۆشبووە، بەڵام خاوەنی سزای زۆر بە ئازاریشە، هەر بۆیە دەبێت هاوسەنگییەك لە نێوان ترسو بەهیوا بووندا ڕابگرینو خەڵکیش تێبگەیەنین، وەك ئەوەی کاتێك کەسێك تاوانێك دەکاتو ئەو باوەڕەی بۆ دروست دەبێت، کە پەروەردگار لێی خۆش نابێت، ئەو کاتە پێویستە باسی بەزەیی پەروەردگاری بۆ بکەیتو چیرۆکی ئەو ژنەی بۆ بگێڕیتەوە کە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئایا منداڵەکەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە؟! هەروەها باسی پیاوە پیرەکەی بۆ بکەیت، کە هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو وتی: ئەگەر کەسێك تاوان نەما بێت بیکات، پەروەردگار لێی خۆش دەبێت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەڵێ.. لێرەدا پێویستە باسی فراوانی بەزەیی پەروەردگاری بۆ بکەین..

بە هەمان شێوەش ئەگەر پێویست بوو، کەسێك لە تاوانو گوناهەکان ئاگادار بکرێتەوە، ئەوا پێویستە باسی سزای توندو پڕ ئازاری پەروەردگاری بۆ بکرێت..

داواکارین بەزەیی پەروەردگار هەمووومان بگرێتەوە لە گوناهو تاوانو خراپەو کەموکوڕییەکانمان خۆش بێت.. آمین..

# هاوەڵانی کەشتی..

* هاوەڵانی کەشتی کێن؟

ئایا ئەوانەن کە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: کۆمەڵێک کەس لە کەشتییەکدا بوون، کەشتییەکە دووقات بوو، هەندێک لە خەڵکەکە لە قاتی سەرەوەو هەندێکیان لە خوارەوە بوون؟!

نەخێر.. هاوەڵانی کەشتی ئەوانە نین..

ئەی ئەو کەسانە بوون کە لەگەڵ پێغەمبەر یونس﷣ دا بوون؟!

نەخێر ئەوانیش نین..

ئێمە مەبەستمان باسکردنی کەشتییەکی ترە.. باسی یەکەم گەشتی دەریایی دەکەین، کە موسڵمانان ئەنجامیاندا.. ئایا پێغەمبەری خودایانﷺ لەگەڵ بوو، یان نا؟! ئایا پاداشتی ئەو گەشتەیان چی بوو؟!

بێباوەڕان لە شاری مەککە تەنگیان بە موسڵمانان هەڵچنیو زۆریان ئازاردان.. بیلالو عەممارو چەندین لە هاوەڵان زۆر بە توندی ئازاردران.. بیهێنە بەر چاوی خۆتو بیری لێبکەرەوە، کاتێک ئەو ستەمکارانەی قورەیش، چۆن بەندەو هەژارەکانیان ئازار دەدا.. ئازارو سزادان بە قامچیو بە ئاگرو ئاسن.. ئازارو سزادان بە هەڵواسین بە دارخورماوە..

کاتێک ئازارو سزاکان پەرەیانسەند، پێغەمبەری خوداﷺ بۆ شوێنێک دەگەڕا کە موسڵمانانی بۆ بنێرێ، بۆ ئەوەی کۆچی بۆ بکەنو لەو ناڕەحەتیو سزاو ئازارە ڕزگاریان بێت..

ڕۆژێک پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: لە حەبەشە پادشایەک هەیە ستەم لە کەس ناکات، کۆچ بکەن بۆ ئەوێ..

نزیکەی هەشتا هاوەڵی ژنو پیاو خۆیان ئامادەکرد، بۆ ئەوەی کۆچ بکەن بۆ حەبەشەو لە غەریبی ژیان بەسەربەرن، بۆ ناوچەیەک بچن کە لەگەڵ ژیانی ئەوێدا ڕانەهاتبوونو زمانی ئەوانیشیان نەدەزانی، لەگەڵ ئەمانەشدا بەرەو حەبەشە کۆچیان کرد..

پادشای حەبەشە ناوی نەجاشی بوو.. ئەم پادشایە، پیاوێکی چاک بوو.. لە سەر ئاینی مەسیحی بوو، پاشان موسڵمان بوو.. جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، چوو بۆ لای نەجاشیو چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز بۆ خوێندو گفتوگۆیەکی جوانو ئیمانی دەربارەی عیسا﷣ی لەگەڵ کردو بەپێی ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی مەریەم ڕوون کردنەوەی بۆ کرد، هەتا نەجاشی باوەڕی هێناو



موسڵمان بوو.. نەجاشی لە دوای موسڵمان بوونی، بە موسڵمانە کۆچکردووەکانی وت: ئیتر ئێوە لە زەوی‌و وڵاتی مندا ئازادن.. لێرە بە دواوە باسی هاوەڵانی کەشتی دەکەین..

هاوەڵانی کەشتی، ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بوون، کە لە مەککەوە بە کەشتی بەرەو حەبەشە کۆچیان کردو نزیکەی حەوت، یان هەشت ساڵێکیش لەو وڵاتە مانەوە، هەتا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو بەو هاوەڵانەی نەفەرموو: ئێوەش وەرن بۆ مەدینەو کۆچ بکەن، تا ساڵی حەوتی کۆچی، کە ماوەی مانەوەی هاوەڵانی حەبەشە، بوو بە پانزە ساڵ‌و گەنجەکانیان بەرەو پیر بوون چوو بوون‌و منداڵەکانیان گەورە ببوون‌و هەندێکیشیان لە حەبەشە منداڵیان بوو.. یەکێك لەو منداڵانەی کە لە حەبەشە لەدایك بوو..

یەکێك لەو منداڵانەی کە لە حەبەشە لەدایك ببوو، ناوی دایکی خالید بوو، ڕۆژێك جل‌وبەرگێکیان بە دیاری بۆ پێغەمبەری خودا ﷺهێنا، بانگی ئەو کچە منداڵەی کردو پێشکەشی ئەوی کردو پێی فەرموو: ((هذا سنا يا أم خالد هذا سنا)).. بە زمانی حەبەشی واتە: ئەوە جوانە ئەی دایکی خالید ئەوە جوانە..

کاتێك قەڵاکانی خەیبەر ئازادکران‌و دەسکەوتێکی زۆر کەوتە دەست موسڵمانان، پێغەمبەری خوداﷺ ئاگاداری کردن‌و بە هاوەڵانی حەبەشەی فەرموو: وەرن بۆ لامان..

بەڵێ.. هاوەڵانی حەبەشە بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ، کاتێك گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەری خوداﷺ زۆر پێیان دڵخۆش‌و شادومان بوو، بەتایبەت بە بینینی جەعفەری ئامۆزای زۆر خۆشحاڵ بوو، هەتاوەکو جەعفەری بە خۆیەوە گوشی‌و نێوانی هەردوو چاوی ماچ کردو فەرمووی: شێوەو ڕەوشتت لە من دەچێت..

کاتێك جەعفەرڕضي الله عنه شەهید بوو، ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری، شووی بە ئیمامی ئەبوبەکرڕضي الله عنه کرد.. ڕۆژێك ئەسماء سەردانی حەفصەی کچی ئیمامی عومەرڕضي الله عنه‌و خێزانی پێغەمبەری خوداﷺ دەکات.. لەم کاتەدا ئیمامی عومەریشڕضي الله عنه سەردانی حەفصەی کچی دەکات.. ئیمامی عومەرڕضي الله عنه سڵاو دەکات‌و دەفەرموێت: ئەمە کێیە کچەکەم؟

ئەویش دەڵێت: ئەسمائی کچی عومەیسە..

ئیمامی عومەرڕضي الله عنه دەفەرموێت: ئەمە ئەو ئافرەتەیە کە سواری کەشتی بووەو بە سەر دەریادا ڕۆیشتووە؟

حەفصەش دەڵێت: بەڵێ..

ئیمامی عومەرڕضي الله عنه هەر بۆ خۆشی‌و دواندنی دەفەرموێت: ئێمە پێش ئێوە کەوتین‌و لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کۆچمان کرد..

ئەسماء تووڕە دەبێتو دەڵێت: ئێوە کۆچتان کردو پێشمان کەوتن؟! بەڵکو پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ ئێوەدا بوو، سەردانی نەخۆشەکانی دەکردنو خواردنی بە برسیەکانتان دەداو یارمەتی لاوازەکانی دەدان، ئێمەش لە غەریبی ژیانمان بەسەردەبرد، سوێند بە خودا بێدەنگ نابم، هەتا پێغەمبەری خوداﷺ لەم قسەیە ئاگادار نەکەم..

ئەسماء دەچێت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺو پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ عومەر دەڵێت: ئێمە لە جیهادو تێکۆشانو کۆچکردندا، پێشتان کەوتین، ئایا منو جەعفەری هاوسەرمان خێرمان دەست ناکەوێت، بەهۆی لە دەست چوونی ئەو کارانەوە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی ئەسماء بچۆ بە هەموو هاوەڵانی کەشتی بڵێ: موسڵمانان یەك پاداشتیان هەیە، بەڵام ئێوە دووجار پاداشتتان بۆ هەیە، ئێوە جارێك کۆچتان کرد بۆ حەبەشەو پاشان جارێکی تریش کۆچتان کرد بۆ مەدینە.. ئەسماء دەڵێت: هاوەڵانی کەشتی بە کۆمەڵ دەهاتن بۆ ئەوەی گوێیان لەو مژدەیە بێت..

بەڵێ.. ئەو هاوەڵە بەڕێزانە لەناو کەشتیدا تووشی چەندین ناڕەحەتی بوون، شەپۆلە بەهێزەکانی دەریا دەیهێنانو دەیبردنو یاری پێدەکردنو مەرگ بە تەواوی هەڕەشەی مردنی لێدەکردن.. ئەم هاوەڵە بەڕێزانە منداڵی بچوکیشیان لەگەڵ بوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە پێناوی خوادا خۆیان تووشی ئەو هەموو ناڕەحەتیو کێشەو گرفتانە کرد، بێگومان هەموو ئەمانەش پەروەردگار بە پاداشت بۆی نوسیوونو خودای گەورە هەرگیز چاکەی چاکەکاران ون ناکات..

ئەسمائی کچی عومەیس، تەنها لەبەر مێردەکەی کۆچی نەکرد، بەڵکو وەکو هەر هاوەڵێك لەو هاوەڵانە، خۆی بە شوێنکەوتەی ئیسلام زانیو لە پێناو پاراستنی بیروباوەڕەکەیدا کۆچی کرد.. باوەڕی وانەبوو، مێردەکەی کۆچ دەکات، کەواتە پێویستە ئەمیش کۆچ بکات..

دوای هاتنەوەیان لە حەبەشە، لەگەڵ جەعفەری هاوسەریداڕضي الله عنه هەشت نۆ مانگێك لە شاری مەدینە مانەوە.. لەو کاتەدا پێغەمبەری خوداﷺ نێردراوێکی نارد بۆ لای پادشای ڕۆم، بۆ ئەوەی بانگهێشتی بکات بۆ ئەوەی موسڵمان بێت، پادشای ڕۆم نەك هەر باوەڕی نەهێناو موسڵمان نەبوو، بەڵکو نێردراوەکەی کوشتو سوپایەکی گەورەشی ئامادەکرد، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر موسڵمانان.. پێغەمبەری خوداشﷺ کاتێك ئەمەی زانی، سوپایەکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆمەکان ئامادەکرد..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ سوپایەکی سێ هەزار کەسی بۆ جەنگی (مۆتە) ئامادەکردو پاشان فەرمووی: ((گەورەو بەرپرستان زەیدە، ئەگەر شەهید بوو جەعفەرە،

ئەگەر شەهید بوو، عبداللەی کوڕی ڕەواحە دەبێت بە گەورەو بەرپرستان))..

سوپا کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە(مؤتە).. ڕۆمەکان نزیکەی دووسەد هەزار جەنگاوەریان کۆکردبۆوە.. سوپای ڕۆمەکان، چەندین جار لە سوپای موسڵمانان زیاتر بوو، سێ هەزار موسڵمان، بەرامبەر دوو سەد هەزار جەنگاوەری ڕۆم، نایەکسانییەکی گەورە لە نێوان هەردوو سوپاکەدا هەبوو.. شەڕ دەستی پێکرد، لە سەرەتای جەنگەکەدا، زەیدﷺ شەهید بوو..

پاشان جەعفەرﷺ ئاڵای موسڵمانانی هەڵگرتو زۆر شێرانە چووە مەیدان، هەرچەندە ماوەیەکی زۆر کەمیش بوو لە حەبەشە گەڕابۆوە، ئەمیش پاش پەڕینی هەردوو دەستی بە شەهیدی سەرینایەوە..

پاشان نۆرەی عبداللەی کوڕی ڕەواحەﷺ هات، عبداللەﷺ سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد، بە چاوەکانی خۆی مردنی دەبینی.. شمشێری دەبینی چۆن بەیەکدا دەدران.. هاوار هاواری جەنگاوەرانو حیلەی ئەسپو خوێنو گۆشتو ئێسقان مەیدانی پڕکردبوو.. ئەمیش بەردەوام بوو لە تێکۆشان، هەتا شەهید بوو..

ئاڵای موسڵمانان کەوتە سەر زەوی.. پێغەمبەری خوداﷺ سێ سەرکردەی دیاری کرد بوو، هەرسێکیان شەهید بوون، هاوەڵێك بە ناوی سابتی کوڕی ئەقرەمﷺ ئاڵاکەی هەڵگرتو بەرزی کردەوەو فەرمووی: وەرن بۆ لام.. وەرن بۆ لام.. موسڵمانان لە دەوری کۆبوونەوە، پاشان فەرمووی: کەسێك بۆ سەرکردەی خۆتان هەڵبژێرن..

وتیان: دەی هەر خۆت سەرکردەبە.. سابتﷺ فەرمووی: من بۆ ئەو کارە شیاو نیم.. پاشان وتیان: دەی خالیدی کوڕی وەلیدﷺ بۆ ئەو کارە باشە.. خالیدﷺ ئاڵاکەی هەڵگرتو دژی ڕۆمەکان جەنگا، هەتا شەو داهات، کاتێك دونیا تاریك بوو، ویستی سوپای موسڵمانان بگێڕێتەوە، بەڵام وتی: ئەگەر پاشەکشێ بکەین، شوێنمان دەکەونو هەموومان دەکوژن، بەڵکو دەبێت گەڕانەوەمان بەپێی پلانێك بێت، هەر بۆیە ڕاستو چەپو پێشو دوای سوپاکەی گۆڕیو ئاڵوگۆڕی پێکردن.. هەروەها ڕەنگی ئاڵاکانیشی گۆڕی.. سووری کرد بە زەرد.. شینی کرد بە سپیو هەروەها..

کاتێك ڕۆژ بۆوە، ڕۆمەکان ئەو هەموو گۆڕانکارییانەیان بینی، وایانزانی موسڵمانان کۆمەکو پشتیوانییان بۆ هاتووە، هەر بۆیە ترس دایگرتن، موسڵمانانیش بە ورەیەکی بەرزەوە کەوتنە کوشتاری ڕۆمەکانو ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن..

خالیدﷺ دەفەرموێت: لە جەنگی مؤتەدا، نۆ شمشێر بە دەستمەوە شکاو تەنها دانەیەکی یەمەنیی لە دەستمدا مایەوە.. شەوی داهاتوو، جەنگ کۆتایی هاتو هەر سوپایەو گەڕایەوە جێگەو شوێنی حەوانەوەی خۆی.. خالیدﷺ بەخێرایی فەرمانی بە

موسڵمانان کرد، یەکسەر خۆیان ئامادە بکەن.. بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە.. هەر ئەوەندە بەسە بۆ موسڵمانانی ئەو جەنگە، کە تەنها لە دەستی خالیدداﷺ نۆ شمشێر دەشکێن!!

ئەمە بوو هەواڵی جەنگی مۆتە.. بەڵام هەواڵی مەدینە بەم شێوەیە بوو: پێغەمبەری خوداﷺ خەڵکی کۆکردەوەو فەرمووی: ئایا لە هەواڵی سوپاکەتان ئاگادارتان نەکەم؟

خەڵکەکە وتیان: ئاگادارمان بکە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زەید ئاڵای موسڵمانانی هەڵگرتو شەهید بوو، پاشان داوای لێخۆشبوونی بۆ زەید کردو فەرمووی: خودایە لێی خۆش بیتو بەزەییت پێیدا بێتەوە..

پاشان فەرمووی: جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرتو ئەویش شەهید بوو، پاشان بۆ ئەویش پاڕایەوەو فەرمووی: خودایە لێی خۆش بیتو بەزەییت پێیدا بێتەوە..

پاشان فەرمووی: عبداللەی کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرتو ئەویش شەهید بوو، پاشان بۆ ئەویش پاڕایەوەو فەرمووی: خودایە لێی خۆش بیتو بەزەییت پێیدا بێتەوە..

پاشان فەرمووی: شمشێرێك لە شمشێرەکانی خودا، ئاڵاکەی هەڵگرتو سوپاکەی بە سەلامەتی گێڕایەوەو دەربازی کردن..

پێغەمبەری خوداﷺ دوای وتەکانی، چوو بۆ ماڵی جەعفەرﷺ بۆ ئەوەی ئارامییەکیان پێببەخشێتو منداڵە بێنازو هەتیوەکانی ببینێت.. ئەو منداڵانەی کە زۆر وابەستەی باوکیان ببوون.. چەند منداڵێکی هەتیو،ساڵانێکی زۆر لە وڵاتی غەریبی لەگەڵ باوکیاندا بوونو ئێوارەو بەیانییان لە باوەشیدا دەکردەوەو یارییان لەگەڵ دەکردو یاری لەگەڵ دەکردن، ماچیان دەکردو ماچی دەکردن.. بە دەستەکانی فرمێسکەکانی دەسڕینو باوەشی پێدادەکردنو بە خۆیەوە دەگوشینو تێر تێر بۆنی دەکردن، کەچی هەر بە گەنجیو تەمەنی سی ساڵی تێنەپەڕاندو لە پێناوی پەروەردگاریدا گیانی خۆی بەخشی..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ مۆڵەتی وەرگرتو چووە ژوورەوە بۆ ماڵی جەعفەرﷺ ئەسماء خۆی داپۆشیو مۆڵەتی بە پێغەمبەری خواداﷺ کە بێتە ژوورەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك چووە ژوورەوە، فەرمووی: برازاکانم بۆ بانگ بکە..

ئەسماء دەڵێت: منداڵەکانم بانگ کرد، کە وەك بەچکەی پاساری وابوون، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ چاوی پێیان کەوت، باوەشی پێداکردنو ماچی کردن.. ئەسماء دەڵێت: منداڵەکانم شۆری بوو، ڕازاندبوومنەوەو هەویرم شێلا بوو، چاوەڕێی هاتنەوەی جەعفەرمان دەکردو منداڵەکانیش زوو زوو دەیانوت: کەی باوکمان دێتەوە؟! کەی باوکمان دەگەڕێتەوە؟!

دەیانوت: دایە ئەوە بۆچی خەریکی دروست کردنی نانو خواردنی؟ ئەی بۆچی دەمانشۆیتو دەمانگۆڕیت؟! منیش دەموت: بۆ ئەوەی کاتێك باوکتان هاتەوە، هەموومان پێکەوە نان بخۆینو بە پاکو خاوێنیو بە جوانی بتان بینێت..

بەڵێ.. منداڵەکان خۆیان خستە باوەشی پێغەمبەری خوداوەﷺو بۆنیان پێوە دەکرد، پێغەمبەری خوداشﷺ هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارێو دەگریا..

ئەسماء دەڵێت: بە پێغەمبەری خودامﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە بارەی جەعفەرەوە هەواڵێکت بیستووە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ بێدەنگ بوو، وەڵامی نەدایەوە.. دووبارە وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە بارەی جەعفەرەوە شتێکت بیستووە؟!

ئەمجارەیان وەڵامی دایەوەو فەرمووی: جەعفەر کوژراوە..

وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ منداڵەکانی بێباوك کەوتن؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: لە بەخێوکردنو ژیانیان دەترسیت؟! لە دونیاو دوارۆژدا، من سەرپەرشتیکاریان دەبم..

ئەسماء دەڵێت: پێغەمبەری خوداﷺ هەر دەگریاو پاشان چووە دەرەوەو فەرمووی: خواردن بۆ ماڵی جەعفەر بەرن، چونکە خۆیان سەرقاڵن..

# قارەمانێتی ئافرەتێك..

* لە سەر چەند پاڵەوانێتییەکی جیاواز دەدوێین.. باسی پاڵەوانێتییەکانی خالیدی کوڕی وەلیدو عومەری کوڕی خەتتابو عوسمانی کوڕی عەففان (خودایان لێ ڕازی بێت) ناکەین.. باسی پاڵەوانێتیەکانی پێغەمبەری ئازیزیشﷺ ناکەین..

باسی پاڵەوانێتی ئافرەتێك دەکەین، کە چۆن خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردو خەڵکانێکی زۆری بۆ لای پەروەردگار بانگ کرد.. کۆمەڵێك کارو کردەوەی ئەنجامدا، کە زۆرێك لە پیاوان نەیانتوانی ئەو کارانە ئەنجام بدەنو لە دەستیان چوو..

کاریگەری ئافرەتان لە ئیسلامدا، کەمتر نیە لە کاریگەری پیاوان، بۆ نمونە: یەکەم کەس کە لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە، ئافرەت بوو..

یەکەم کەس کە لە نێوان سەفاو مەروەدا هاتوچۆی کرد، ئافرەت بوو، ئەویش هاجەرەی دایکی ئیسماعیل‌عليه السلام بوو..

یەکەم کەس کە باوەڕی بە پێغەمبەری خوداﷺ هێنا، خەدیجە بوو (خودا لێی ڕازی بێت)..

یەکەم خوێنێك کە لە ئیسلامداو لە پێناو پەروەردگاردا ڕژا، خوێنی سومەییەی دایکی عەمماری کوڕی یاسر بوو(خودایان لێ ڕازی بێت)..

* باسی ئافرەتێك دەکەین، لە چەندین لایەنەوە، قورسایی‌و کاریگەری خۆی هەبوو.. لە ڕووی تێکۆشانو جیهادەوە، لە ڕووی زانستو فێرکردنەوە، لە ڕووی بانگەوازو پەروەردەکردنی ماڵو منداڵەوە، جێی دەستی دیار بوو.. وەرن با کەمێك لە لای ئەو ئافرەتە بەڕێزە دانیشین، ئەو ئافرەتەش ئوم سولەیمە.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: چوومە بەهەشتو ئوم سولەیمم بینی. (رواه البخاري)..

ئوم سولەیم هاوسەری پیاوێك بوو بە ناوی مالك، ئەم ژنو پیاوە تەنها کوڕێکیان هەبوو بە ناوی ئەنەسی کوڕی مالكرضي الله عنه..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هات بۆ شاری مەدینە، ئوم سولەیم ویستی مێردەکەی موسڵمان بێت، بەڵام ڕازی نەبوو، بەڵکو وتی: دەچین بۆ شامو دەبین بە گاورو لەگەڵ ئەواندا دەژین.. ئوم سولەیم پێی دەڵێت: باشە چی ڕێگریت دەکات، بۆ ئەوەی موسڵمان بیتو باوەڕ بهێنیتو واز لە پەرستنی کۆمەڵە بتێك بهێنیت، کە هیچ سوودو زیانێکت پێناگەیەنن؟! ئەگەر لێیان بپاڕێیتەوە، نابیستن.. هاواریان لێبکەیت، بە هاناتەوە نایەن.. بۆ خودای تاكو تەنها ناپەرستی؟!

مێردەکەی گوێی بەم قسانە نەدا، بەڵکو ئوم سولەیمی تەڵاقداو بەرەو شام کەوتە ڕێ..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ هات بۆ شاری مەدینەو جێگیر بوو.. ئوم سولەیم هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەوە ئەنەسی کوڕمەو تەمەنی نۆ ساڵە، با لە خزمەتتدا بێتو خزمەتت بکات..

دەی پێغەمبەری خوداﷺ ڕازیبە، چونکە من ناتوانم لەگەڵتدا تێبکۆشمو جیهاد بکەم، ماڵو سەروەتێکی واشم نیە خزمەتی پێبکەم، ئەو کوڕەم هێناوە تا خزمەتت بکات..

ئەم ئافرەتە زۆر زیرەك بوو، دەیویست لەگەڵ خزمەت کردنی پێغەمبەری خواداﷺ، ئەنەسی کوڕیشی پەروەردەیەکی جوان لەو سەروەرەوە وەربگرێت..

عەمری کوڕی سەلەمەرضي الله عنه دەگێڕێتەوەو دەڵێت: منداڵ بووەو لە لای پێغەمبەری خوداﷺ نانم دەخواردو دەستم لە قاپەکەدا دەگێڕا، پێغەمبەری خوداشﷺ پێی فەرمووم: ((يا غلام سَمِّ الله وكُل بيمينك وَكُل مما يليك)). رواه البخاري ومسلم. واتە: (ئەی منداڵ ناوی خودا بهێنەو بە دەستی ڕاستو لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ)..

پێغەمبەری خوداﷺ هەموو ئەوانەی پەروەردە دەکرد، کە لە بەردەستیدا بوونو لەگەڵی دەژیان.. ئوم سولەیم دەیویست پێغەمبەری خوداﷺ کوڕەکەی بۆ پەروەردە بکاتو خاڵێکی پەیوەندیش بێت لە نێوان خێزانەکەیو پێغەمبەری خواداﷺ، هەروەها دەیویست ئەنەسی کوڕی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بگوازێتەوە بۆ ماڵی دایکی..

هەر بۆیە ئەنەسرضي الله عنه دەیفەرموو: دایە گیان، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ نان دەخوات، بە دەستی ڕاستی دەخوات.. کاتێك نوێژ دەکات، لە فڵانە نوێژدا ئەو سورەتەو لە فڵانە نوێژدا ئەو سورەتە دەخوێنێت..

بەڵێ.. ئوم سولەیم دەیویست لە ڕێگەی کوڕەکەیەوە فێری سوننەتەکانی پێغەمبەری خوداﷺ ببێت.. پێغەمبەری خوداﷺ قبوڵی کردو چەندین ڕووداوی کاریگەر لە نێوان پێغەمبەری خوداﷺو ئەنەسدارضي الله عنه ڕوویانداوە..

ئەبوطەلحە پیاوێکی خەڵکی شاری مەدینە بوو، زانی ئوم سولەیم مێردەکەی تەڵاقیداوەو بێ هاوسەرە.. ئەم پیاوە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام لەو کاتەدا هێشتا باوەڕی بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەهێنا بوو.. ئەم پیاوە زێڕو زیووو ماڵو کێڵگەو مەڕوماڵاتێکی زۆری هەبوو، هەر بۆیە ڕۆیشتە داخوازی ئوم سولەیم..

ئوم سولەیمیش لە وەڵامدا وتی: ئەی ئەبوطەلحە حەز دەکەم شووت پێبکەم، بەڵام شتێك ڕێگرە لەوەی ڕازی بم..

ئەبوطەلحە دەڵێت: چ شتێك ڕێگرە؟! زێڕو زیوێکی زۆرت بۆ دەکەم بە مارەیی..

ئوم سولەیم دەڵێت: ڕێگرەکە ئەوەیە، کە من موسڵمانمو تۆ بێباوەڕیت، باوەڕ بهێنە دەبم بە هاوسەرت..

ئەبوطەلحە دەڵێت: ئەی ئوم سولەیم من خاوەنی ئاینی خۆمم!!

ئوم سولەیم دەڵێت: ئەی ئەبوطەلحە تۆ شەرم ناکەیت لە سەر ئاینێکیت، کە بت دەپەرستیت؟! تۆ دارێك دەپەرستیت، لە زەوییەوە دەڕوێتو پاشان کەسێکی حەبەشی پەیکەرێکی لێ دروست دەکاتو خەڵکی لێی دەکڕنو لە بەردەمیدا دەگرینو لێی دەپاڕێنەوەو دەیپەرستن!!

ئەبوطەلحە دەڵێت: بەڵێ وایە، بەڵام من زێڕو زیوێکی زۆرت دەدەمێو شووم پێبکە..

ئوم سولەیم دەڵێت: نا.. ئەبوطەلحە.. ئەگەر موسڵمان بیت، شووت پێدەکەمو موسڵمان بوونەکەت مارەییە بۆ من، ئەگەر نا هیچ شتێکی ترم ناوێ..

ئەبوطەلحە موسڵمان دەبێتو پاشان ئوم سولەیم مارە دەکات..

هاوەڵان دەفەرموون: سوێند بە خودا هیچ مارەییەك لە ئیسلامدا، لە مارەیی ئوم سولەیم بە باشتر نازانین، ئەویش موسڵمان بوونی هاوسەرەکەی بوو.. ئەبوطەلحە لە دوای موسڵمان بوونی وای لێهات، پێغەمبەری خوداﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێت: ((دەنگی ئەبوطەلحە بۆ ترساندنی بێباوەڕان، لە سوپادا باشترە لە بوونی کۆمەڵێك لە خەڵکی))..

ئەبوطەلحەرضي الله عنه لەو کەسانە بوو، کە لە جەنگی ئوحوددا لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ مایەوەو گۆڕەپانی جەنگی چۆڵ نەکرد.. کاتێك حەفتا تیرهاوێژەکە هەستیان کرد بێباوەڕان لە پاشەکشەو شکاندان، فەرمانەکەی پێغەمبەری خودایان ﷺلەبیرکردو دە کەسیان نەبێت، هەموویان لە بەرزاییەکە هاتنە خوارەوە، بێباوەڕان کاتێك ئەمەیان بینی، هێرشیان بردە سەر بەرزاییەکەو ئەو چەند موسڵمانەیان شەهید کرد، کە لەوێ مابوونەوەو پاشان کەوتنە تیرباران کردنی پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی..

موسڵمانان پاشەکشەیان کردو ژمارەیەکی زۆر کەم لە موسڵمانان، لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ مانەوەو بەرگرییان لێدەکرد، یەکێك لەو موسڵمانانە، ئەبوطەلحە بوورضي الله عنه ئەبوطەلحەرضي الله عنه ئەوەندەی برین بە جەستەیەوە بوو، پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی فەرمووی: ((براکەتان بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد))..

بەڵێ.. ئەبوطەلحەرضي الله عنه بەهۆی ئوم سولەیمی هاوسەرییەوە، پەروەردگار ڕێنمایی کردو باوەڕی هێنا.. ئەم ئافرەتە زۆر سوور بوو لە سەر شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوداﷺ.. کاتێك موسڵمانان خەریکی هەڵکەندنی خەندەقەکەی دەوری شاری مەدینە بوون، زۆر هیلاکو ماندووو برسی بوون، پێغەمبەری خوداﷺ لە برسانا،

دوو بەردی بە سکیەوە بەستبوو، بۆ ئەوەی کەمێك ئازاری برسیەتیەکەی کەم بێتەوە..

کاتێك ئەبوطەلحەﷺ، پێغەمبەری خوداﷺی بەو شێوەیە بینی، هاتەوە بۆ لای ئوم سولەیمو وتی: پێغەمبەری خودامﷺ بەو شێوەیە بینی، هیچمان نیە؟

ئوم سولەیم لە وەڵامدا دەڵێت: کەمێك نانو خورمامان هەیە.. ئەبوطەلحەﷺ دەڵێت: دەی خواردنێکی لێ دروست بکە، پاش دروست کردنی لە پارچەیەك پەڕۆی دەپێچێتو دەیدات بە ئەنەسی کوڕیو پێی دەڵێت: ئەنەس ئەمە بەرە با پێغەمبەری خوداﷺ بیخوات..

ئەنەس ڕۆیشتو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەم خواردنە دایکم بۆی ناردووی، بەڵام ئایا پێغەمبەری خوداﷺ بە تەنها خواردی؟!

پێغەمبەری خوداﷺ خواردنەکەی دایەوە بە ئەنەس تا بیباتەوە بۆ دایکی، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە وەرن با بچین خواردن بخۆین..

ئەبوطەلحەﷺ دەفەرموێت: من ئاگاداری هەموو شتێك بووم، یەك دوو نانو کەمێك خورما بوو، بەشی ئەو هەموو خەڵکە لەکوێ دەکات؟!

ئەبوطەلحەﷺ بەپەلە ڕۆیشتەوە بۆ لای ئوم سولەیمی هاوسەریو وتی: ئەوا پێغەمبەرﷺ بە خۆیو پشتیوانانو کۆچکەرانەوە هاتن بۆ ئێرە!!

ئوم سولەیم ئافرەتێکی باوەڕدار بوو، هەر بۆیە فەرمووی: پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ مۆڵەتی وەرگرتو چووە ژوورەوە، پاشان نانو خورماکەی هەڵگرتو هەندێك ڕۆنی بە سەردا کردو شێلاییو فووی بە سەردا کردو فەرمووی: خودایە بەرەکەتی تێبکە بۆمان، پاشان فەرمانی بە خەڵکەکە کرد، بێنە ژوورەوەو لە خواردنەکە بخۆن.. دە کەس دە کەس دەهاتنە ژوورەوە، تێریان دەخواردو پاشان دەچوونە دەرەوەو دە کەسی تر دەهاتنە ژوورەوە بۆ نان خواردن..

ئوم سولەیمیش سەیری خواردنەکەی دەکردو بە چاوی خۆی بینی کە چۆن بە چەند نانێکو هەندێك خورما، ئەو هەموو خەڵکەی بەڕێکرد، ئەمیش یەکێك بوو لە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە سەروەرەﷺ.. ئوم سولەیم (خودای لێ ڕازی بێت) زۆر پێغەمبەری خودایﷺ خۆشدەویست، ئەو شەوەی کە پێغەمبەری خوداﷺ زەینەبی دایکی ئیماندارانی گواستەوە، ئوم سولەیم خواردنێکی تایبەتی بۆ دروست کردنو بە ئەنەسدا بۆی ناردن، پێغەمبەری خوداشﷺ بە ئەنەسی فەرموو: بچۆ بانگی فلانە کەسو فلانە کەس بکە، پاشان هەموویان پێکەوە خواردیان..

ڕۆژێك ئوم سولەیم دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری

خوداﷺ پێویستیو داواکارییەکم هەیە..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: داواکاریو پێویستیەکەت چیە؟!

ئوم سولەیم دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ دۆعا بۆ ئەنەس بکە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەستەکانی بەرز دەکاتەوەو دەفەرموێت: ((خودایە تەمەنی درێژ بکەیت.. کردارەکانی چاك بکەیت.. ماڵو سەروەتو سامانو نەوەو منداڵیشی زۆر بکەیت))..

چەند دۆعایەکی جوانە!! تەنها نەیفەرموو: تەمەنی درێژ بکەیت، چونکە تەمەنی درێژ لەگەڵ کردەوەی خراپدا چ سوودێکی هەیە، بەڵکو فەرمووی: تەمەنی درێژ بکەیتو کردارەکانیشی چاك بکەیت..

ئەنەسرضي الله عنه دەفەرموێت: خودا تەمەنی درێژ کردم، ماڵو سەروەتو سامانو منداڵی زۆریشی پێبەخشیم.. ئەمینەی کچم پێی وتم: زیاتر لە سەدو بیست نەوەو وەچەت نێژراونو بە خاك سپێردراون..

ئەنەسرضي الله عنه لە هاوسەری یەکەمی ئەبوطەلحە بوو.. ئوم سولەیم لە ئەبوطەلحەشرضي الله عنه کوڕێکی بوو.. ئەبوطەلحەرضي الله عنه زۆری خۆش دەویست، هەر کاتێك دەهاتەوە بۆماڵەوە دەیکردە باوەشیو بۆنی پێوە دەکردو یاری لەگەڵ دەکرد..

ڕۆژێك ئەم منداڵە نەخۆش دەکەوێت.. نەخۆشییەکەی بەرە بەرە پەرەدەسێنێتو ئەبوطەلحەشرضي الله عنه زۆر بۆی دڵتەنگ دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەچێت بۆ نوێژو بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.. منداڵەکەش نەخۆشیەکەی زیاتر دەبێتو گیانی دەسپێرێت..

ئوم سولەیم بە کەسوکارو دەوروبەرەکەی دەڵێت: کەس بە ئەبوطەلحەرضي الله عنه نەڵێت، هەتا خۆم ئاگاداری دەکەم.. منداڵەکە دادەپۆشێتو ئەبوطەلحەشرضي الله عنه دەگەڕێتەوە.. ئوم سولەیم نایەڵێت هیچ حاڵەتێکی نائاسایی پێوە دیار بێتو دان بە خۆیدا دەگرێتو نایەڵێت گریانی پێوە دیار بێت، لەوەش زیاتر خۆی جوانو بۆن خۆش دەکاتو خواردنیش بۆ هاوسەرەکەی ئامادە دەکات.. دەست بە نان خواردن دەکەنو هاوسەرەکەی دەپرسێت: کوڕەکەمان چۆنە؟

ئوم سولەیم دەڵێت: زۆر ئارامە.. پاشان وەکو ژنو مێرد شەو بەسەردەبەن، پاشتر ئوم سولەیم دەڵێت: ئەبوطەلحە ئەگەر کەسانێك شتێك بە سپاردە بدەن بە کەسانێکی ترو پاشان داوای بکەنەوەو نەیاندەنەوە، ئەوە شتێکی باشە یان خراپ؟!

ئەبوطەلحەرضي الله عنه دەفەرموێت: ئەوە شتێکی خراپو هەڵەیە.. ئوم سولەیم دەڵێت: دەی منداڵەکەت پەروەردگار بردیەوە بۆ لای خۆی.. منداڵەکەت سپاردەیەکی خودا بوو لە لای تۆو ئێستا سپاردەکەی بردەوە..

ئەبوطەلحە﷜ دڵتەنگو توورە دەبێت، کە بۆچی درەنگ پێی وتووەو ئەوها پێشی پێگرتووە.. ئوم سولەیم دەڵێت: هەستەو بچۆ کوڕەکەت ئامادەی ناشتنو کفن کردن بکە.. ئەبوطەلحە﷜ هەڵدەستێتو دەیشواتو کفنی دەکات، پاشان نوێژی بەیانی لە دوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ ئەنجام دەدات.. پاشان منداڵەکەی دێنێتە پێشەوە بۆ ئەوەی نوێژی لە سەر بکەن..

کاتێك نوێژیان لە سەر کرد، ئەبوطەلحە﷜ سکاڵای ئەو کارەی هاوسەرەکەی لە لای پێغەمبەری خودا ﷺ دەکاتو ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.. پێغەمبەریش ﷺ کاتێك بەسەرهاتو ڕووداوەکە دەبیستێت، دوعایان بۆ دەکاتو دەفەرموێت: ((خودایە بەرەکەتی خۆت بە سەر ئەو شەوەی ئەبوطەلحەو هاوسەرەکەیدا بڕێژیت))..

هەندێك کەس دەگێڕنەوە کە پەروەردگار بە هۆی ئەو دۆعا پیرۆزەوە کوڕێکیان دەداتێ، ئەو کوڕەش حەوت کوڕی دەبێت، هەموویان قورئانی پیرۆزیان لەبەر دەبێت..

ئەمانە هەموو بەڵگەن لە سەر هاندانی ئوم سولەیم بۆ هاوسەرەکەی، هەروەها ئەمانە بەڵگەن کە ئەم ئاینە تەنها ئاینی پیاوان نیە، بەڵکو بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئافرەتانیش خاوەنی زۆرێك لە شانازییەکانی ئیسلامنو لە هەموو کاتێکدا گونجاون، بۆ ئەوەی سوودێك بە موسڵمانانو ئاینەکەیان بگەیەنن..

پەروەردگار لەگەڵ ئوم سولەیمو ئەبوطەلحەو پێغەمبەرەکەتدا ﷺ لە بەهەشتی پانو بەریندا کۆمان بکەیتەوە.. آمین..

# سوفیانی ڕاوەدوونراو..

* لە ناڕەحەتیو ناخۆشیدا خودات لەبیر بێتو بیناسە، بە دڵنیاییەوە لە خۆشیو ئاسودەیدا پەروەردگار لەبیرت ناکاتو بەهاناتەوە دێت..

پێغەمبەری ئازیزﷺ ئامۆژگاری عبداللەی کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) دەکاتو پێی دەفەرموێت: ((یا غلام إني أعلِّمك كلمات، إحفظ الله يحفظك، إحفظ الله تجدهُ تجاهك، إذا سألت فسألِ الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو إجتمعت على أن ينفعوك بشئ لم ينفعوك إلا بشئ قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضروك بشئ لم يضرُّوك إلا بشئ قد كتبه الله عليك، رُفِعَتِ الأقلام وجفت الصحف)). رواه الترمذي. واتە: (ئەی کوڕی لاو، من چەند وشەیەکت فێردەکەم.. سنوری خودا بپارێزە، خودا دەتپارێزێت.. سنوری خودا بپارێزە، (لە ناخۆشیدا) بە دەنگتەوە دێت.. ئەگەر داوات کرد، لە خودا داوا بکە.. ئەگەر یارمەتیت خواست، داوای یارمەتی لە خودا بکە.. بزانە ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە، بۆ ئەوەی شتێك قازانجو سوودت پێبگەیەنن، ناتوانن قازانجو سودت پێبگەیەنن، تەنها شتێك نەبێت کە خودا بۆتی نوسی بێت.. ئەگەر کۆشببنەوە، بۆ ئەوەی زەرەرو زیانێکی کەمیشت پێبگەیەنن، ناتوانن زەرەرو زیانت پێبگەیەنن، تەنها بە شتێك نەبێت، کە خودا لە سەری نوسی بیت.. قەڵەمەکان هەڵگیرانو لاپەڕەکانیش وشك بوونەوە)..

هەروەها دەفەرموێت: (لە خۆشیدا پەروەردگار بناسە، لە ناخۆشیدا دەتانسێتو لەبیرت ناکات)..

* ئێمە لێرەدا باسی ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەری سوفیانی سەوری دەکەین، کە چۆن لە خۆشیدا پەروەردگاری لەبیر نەکرد؟! ئەی چۆن تووشی بەڵاو ناڕەحەتی بوو؟! کاتێك چوو بۆ یەمەن تووشی چی هات؟! ئەو ڕووداوە چی بوو، لە کاتی پاسەوانی هەندێك کێڵگەو باخو بێستاندا تووشی بوو؟! چیرۆکی سوفیان لەگەڵ هەنار چی بوو؟!

سوفیانی سەوری یەکێك بوو لە پێشەوا بەڕێزەکانو لە بەغداد دەژیا، خەلیفە بانگی دەکات بۆ ئەوەی بیکات بە دادوەر.. موسڵمانانی پێشوو لە دادگاو دادوەری ڕایان دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەوەکو ستەم لە کەسێك بکەن..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((من جُعِلَ قاضياً فقد ذُبِحَ بغير سكين)). رواه الترمذي. واتە: (کاتێك کەسێك دەکرێت بە دادوەر، ئەوا بە دڵنیاییەوە، وەك ئەوە وایە بەبێ چەقۆ سەر بڕدرا بێت)..

هەروەها دەفەرموێت: ((القضاة ثلاثة: قاضيان في النار، وقاضٍ في الجنة)). رواه الترمذي. واتە: (دادوەرەکان سیانن: دوانیان بۆ ئاگرەو یەکێکیان بۆ بەهەشت).. هەر بۆیە زۆربەیان لەو

بەرپرسیارییەتیە ڕایان کردووە، بۆ ئەوەی شوێنیان ئاگری دۆزەخ نەبێت.. بۆ ئەوەی ستەم لە کەسێك نەکەن.. بۆ ئەوەی قسەیەکی ناحەق نەکەن.. بۆ ئەوەی کێشەیەك یەکلایی نەکەنەوە، کە بە تەواوی شارەزاییان تێیدا نەبێت.. هەر بۆیە سوفیان بۆ ئەوەی لەو کێشەو گرفتە، خۆیو باوەڕو ئیمانەکەی پارێزراو بکات، هەر لە سەرەتاوە بڕیار دەدات کە بڵێت: من نامەوێت ببم بە قازی..

خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنصور بانگی دەکات، خەلیفەش لە هەڵسوکەوت کردنیدا، بە توندیو زبریو بەهێزی بەناوبانگ بوو. خەلیفە ڕوو دەکاتە سوفیانو دەڵێت: ئەی سوفیان دەمەوێت ببیت بە قازی..

سوفیان لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی گەورەی ئیمانداران، من نامەوێتو حەز ناکەم ببم بە قازی..

خەلیفە دەڵێت: ئەی گەنج، ئەگەر ڕازی نەبیت بە شمشێر ملت دەپەڕێنم..

سوفیان دەڵێت: تا سبەینێ چاوەڕێم بکەو لێم بوەستە.. خەلیفە تا سبەینێ مۆڵەتی دەدات.. کاتێك شەو دادێت، سوفیان سواری وڵاخەکەی دەبێتو دەیەوێت لە عێراق ڕابکات، بەڵام نازانێت ڕوو بکاتە کوێو بەرەو کوێ بچێت، پاشان بڕیار دەدات بەرەو یەمەن بڕواتو هەڵبێت..

لە ڕێگە ئەو پارەو خواردنەی پێی دەبێت، تەواو دەبێتو کۆتایی دێت.. لە کۆندا کاتێك خەڵکی لە شوێنێکەوە دەچوون بۆ شوێنێکی تر، زۆرجار ئەوەندەیان پارەو خواردنو پێویستی لەگەڵ خۆیان نەدەبرد کە بیانگەیەنێتە شوێنی مەبەست، لەبەر ئەوەی لە دزو جەردەو ڕێگری ڕێگە دەترسان، ڕووتیان بکەنەوە..

هەر بۆیە کاتێك خواردنو پارەو پێداویستیەکانیان تەواو دەبوو، لە ڕێگە کاریان دەکردو هەندێك پارەو پێداویستییان دەست دەخست، تا بیانگەیەنێتە شوێنێکی ترو لە شوێنی مەبەست نزیك ببنەوە..

سوفیانیش وەکو ئەو خەڵکە، کارێکی بۆ خۆی دۆزییەوەو لە کێڵگەو باخو باخاتی پیاوێك دەست بە کارکردن دەکات.. خەلیفەش ئاگاداری هەموو ناوچەو شارو شارۆچکەکان دەکات، کە سوفیانی بە زیندوویی یان بە مردوویی بۆ بدۆزنەوە، پاداشتی ئەوەندەو ئەوەندەش بۆ ئەو کەسە هەیە، کە ئەو کارە ئەنجام بدات..

خاوەن باخەکە نازانێت ئەم گەنجە سوفیانە.. ڕۆژێك لە ڕۆژان، بە سوفیان دەڵێت: هەندێك هەناری زۆر شیرینو خۆش، بۆ منو ئەم میوانە ئامادە بکە.. سوفیان دەڕوات، هەندێك هەنار دەهێنێت، کاتێك دەیخۆن ترش دەبێت..

خاوەن باخەکە دوبارە دەڵێت: بچۆ هەناری شیرینمان بۆ بێنە.. ئەمجارەش دەچێتو هەندێك هەناری تر دەهێنێت، بە هەمان شێوە ترش دەبێت..

خاوەن باخەکە دەڵێت: نازانیت کام هەنارە شیرینەو کامیان ترشە؟!

سوفیان دەڵێت: نەخێر.. سوێند بە خودا نازانم..
سەیرە!! بۆ نازانیت؟!
سوفیان دەڵێت: لەبەر ئەوەی تا ئێستا تەنها یەك دەنكە هەنارم لەم باخەی تۆ نەخواردووە، لەبەر ئەوەی لە لێپرسینەوەی خودای پەروەردگار ترساوم..
خاوەن باخەكە دەڵێت: ئەم ماوەیە كە لە بەروبوومی ئەم باخەت نەخواردووە، هەمووی لەبەر پارێزكاریو ترسی خودا بووە؟! سەیرە!! مەگەر سوفیانی سەوری بەم شێوەیە بێت؟!
بەڕاستی ئەمە سوفیانی سەوری بوو، بەڵام خاوەن باخەكە نەیدەزانی.. سوفیان ڕۆژانە لەم دار بۆ ئەو دارو لەو جۆگە ئاو بۆ ئەو جۆگە ئاو، هاتوچۆی دەكرد، بەڵام ڕێگەی بە خۆی نەدابوو، كە لە بەروبوومی ئەو باخە بخوات..
خاوەن باخەكە دەچێت بۆ بازاڕو لەناو هەندێك لە هاوەڵانی بازاڕیدا، ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە، یەكێك لە هاوەڵانی دەڵێت: ئەو گەنجەی باسی دەكەیت، كەسێكی چۆنە؟!
خاوەن باخەكە بۆی باس دەكاتو دەڵێت: شێوەی ئاوایەو ڕیشی ئاوایەو سەرو قژیو ڕەنگی چاوی ئاوایە..
پیاوەكە، بیستبووی سوفیانی سەوری كەسێكی چۆنە، هەر بۆیە دەڵێت: سوێند بە خودا ئەوە لە سوفیانی سەوری دەچێت، با بچین بیگرینو ڕادەستی خەلیفەی بكەینو ئەو خەڵاتەی بۆی دیاری كرا بوو، وەری بگرین.. كاتێك گەیشتنە باخەكە، سوفیان بەرەو یەمەن بەڕێكەوتبوو..
بەڵێ.. گەیشتە یەمەنو ویستی كارێك پەیدا بكات، چونكە ئیمانداری ڕاستەقینە، حاڵی ئاوایەو دەبێت بە دوای كارێكی ئابڕووداردا بگەڕێت، جا كۆڵكێشی بێت، یان كرێكاری، یان یارمەتیدەری فرۆشیارێك بێت..
ئیماندار دەبێت كار بكات، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ئیمانداری بەهێز، باشترو خۆشەویسترە لە ئیمانداری لاوازو بێهێز، هەر چەندە لە هەردووكیشیاندا خێرو چاكە هەیە..
هەروەها دەفەرموێت: ((الید العُلیا خیر من الید السفلی)). رواە الترمذي. واتە: (ئەو دەستەی كە لە سەرەوەیەو دەبەخشێت، باشترو چاكترە لەو دەستەی كە لە خوارەوەیەو وەردەگرێت)..
هەروەها دەفەرموێت: ئەگەر كەسێك لە ئێوە بە گوریس دار بهێنێتو بە پشتی هەڵیبگرێتو بیفرۆشێت، باشترو چاكترە لەوەی داوا لە خەڵكی بكاتو بیدەنێ، یان نەیدەنێ. (رواە البخاري)..
پیاوێك دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو دەڵێت: هەژارمو ماڵو سامانم نیە..
پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەكات، چی لە ماڵەكەیدا هەیە بیهێنێت، پیاوەكە

دەچێتو تەنها جوتێك نەعلیان دەبێت، جوتە نەعلەكە دەهێنێتو دێتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەكات بیفرۆشێت، بەڵام پیاوەكە بۆی نافرۆشرێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: كێ ئەم جوتە نەعلە دەكڕێت؟

یەكێك لە هاوەڵان بە دوو درهەم دەیكڕێتو پێغەمبەری خوداش ﷺ دوو درهەمەكەی دا بە پیاوە هەژارەكەو فەرمووی: بە درهەمێكیان گوریسو تەورێك بكڕە، بە درهەمەكەی تریش خواردن بۆ ماڵەوە بكڕە..

پیاوەكە گوریسو تەورەكەی كڕیو پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بچۆ بۆ فلانە شوێنو دار ببڕەو بیهێنەرەوە..

پیاوەكە دەڕواتو ئەو دەشتو دەرە دەبینێت، دار دەبڕێتو دەیهێنێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: كێ ئەم دارانە دەكڕێت؟

پێغەمبەری خودا ﷺ بە درهەمێك دارەكان دەفرۆشێت.. ئێستا پیاوە هەژارەكە گوریسو تەوری هەیەو درهەمێكیش سەرمایەی هەیە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەكات، كە هەموو ڕۆژێك ئەو كارە بكاتو دوبارەی بكاتەوە..

سوفیانی سەوری دەیزانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕقی لە سواڵكردنە، بە داخەوە ئەمڕۆ خەڵكانێك هیچ ئازاری خۆیان نادەنو هیچ ئەركێكیش ناخەنە سەر شانیانو كارو كاسبییەك ناكەنو تەنها پشت بە سواڵكردن دەبەستنو دەروونو كەسایەتی خۆیان نزمو زەلیل دەكەن..

جارێك سواڵكەرێك داوای یارمەتیو پارەی لە هاوەڵێكم كرد بوو.. هاوەڵەكەشم پێشنیارێكی سەیری بۆ خستبووە ڕوو.. هاوەڵەكەم لە چێشتخانەیەك لایدابوو نان بخوات، كەسێك هاتبوو بۆ لایو وتبووی: من كەسێكی هەژارو نەدارم، داواكارم یارمەتیەكم بدەی..

هاوەڵەكەم سەیری كرد بوو، ئەم كەسە كەسێكی بەهێزو بەتوانایە، هەر بۆیە پێی وتبوو: لەباتی دەست پان كردنەوەو سواڵكردن بۆچی كارێك ناكەیت؟!

كەسەكەش وتبووی: كاكە كەس ئیشم ناداتیو ئیشم پێناكەن، دوو ڕیاڵم بدەرێ با نانی ئێوارەی پێ بخۆم..

هاوەڵەكەم وتبووی: وەرە، پشتی سەیارەكەی كردبۆوەو پەڕۆیەك یان پارچە ئیسفەنجێكی دەرهێنا بوو لەگەڵ سەتڵێك، پاشان وتبووی: ئەم سەتڵە پڕ ئاو بكەو سەیارەكەم بۆ بشۆ، دوو یان سێ ڕیاڵت نادەمێ، بەڵكو پانزە ڕیاڵت دەدەمێ..

سواڵكەرەكەش وتبووی: برا من نامەوێت ئیش بكەم، دەمەوێت خێرێكم پێبكەیت..

پاكو بێگەردی بۆ خودا.. پانزە ڕیاڵت بە عەرەقی نێوچاوانت دەست دەكەوێت، لە كاتێكدا كەرەستەكانیش هی خۆمەو ئاوەكەش هی خودایە، تەنها كەمێك ئۆتۆمبیلەكەم

دەسرپیتەوەو بەس، باشترنیە لەوەی دەست پان بکەیتەوە لە خەڵکیو ڕیاڵێکت بدەنێ یان نا؟!

سواڵکەرەکە شتەکان فرێ دەداتو دەڕوات.. کێشەکە لەوەدایە ئەو کەسانە لە بنەڕەتدا ئامادەیی کارکردنیان تێدانیەو نیەتیان نیە کە کارێکی ڕێکوپێک بکەن..

سوفیان دەیزانی ئەگەر کار بکات ڕوخساری لە زەلیلی دەپارێزێتو سەرشۆڕی بەردەمی ئەمو ئەو نابێت..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((کەسی وا هەیە لە سەر سواڵکردن بەردەوام دەبێت، هەتا دەگاتەوە بە خودای گەورەو هیچ پارچە گۆشتێك بە ڕوخسارییەوە نامێنێت))..

سوفیان چووە ناو یەکێك لە بازاڕەکانی یەمەنو دەربارەی دەسکەوتنی کارێك پرسیاری کرد، بەڵام هەندێك کەس تۆمەتی دزی کردنیان خستە پاڵ.. سوفیانیش دەیوت: سوێند بە خودا خەڵکینە هیچ شتێکم نەدزیوە.. ئەو کەسانە باوەڕی پێناکەنو کێشەکە دەگەیەننە لای والی..

والی یەمەنیش شوێنکەوتەو دانراوی خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور بوو.. کاتێك والی سوفیان دەبینێت، باوەڕ ناکات ئەم سەرو سیما جوانو نورانیو دەروشاوەیە دز بێت، چونکە والی ئەوەندە دزو جەردەی بینی بوو، تا دزو جەردەو پیاوچاك لێك جیا بکاتەوە، هەر بۆیە والی بە خەڵکەکە دەڵێت: بچنە دەرەوە بە تەنها لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکەم..

کاتێك والی بە تەنها لەگەڵ سوفیان دەمێنێتەوە، پێی دەڵێت: ناوت چیە؟

سوفیان دەڵێت: عبدالله..

والی دەڵێت: بە خودای گەورە سوێندت دەدەم: ناوت چیە؟

دەڵێت: سوفیان.. پاشان ناوی باوکیشی لێدەپرسێتو دەڵێت: ناوی باوکیشم سەعیدە..

والی دەڵێت: سوفیانی سەوریت؟

سوفیان دەڵێت: بەڵێ..

والی دەڵێت: کەواتە تۆ ئەو زانا گەورەیەی کە خەلیفە لێت دەگەڕێت؟

سوفیان دەڵێت: بەڵێ..

والی دەڵێت: دەزانیت ئەو پاداشتە چەندە کە خەلیفە بۆ دەسکەوتنی تۆ دیاری کردووە؟

سوفیان دەڵێت: بەڵێ، دەزانم..

والی بێدەنگ دەبێت، سەری نزم دەکاتەوەو پاشان بەرزی دەکاتەوەو دەڵێت: هەستە چۆنت دەوێتو بۆ کوێ دەچیت لە یەمەندا بڕۆو وەرە، سوێند بە خودا ئەگەر لە ژێر قاچەکانیشمدا خۆت بشاریتەوە، قاچەکانم بەرز ناکەمەوەو ئاشکرات ناکەم..

بەڵێ.. لە خۆشیدا خودات لە یاد بێت، لە ناخۆشیدا خودا لە بیرت ناکات.. لە ئازادیو سەربەخۆییدا خودات لە یاد بێت، لە بەندیخانەو ئەشکەنجەو ئازاردا، خودا لە یادت ناکات..

پاش ماوەیەك سوفیان دەچێت بۆ مەککە، خەلیفە دەبیستێت کە سوفیان لە حەرەمەو چەند ڕۆژێکی کەمیشی دەمێنێت بۆ حەج، هەندێك لە سەربازەکانی دەنێرێتو پێیان دەڵێت: هەتا من دەگەمە ئەوێ سوفیان دەستگیر بکەنو بە تەختەیەکەوە هەڵیواسن، بۆ ئەوەی بە دەستی خۆم بیکوژم..

سەربازەکان دەچنە حەرەمو دەڵێن: کێ سوفیانمان نیشان دەدات؟ کێ سوفیانمان نیشان دەدات؟

خەلیفەش وا بەڕێوەیەو بەرەو مەککە دێت.. ئا لەم کاتەدا سوفیان دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمانو ڕوو دەکاتە قیبلەو دەڵێت: پەروەردگار داوات لێدەکەم ئەبو جەعفەر پێی نەخاتە مەککەوە، چونکە ستەمم لێدەکات..

کەسانی وا هەن ئەگەر داوا لە خودا بکەن، خودا داواکەیان وەردەگرێتو دڵیان ناشکێنێت.. کەسانێکی جل شڕو تەپوتۆزاویو سەرو قژ ناڕێك هەن، خودا دڵیان ناشکێنێتو داواکانیان وەردەگرێتو نایداتەوە بە ڕوویاندا..

بەڵێ.. فریشتەکانی ئاسمان لە بەردەم دەرگاکانی مەککە ڕادەوەستنو نایەڵن خەلیفە بێتە ژوورەوەو گیانی دەکێشنو دەمرێت.. ئەبو جەعفەر بە لاشەیەکی بێ گیانەوە دەهێننە مەککەوەو نوێژی لە سەر دەکەن..

بەڕاستی جوانە.. لە خۆشیدا پەروەردگارت لە بیر بێت، لە ناخۆشیدا لە بیرت ناکاتو ڕزگارت دەکات..

داواکارین پەروەردگار لەو کەسانەمان بژمێرێت، کە لە خۆشیو ناخۆشیدا لە بیری ناکەن.. داواکارین پەروەردگار پەندو ئامۆژگاریمان پێببەخشێت.. ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ یوسف. واتە: (سوێند بێت بە خودا بەڕاستی لە سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وە نەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێك بێت هەڵبەسترابێت، بەڵکو بە ڕاستدانەری ئەوەیە کە لە پێش خۆیەوە هاتووە (تەوراتو ئینجیل)و ڕوونکەرەوەو جیاکردنەوەی هەموو شتێکی پێویستە لە ئایندا، ڕێنومییو ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك باوەڕ دەهێنن)..

# با خواردنت حەڵاڵ بێت..

* پیاوێك پرسیار لە سوفیانی سەوری دەكاتو دەڵێت: ئەی پێشەوا كامیان باشترە، لە لای ڕاستی ڕیزی پێشەوە نوێژ بكەیت، یان لە لای چەپی ڕیزی پێشەوە؟

سوفیان لە وەڵامدا دەفەرموێت: سەیری ئەو نانە بكە كە دەیخۆیت، بزانە حەڵاڵە یان حەرام، ئەوەیان گرنگە، نەك ئەوەی لە كام لای ڕیزدا نوێژ بكەیت!!

جاری وا هەیە كەسانێك پرسیاری ئاوا ورد دەكەن، كەچی نازانن خەریكن هەندێك تاوان ئەنجام دەدەن، یان كەوتوونەتە ناو هەندێك تاوانەوە، كە ئەو تاوانانە ڕێگرن لە گیرابوونو قەبوڵ بوونی پەرستشەكانی ئەو كەسانە، هەروەك پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((ئایا دەزانن مایەپوچ كێیە؟ هاوەڵان دەڵێن: مایەپوچ لە لای ئێمە، كەسێكە كە هیچ دینارو درهەمێكی نەبێت، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: مایەپوچ لە ئوممەتی من، كەسێكە لە ڕۆژی دواییدا كاتێك بە نوێژو ڕۆژوو زەكاتەوە دەیهێنن، بەهۆی ئەوەی خراپەی زۆری كردووەو جنێوی بەمداوەو ئازاری ئەویداوەوماڵی ئەوی خواردووە، چاكەكانی نامێننو دەیدەن بەو كەسانەی كە خراپەی لەگەڵ كردوون))..

هەر بۆیە سوفیانی سەوریش دەڵێت: چ سوودی هەیە، لە ڕیزی یەكەم نوێژ بكەیت، لە كاتێكدا لەوانەیە مافی خەڵكی بخۆیت، بۆیە پێویستە سەرەتا خواردنو خواردنەوەت حەڵاڵ بكەیت..

وەرن با پێكەوە باسێكی پێشینەكانمان بكەین، بزانین هۆكاری سەرەكی وەرگیرانی نزاو پاڕانەوەكانیان، چی بووە؟

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((پەروەردگار پاكەو پاكیش نەبێت وەری ناگرێت))..

هەروەها پەروەردگار فەرمان بە موسڵمانان دەكات، بەوەی كە فەرمانی بە پێغەمبەرانیش كردووە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ ...﴿٥١﴾﴾ المؤمنون. واتە: (ئەی گرۆی پێغەمبەران، بخۆن لە ڕزقو ڕۆزیە چاكو پاكەكان، كارو كردەوەی چاكیش ئەنجام بدەن)..

پەروەردگار لەم ئایەتەدا خواردنی پاكو خواردنی حەڵاڵی پێش ئەنجامدانی كردەوەی چاك خستووە.. واتە: پێش ئەوەی هانی موسڵمانان بدات نوێژبكەنو ڕۆژوو بگرنو قورئان بخوێنن، داوایان لێدەكات، خواردنیان حەڵاڵو پاك بێت..

بەڵێ.. پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەران..

دەبێت داوای چیان لێبکاتو فەرمانی چیان پێبدات.. داوایان لێدەکات، خواردنو خواردنەوەتان حەڵاڵو پاك بێت، پاشان دەفەرموێت: کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەن.. پێش ئەوەی دەست بە ئەنجامدانی کارو کردەوەی باش بکەیت، سووربە لە سەر ئەوەی خواردنو خواردنەوەت حەڵاڵ بێت، بۆ ئەوەی ئەو کارە چاکانەی ئەنجامیان دەدەیت، بەهۆی خواردنی حەرامەوە لە دەستی نەدەیت.. بەڵێ..﴿كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ...(٥١)﴾ المؤمنون...

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ نمونەی پیاوێکمان بۆ دێنێتەوە، کە بەهۆی دوورو درێژی ڕێگەوە، تەپوتۆزاویو سەرو قژ ئاڵۆسکاو بووەو دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوەو هەر دەڵێت: ئەی خودایە.. ئەی خودایەو دەپاڕێتەوەو داوا دەکات، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: چۆن نزاو پاڕانەوەکانی لێوەردەگیرێت، لە کاتێکدا خواردنی حەرامە.. جلوبەرگی حەرامە.. بەو خواردنەش گۆشتی گرتووەو قەڵەو بووە؟!

* ئەبومەعالی جوەینی، ئیمامی حەرەمین بوو، پێشەوای پێشەواکان بوو، زانایەکی بەرزو بە توانا بوو، بە تایبەت لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەو گفتوگۆدا، خاوەن زیرەکیو لێهاتوویەکی زۆر بوو، بەرامبەرو دژەکانی هەرگیز نەیاندەتوانی بێدەنگی بکەن..

باوکی ئەم زانایە، پیاوێکی چاك بوو، لەگەڵ ئەوەی زۆر هەژارو نەداریش بوون، بەڵام سوور بوو لە سەر ئەوەی ئەم منداڵەی بە نانو ئاوی حەڵاڵ پەروەردەو گەورە بکات، هەر بۆیە خێزانەکەی ئاگادار دەکاتو پێی دەڵێت: جگەلە خۆت کەس شیر بەو منداڵە نەدات، چونکە دەزانم شیری تۆ حەڵاڵە، لەبەر ئەوەی ئەو خواردنەی تۆ دەیخۆیت، من دەیهێنمو پەیدای دەکەم، منیش جگەلە خواردنی حەڵاڵ، هیچ خواردنێکی تر ناهێنم..

ڕۆژێك ئافرەتێك سەردانیان دەکات، کاتێك دایکی منداڵەکە خەریکی خزمەت کردنی ئافرەتە میوانەکە دەبێت، منداڵەکە دەگیرێت، ئافرەتە میوانەکە منداڵەکە دەخاتە باوەشیو کەمێك شیری خۆی پێدەدات.. هەر چەندە جارێك، یان دووجار شیردان کێشەیەکی نیە، مادام کەمتر بێت لە پێنج جار..

کاتێك دایکەکە دێتە ژوورەوە، منداڵەکەی لە باوەشی میوانەکە دەردەهێنێتو ڕای دەکێشێتو سەرزەنشتی دەکاتو دەڵێت: مێردەکەم فەرمانی پێکردووم جگەلە خۆم کەسی تر شیری پێنەدات، لەبەر ئەوەی متمانەی تەواوی بە منەو دەزانێت، ئەو خواردنەی کە دەیخۆم حەڵاڵەو شیرەکەشم لەو خواردنە حەڵاڵەوە دروست دەبێت..

ئەم منداڵە گەورە دەبێتو دەبێت بەو زانا گەورەیە، بەڵام جار جار لە کاتی گفتوگۆو ئامۆژگاری کردنی خەڵکیدا، کەمێك زمانی دەیگرێت.. کاتێك وای لێدێت، جار جار دەڵێت: ئەوە بە هۆی ئەو جارە شیرەوەیە، کە ئاوام لێهاتووە..

ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی، خواردنی حەڵاڵ بەشێوەیەکی کرداری کاریگەری لەسەر زیرەکیو زانستو زانیاری هەیە..

بەڵێ.. هەروەك سوفیان فەرمووی: جاری وا هەیە خەڵکانێك پرسیار دەکەن، کە لە لای ڕاستی ڕیزی یەکەم، یان لە لای چەپی ڕیزی یەکەم نوێژ بکەن خێرەو پاداشتی زیاترە، کەچی لە وەڵامدا فەرمووی: سەیری خواردنەکەت بکە، بزانە حەڵاڵە یان حەرام؟!

* ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ دێتەوە بۆماڵەوەو دەنکێك خورما لە سەر جێگەکەی دەبینێ، زۆریشی برسی دەبێت، دەنکە خورماکە بەرز دەکاتەوە بۆ دەمیو پاشان دەفەرموێت: ئەگەر بمزانیایە، ئەم دەنکە خورمایە، خورمای زەکات نیە دەمخوارد، پاشان فەرمان دەکات بیبەخشن. (رواه البخاري)..

جارێکی تریان کاتێك زەکات کۆکرابۆوەو لە بەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ دانرا بوو، حەسەن یان حوسەین دێتو دەنکێك خورمای زەکات دەخاتە دەمیەوە، پێغەمبەری خوداﷺ دێتو دەست دەکات بە دەمیداو دەنکە خورماکە دەردەهێنێتو پێی دەفەرموێت: کخ.. کخ.. پاشان دەنکە خورماکە دەردەهێنێتو دایدەنێتەوەو دەفەرموێت: ئەم خورمایە زەکاتەو زەکاتیش بە موحەممەدو کەس‌وکاری ناشێت. (رواه البخاري)..

ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە، کە ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ چەندە سوور بووە لە سەر خواردنی حەڵاڵو دوورکەوتنەوە لە حەرام..

* سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصرضي الله عنه دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوا لە پەروەردگار بکە کە دۆعاکانم وەرگرێتو لەو کەسانە بم کە دۆعاکانیان ڕەت ناکرێتەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەیتوانی، دەستەکانی بەرز بکاتەوەو بڵێت: خودایە سەعد لەو کەسانە بێت کە دۆعایان وەرگیراوە، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ دەیەوێت هاوەڵانی فێر بکاتو تێیان بگەیەنێت، کە ئەو کارە چۆن چۆنی دەبێت، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی سەعد، خواردنت حەڵاڵ بکە، دۆعاکانت وەرگیراو دەبن. (رواه البخاري)..

کێشەکە لە نزاو پاڕانەوەو دۆعاکەدا نیە، خواردنەکەت حەڵاڵ بێت، بە دڵنیاییەوە دۆعاکانت وەرگیراو دەبن..

ئیتر سەعدرضي الله عنه لە دوای ئەو ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوداﷺ جگەلە خواردنی حەڵاڵ، هیچ خواردنێکی تر ناخوات، هەتا دەگێڕنەوە لە ماڵەوە ئاژەڵێکی ڕاگرتبوو، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەو شیرەی کە دەیخوات، ڕۆژێك ئاژەڵەکەی دەچێتە کێڵگەی دراوسێیەکیانەوەو بەبێ پرسی دراوسێکەیان، تێر لە گژو گیای کێڵگەکەیان دەخوات،

کاتێك سەعدﷺ ئەمە دەزانێت، هەتا کۆچی دوایی دەکات، ئیتر لە شیری ئەو ئاژەڵە ناخوات، هەر بۆیە سەعدﷺ دەبێت بە کەسێك، کە دۆعاو پاڕانەوەکانی وەرگیراو دەبن..

* ئیمامی عومەرﷺ، سەعدﷺ دەکات بە بەرپرسی یەکێك لە شارەکانی عێراق.. لە نێوان هەندێك لە خەڵکی ئەو شارەو سەعداﷺ شتێك دروست دەبێتو نامەیەك بۆ ئیمامی عومەرﷺ دەنێرنو هەندێك شتی دەربارەی سەعدﷺ تیا دەنوسن..

ئیمامی عومەرﷺ دەیەوێت، دڵنیا بێت لەو هەواڵانەی کە بۆی ناردراوەو نایەوێت لە خۆیەوەو بەپەلە بڕیار بداتو لە کاری بخات، هەر بۆیە بە دوای ڕاستو دروستی هەواڵەکەدا دەچێت، هەروەك سولەیمانﷺ کاتێك پەپوە سلێمانە هەواڵی شاژنە بەڵقیسی بۆ هێنا، لە هەواڵەکەی کۆڵیەوەو خێرا بڕیاری نەدا.. ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ النمل. واتە: (بەڕاستی من بۆم دەرکەوت ئافرەتێك فەرمانڕەواییان دەکاتو لە هەموو جۆرە دەسەڵاتو نازو نیعمەتێکی پێبەخشراوە، تەختێکی پادشایەتی گەورەشی هەیە.. بینیم خۆیو قەومەکەی سوجدە بۆ خۆر دەبەن لە جیاتی خودا، شەیتان کارو کردەوەی چەوتیانی بۆ ڕازاندوونەتەوە، بەو هۆیەوە ڕێبازی ڕاستو دروستی لێگرتوون، بۆیە ئەوانە ڕێنموویی وەرناگرن)..

ئەی سولەیمان چی وت؟

یەکسەر نەیووت، دەی هێزو سوپا ئامادە بکەنو هێرش بکەنە سەریانو ماڵو حاڵیان بە سەردا بڕوخێنن، بەڵکو فەرمووی: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾﴾ النمل. واتە: (ئێمە لەمەودوا لەو گوفتارەی تۆ دەکۆڵینەوە، تا بزانین ڕاست دەکەیت یان لە ڕیزی درۆزنانیت)..

هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ ئەم ئایەتە پیرۆزەی بە سەر هاوەڵانیدا دەخوێند، کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾﴾ الحجرات. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێمەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەکو ئازارو ناخۆشیو گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بە نەزانی، جا دوایی پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەستاون)..

ڕوون کردنەوەو بەدواداچوون کارێکی زۆر گرنگەو نابێت لە بڕیارداندا پەلە بکەین.. ئیمامی عومەرﷺ نوێنەرێکی نارد بۆ ئەو شارەی عێراقو فەرمانی پێکرد، کە پرسیاری

سەعدﷺ لە خەڵکەکە بکاتو لە ڕاستیو دروستی ئەو هەواڵانە ئاگاداری بکات..
نوێنەرەکە گەیشتە لای سەعدو لە هۆکاری هاتنەکەی ئاگاداری کردو وتی: سەعد بۆ ئەوەی لە ڕاستو دروستی ئەو هەواڵانە دڵنیا بم، وەرە لەگەڵم دەچین بۆ مزگەوتێکو نوێژەکەشمان دەکەینو پرسیاریش لە خەڵکی دەکەم..
لە دوای هەر نوێژێکو هەر جارەی لە مزگەوتێکیش پرسیاری لە خەڵکەکە دەکردو، خەڵکەکەش جگە لە چاکەو باشەی سەعدﷺ هیچی تریان نەدەوت.. نوێنەرەکە هەموو جارێکیش دەیوت: ئەی خەڵکینە، من نوێنەری ئیمامی عومەرمو لە لایەن ئەوەوە هاتووم، هەر کەسێك گلەییەك، یان هەر ڕەخنەو نارەزاییەکی هەیە، با دەری ببڕێت..
بەڵێ.. مزگەوت مزگەوت دەگەڕان، تا گەیشتنە مزگەوتێکو هەندێك شت ڕوویدا، کە بووە هۆی ئەوەی سەعد دەستی بەرز بکاتەوەو دۆعا بکات.. سەعدو نوێنەرەکە گەیشتنە ئەو مزگەوتەو لە دوای نوێژ، نوێنەرەکە خۆی ناساندو وتی: لە لایەن ئیمامی عومەرەوە هاتوومو چ سکاڵایەکتان لە سەعد هەیە دەری ببڕن..
خەڵکەکە هەبوو دەیوت: بەڕاستی کار بەدەستێکی زۆرباشە.. هەیان بوو دەیوت: سەعد هاوەڵی پێغەمبەری خودایەﷺ، مایەی شکۆدارییە کە کاربەدەستی ئێمەیە.. هەموو لێی ڕازی بوونو باسی چاکەیان دەکرد..
نوێنەرەکە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای ئیمامی عومەرﷺ، فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە پەروەردگار جگەلەم قسانە، هیچ قسەیەکی ترتان نیە؟
لەم کاتەدا کەسێك هەستاو وتی: مادام بە خودا سوێندت داین، دەبێت لەگەڵت ڕاستگۆ بین..
نوێنەرەکەش دەڵێت: چیت هەیە بیڵێ.. پیاوەکە دەڵێت: سەعد بە یەکسانی شتومەك بە سەر خەڵکیدا دابەش ناکات.. لە دادگەریشدا دادگەر نیە.. لەگەڵیشمان دەرناچێت بۆ غەزاو کەسێکی ترسنۆکە، ئێمە دەجەنگینو ئەویش دادەنیشێت..
ئایا ئەم قسانە ڕاستن؟!
سەعدﷺ تاکە هاوەڵە کە پێغەمبەری خوداﷺ لە جەنگی ئوحوددا، کاتێك ویستی سەرکەوێتە سەر شاخەکە بۆ ئەوەی شوێنێکی گونجاو بدۆزێتەوەو خەڵکەکەش لە شەڕدا بوونو سەعدیش بەردەوام پارێزگاری لە پێغەمبەری خوداﷺ دەکردو بە تیر هاویشتن، بێباوەڕانی لێ دوور دەخستەوە، بۆیە پێغەمبەری خوداشﷺ پێی دەفەرموێت: ئەی سەعد باوكو دایکم بەقوربانت بن، تیر بهاوێژە. (رواه البخاري)..
سەعد تاکە هاوەڵە کە پێغەمبەری خوداﷺ پێی بفەرموێت: دایکمو باوکم بەقوربانت بن، کەچی ئەو پیاوە پێی دەڵێت: کەسێکی ترسنۆکە!!

سەعدﷺ سەری بەرز دەکاتەوەو سەیرێکی پیاوەکە دەکاتو دەزانێت کە ئەو پیاوە، بەم قسانە ستەمی لێدەکات، دەشیزانی خۆی کەسێکە خواردنو خواردنەوەی حەڵاڵو پاکەو دۆعای گیرایە، هەر بۆیە دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: پەروەردگار، ئەگەر ئەم پیاوە درۆ دەکاتو ئەم قسانە بۆ ناوبانگو ڕووپامایی دەکات، تەمەنی درێژ بکەیتو هەژار بکەوێتو تووشی تاقیکردنەوەی بکەیت، پاشان ڕۆیشتو فەرمووی: با ئەم قسانە لە نێوان منو تۆدا بمێنێت.. خودای گەورە نهێنی منو تۆش دەزانێت.. ئاگاداری ڕابوردووی منو ڕابوردووی تۆشە.. من خودام بەسەو خودا تۆڵەی من لە تۆ بستێنێت.. هیچ دەسەڵاتو بەرپرسیارییەکیشم ناوێت..

سەعدﷺ وازی لە پلەو پایەکەی هێنا، بەڵام دۆعاو پاڕانەوەکەی پیاوەکەی گرتو گرفتاری کرد.. سەعدﷺ مرد، بەڵام پەروەردگار زیندووەو هەر دەمێنێت.. ئەو پیاوە ئەوەندە تەمەنی زۆر بوو، بە تەواوی پیر ببوو، تەنانەت برۆکانی هاتبوونە سەر چاویو دایان پۆشی بوو، زۆریش هەژارو نەدار بوو، دەستی پان دەکردەوەو سواڵی دەکرد، کاتێك ئافرەتانیش بە لایدا تێدەپەڕین، دەستی بۆ دەبردن، ئەوانیش بە سەرسامیەوە دەیان وت: شەرم ناکەیت؟! خەجاڵەت نابیت؟! ئەگەر گەنجێك ئەم کارە بکات، ناشیرینەو دەچین بە گژیدا، دەی دەبێت بۆ پیرێکی وەکو تۆ چەندە ناشیرینو ناحەز بێت؟!

پیاوەکەش لە وەڵامدا دەیوت: چی بکەم.. دۆعاو پاڕانەوەی پیاوچاکێکی وەك سەعدم لێ گیرا بووە، وا تووشی ئەم هەموو نەهامەتیە بووم..

بەڵێ.. با خواردنو خواردنەوەت پاكو حەڵاڵ بێت، دڵنیابە پاڕانەوەکانت گیرا دەبن.. پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات لێی بپاڕێینەوەو لە هەمان کاتیشدا پەیمانمان دەداتێ، وەڵامیمان بداتەوەو پاڕانەوەکانمان گیرا دەکات، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ ...﴿٦٠﴾ ﴾ غافر. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوارتان بۆ من بهێنن: ئەوە من دۆعاو نزاتان گیرا دەکەم)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ...﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعراف. واتە: (هەر بۆ خودایە هەموو ناوە جوانو پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعاو نزا بکەنو هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن)..

پەروەردگار فێری ناوە پیرۆزەکانی خۆی کردووین، بۆ ئەوەی بەو ناوانە داوای لێبکەین.. بپاڕێوەو بڵێ: ئەی (غفور) لێم خۆشبە.. ئەی (شافی) شیفام بدە.. ئەی (غنی) سەروەتو سامانم پێببەخشەو دەوڵەمەندم بکەو هەروەها..

بەڵێ.. پەروەردگار پەیمانیداوە، پاڕانەوەکانمان وەربگرێت، بەڵام بابەتەکە هەر ئەوەندە نیەو کێشەکە لێرەدا نیە، بەڵکو جاری وا هەیە لە نێوان ئێمەو گیرابوونی




پاڕانەوەکانماندا ڕێگرییەك هەیە، گەورەترین ڕێگریش، حەڵاڵ نەبوونی خواردنە.. یان بەردەوام بوونە لە سەر مادده هۆشبەرەکان، یان خواردنەوەی عەرەق.. کەسێك لە سەر ئەم کارە حەرامانە بەردەوام بێت، چۆن دەبێت گلەیی بکاتو بڵێت: خودا وەڵامی من ناداتەوەو پاڕانەوەکانم وەرناگرێت؟!

پێغەمبەری ئازیزﷺ دەفەرموێت: ((من مات مدمن خمر لقي الله كعابد وثن)). رواه البخاري. واتە: (هەر کەسێك بمرێتو لە سەر عەرەق خواردن بەردەوام بوو بێت، وەکو بت پەرستێك دەگاتەوە بە خودای پەروەردگار)..

هەروەها دەفەرموێت:((من شرب الخمر في الدنيا، كان حقاً على الله أن يسقيَهُ من الخبال يوم القيامة)). رواه مسلم. واتە: (هەر کەسێك لە دونیادا عەرەق بخوات، حەقی خودایە کە لە کێمو زوخاوو پاشەڕۆی دۆزەخییەکانی دەرخوارد بدات)..

جاری وا هەیە خواردنی ماڵی خەڵکی، یان ستەم کردن لە ژێر دەستەکانت، لە کارگوزارەکانت، لە کارمەندەکانت، دەبێتە هۆی گیرا نەبوونی پاڕانەوەو دۆعاکانت..

* کەسێك پێی ڕاگەیاندمو وتی: یا شێخ برایەکم حەوت ساڵە کارگوزارێکی لایە، موچەکەی نەداوەتێ.. نایەڵێت سەردانێکی کەسوکارەکەشی بکات ؟!

براکەم ئافرەتێك لە سەر بەندکردنی پشیلەیەك چووە ئاگرەوە، ئەی کەسێك ستەم لە بەندەیەکی خودا بکات، دەبێت حاڵی چۆن بێت؟! براکەم ئەگەر جولەکەیەك لە لات کار بکات، پێویستە مافی خۆی بدەیتێو ستەمی لێنەکەیت..

بەڵێ.. خواردنو خواردنەوەت با حەڵاڵ بێت، پاڕانەوەو دۆعاکانت وەرگیراو دەبن.. من بە هەموو کوڕو کچەکانم، براو خوشکەکانم دەڵێم: ئاگاداری عەرەق بن، چونکە دایکی هەموو پیسیو تاوانەکانە.. ئاگاداری جگەرە بن، چونکە جگەرە پیسە، پەروەردگار شتە پاکەکانی حەڵاڵ کردووەو شتە پیسەکانی حەرام کردووە.. ئاگاداری دزیو خواردنی ماڵی خەڵکیو خواردنی حەرام بن.. با پاڕانەوەکانتان وەرگیراو بن..

پەروەردگار خواردنو خواردنەوەمان حەڵاڵ بکەیتو پاڕانەوەکانمان وەرگیراو بن..

آمین..





# یاخی بووانیش پێویستن..

* باسی پیاوێك دەكەین، پیاوێكی موسڵمان بوو، بەڵام لە سەردەمی نەفامیدا زۆر هۆگری عەرەق خواردنەوە بوو، كاتێك باوەڕی هێناو موسڵمان بوو، هەر حەزی لە عەرەق خواردنەوە هەبوو، چەندین جار بە هۆی عەرەق خواردنەوە سزا دەدراو دوبارە دەگەڕایەوە سەری، ئەم پیاوەش (ئەبو مەحجەنی سەقەفی) بوو..

جارێك لە جاران كاتێك بانگی موسڵمانان كرا بۆ ئەوەی بچن بۆ جەنگی قادسیەو كوشتاری فارسەكان بكەن، ئەبومەحجەنیش لەگەڵیان كەوتە ڕێ.. كاتێك گەیشتنە قادسیە، ڕۆستەمی سەركردەی فارسەكان لەگەڵ سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص ﷺ كەوتنە گفتوگۆو نامەو نامەگۆڕینەوە، واتە یەكسەر جەنگ دەستی پێنەكرد..

ئەبومەحجەن ئەم هەلەی قۆستەوەو چووە شوێنێكی دوورەپەرێزو دەستی بە عەرەق خواردنەوە كرد.. كاتێك سەعد ﷺ بەمەی زانی دەستو قاچی ئەبومەحجەنی بەستو لە خێمەیەكدا بەندی كرد..

بەڵێ جەنگو كوشتار دەستی پێكرد.. دەنگو سەدای ئەسپو چەخماخەی شیرو تیر بەرزبۆوە.. دەرگای بەهەشت بە ڕووی شەهیدانی ڕێگەی خوادا كرایەوە..

ئەبومەحجەن كاتێك گوێی لە حیلە حیلی ئەسپو شریخەی شمشێر بوو، زۆر ناڕەحەت بوو، زۆریش هەوڵیدا لەو كۆتو بەندەی بە دەستو قاچیەوەیەتی خۆی ڕزگار بكات، بەڵام نەیتوانیو بۆ ڕزگاربوونو بەدەست هێنانی پلەی بەرزی شەهیدی هەر دەینالاند، پاشان بە دەنگێكی بەرز هاوارێكی كرد، خێزانەكەی سەعد ﷺ وەڵامی دایەوەو وتی: چیت دەوێت؟!

ئەبومەحجەنیش وتی: لەم كۆتو بەندە ڕزگارم بكەو ئەسپەكەی سەعدیشم بدەرێ، دەچم بۆ جەنگی بێباوەڕان، ئەگەر پەروەردگار شەهیدی پێبەخشیم، ئەوا ئەوەم دەست دەكەوێت كە دەمەوێت، ئەگەر مامەوەو نەشكوژرام، پەیمان بێت بێمەوەو كۆتو بەندەكان بكەرەوە دەستو قاچم..

ئەبومەحجەن زۆر داوای لێكرد، هەتا ڕازی بوو، خۆی حازر كردو دەمو چاویشی پێچا، بۆ ئەوەی كەس نەیناسێتەوە، پاشان وەكو شێر لە سەر پشتی ئەسپەكەی سەعد ﷺ بۆ ناو جەنگەكە دەرچوو.. خۆی كرد بە ناو سوپای بێباوەڕانداو خۆی بە ئیسلامەكەی فرۆشت..

بەڵێ.. شەیتان نەیتوانی لە جیهادو تێکۆشان ساردی بکاتەوەو بەسەریدا زاڵ بێت.. موسڵمانان سەریان لەم سوارە سوڕماو کەسیش نەیدەناسی!!

هەندێکیان دەیان وت: لەوانەیە ئیمامی عومەرﷺ هێزو سوپای تری بۆ پشتیوانیمان ناردبێت!! هەندێکی تریان دەیان وت: لەوانەیە ئەو سوارە فریشتەیەك لە فریشتەکان بێت!!

ئەبومەحجەن زۆر ئازاو دلێرانە لە دژی بێباوەڕان دەجەنگیو بەبێ هیچ ترسو دوودڵییەك خۆی دەکرد بە نێوان سوپای بێباوەڕانداو ڕیزەکانی لێك دەپچڕاندن..

سەعدﷺ بەهۆی بوونی برینێك لە قاچیدا، نەیتوانی بەشداری جەنگەکە بکات، بەڵکو لە دوورەوە چاودێری جەنگەکەی دەکرد.. کاتێك چاوی بەو سوارە نەناسراوە کەوت، سەرسام بوو.. زۆر بە وردی چاودێری دەکرد، پاشان لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەم هەڵمەتو ئازایەتیە لە ئەبومەحجەنو ئەسپەکەش لە ئەسپەکەی خۆم دەچێت!!

سەیرە!! ئەبومەحجەن بەند کراوەو ئەسپەکەشم بەستراوەتەوە!!

کاتێك جەنگەکە کۆتایی هات، ئەبومەحجەن گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆییو لە سەر پەیمانەکەی خۆی، دەستو قاچی بە کۆتو بەند بەسترایەوە..

سەعدﷺ کاتێك چوو بۆ لای ئەسپەکەی، لەبەر هیلاکیو ماندوویێتی، هەستی کرد بەشداری جەنگەکەی پێکراوە، پاشان چوو بۆ لای ئەبومەحجەنو بینی برینەکانی خوێنی لێدەچۆڕێو چاوەکانی فرمێسکیان تێدا قەتیس ماوە، ئا لەم کاتەدا ئەبومەحجەن دەڵێت: ئەی سەعد، سوێند بە خودا ئیتر لەمەودوا هەرگیز عەرەق نەخۆم..

سەربەرزی بۆ ئەبومەحجەن..

بەڵێ.. کەوتە نێو تاوانو گوناهـ، بەڵام گوناهـو تاوانەکانی لە دەریای چاکەو تێکۆشانەکانیدا نقوم بوون.. چاکەکانی، خراپەکانی داپۆشی..

سەعدیشﷺ کاتێك ئەم جوامێرییەی لە ئەبومەحجەن بینی، وتی: سوێند بە خودا ئیتر منیش لەمەودوا سزات نەدەم..

پێغەمبەری خوداﷺ ڕەچاوی لایەنە باشو چاکەکانی، یان جوانەکانی هاوەڵانی دەکردو هانی ئەوەی دەدان چاکەکانیان زیاتر بکەنو خراپەکانیان کەم بکەن..

بۆ نمونە: ئەگەر هەڵەی کەسێکی عەرەق خۆر ٧٠٪ بێتو چاکەکانی ٣٠٪ بێت، ئەو ٣٠٪ یەش بریتی بێت، لە خۆشویستنی خوداو پێغەمبەرەکەیو ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوو بەخشینو پەروەردە کردنی منداڵەکانیو چاکەکردن لەگەڵ باوکو دایك، لێرەدا دەبێت هانی بدەین ئەو لە٣٠٪ یەی چاکەکانی بەرز بکاتەوەو لە٧٠٪ی خراپەکانی کەم

بکاتەوە، نەك هەموو جارێ ببیبینینو پێی بڵێین: تۆ عەرەق خۆریو دوورکەوەرەوە، ئەو کاتە گوناهەکەی لە لا گەورەتر دەبێت..

بەڵکو پێویستە هانی بدەینو کاتێك بینیمان پێی بڵێین: ڕاستە تۆ کەوتوویتەتە هەڵەو تاوانەوە، بەڵام سوپاس بۆ خودا تۆ خاوەنی باوەڕێکی، بە یارمەتی خودا واز لە خواردنەوەی عەرەق دەهێنی.. تۆ لەگەڵ باوكو دایکتدا زۆر باشی، پشت بە خودا بە هۆی پاڕانەوەکانی ئەوانەوە واز لە عەرەق خواردن دەهێنیت.. تۆ نوێژ دەکەیت، بە یارمەتی خودا نوێژەکانت ڕێگریت لێدەکەن لە ئەنجامدانی کاری خراپەو لە سەرووی هەمووشیانەوە وازهێنان لە عەرەق خواردن، کاتێك بەم شێوەیە قسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەین، بە دڵنیاییەوە هانیان دەدەین بۆ ئەوەی بەرەو چاکە هەنگاو بنێنو واز لە گوناهو خراپە بهێنن..

* یەکێك لە هاوەڵان ناوی عبدالله بوو، ئەم پیاوە لە ئارامگرتندا نازناوی گوێدرێژیان لێنا بوو، ئەم نازناوانەش لە کۆندا مایەی کەموکوڕی نەبوو، هەروەك ئێستا هەندێك کەس بۆ نمونە: ناویان (نمیر)ـە واتە: پڵنگ، ئەمە مانای ئەوە نیە بە ناوی ئاژەڵێکی دڕندەوە، ناونرا بن، بەڵکو لێرەدا بەهۆی ئازایەتی پڵنگەوە ئەو ناوەیان لێنراوە..

ئەم پیاوەش بەهۆی ئارامگرتنیەوە، ئەو نازناوەی بە سەردا درا بوو، زۆر زۆر پێغەمبەری خودای ﷺ خۆش دەویست، زۆرجار حەزی دەکرد دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خودا ﷺ بکات، بەڵام کەسێکی هەژارو دەست کورت بوو.. ڕۆژێك لە بازاڕ چاوی بە سەر کەلوپەلی فرۆشیارەکاندا دەگێڕا، لەپڕ چاوی چووە سەر شتێکو بە لایەوە چاکو جوان بوو، هەر بۆیە کڕیو بە فرۆشیارەکەی وت: شوێنم بکەوەو وەرە لەگەڵم با پارەکەت بدەمێ..

فرۆشیارەکە شوێنی کەوت، هەتا گەیشتنە ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ.. پیاوەکە لە دەرگایداو بە پێغەمبەری خودای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم دیارییە پێشکەش بە تۆ بێت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دیارییەکەی وەرگرت، پاشان پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پارەکەشی بدە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی بە دیاری بۆت نەهێناوم؟!

پیاوەکە دەڵێت: بەڵێ.. بە دیاری بۆم هێناوی، بەڵام پارەکەیم پێنەبوو، زۆریشم حەز دەکرد بە دیاری بۆتی بهێنم..

پێغەمبەری خوداش ﷺ پارەکە دەدا بە فرۆشیارەکە..

پەیوەندی پێغەمبەری خودا ﷺ بەو پیاوەوە، پەیوەندییەکی زۆر جوانو بەرز بوو، بەڵام ئەو پیاوە لە سەردەمی نەفامیدا لە سەر عەرەق خواردن بەردەوام بوو، هەر بۆیە دوای موسڵمان بوونیشی جاری وا هەبوو، خۆی پێنەدەگیراو دەگەڕایەوە سەر خواردنەوەی عەرەق.. کاتێك عەرەقی دەخوارد، دەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی سزای بدەن، سزایان دەداو دەڕۆی..

ڕۆژێك لە بەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ لەبەر خواردنەوەی عەرەق سزا دەدرا، دوای ئەوەی سزاکەی وەرگرت، ڕۆی..

یەکێك لە هاوەڵان وتی: بە نەفرین بێت، چەند زوو زوو دەیهێنن، واتە بە تەوای وازی لە خواردنەوەی عەرەق نەهێناوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، پێی دەفەرموێت: بە نەفرینی مەکە، سوێند بە خودا، خوداو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت..

ئەوەتا پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری لایەنە خێرو باشەکانی کرد، نەك تاوانو خراپەکانی..

بەڵێ.. ئەبومەحجەن بوو بە یەکێك لە جەنگاوەرە ئازاو تێکۆشەرەکانی ئیسلام، لەبەر ئەوەی شەیتان نەیتوانی ساردی بکاتەوەو وای لێبکات بە خۆی بڵێت: تۆ عەرەق دەخۆیت، لە کوێ دەتوانی خزمەتی ئیسلام بکەیت؟! چۆن دەتوانی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەی؟!

نەخێر.. پێویستە مرۆڤی موسڵمان، چی پێدەکرێت پێشکەشی ئاینەکەی بکات..

بە دڵنیاییەوە پێویستیمان بەو موسڵمانانەش هەیە کە تاوانی گەورەشیان ئەنجامداوە.. چی ڕێگری لەوە دەکات، کەسێك گوناهبار بێت بە گوناهی گەورەو لە هەمان کاتیشدا ببێتە هۆکارێك بۆ دروست کردنی مزگەوت.. ڕاستە گوناهبارە، بەڵام کاری دروست کردنی مزگەوتەکەش، دەبێتە هۆکارێك بۆ نزیك بوونەوەی لە پەروەردگارو سڕینەوەی گوناهەکانی، لەوانەشە دروست کردنی مزگەوتەکە ببێتە هۆی ئەوەی بە تەواوی بگەڕێتەوەو واز لەو گوناهە گەورەیە بهێنێت..

کەسێك ئەگەر نوێژیش نەکات، چ ڕێگرییەك هەیە بە خەڵکی بڵێت: عەرەق مەخۆنەوەو لە خودا بترسن.. هیچ ڕێگرییەك نیەو دەتوانێت، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکات، هەر چەندە خۆی چەندێك پابەند بێت بە ئاینەکەیەوە، کاریگەری لە سەر دەوروبەرو خەڵکی زیاتر دروست دەکات..

کێ هەیە هەرگیز خراپەو گوناهـ نەکات؟! کێ هەیە تەنها چاکە بکات؟! مرۆڤ هەر





چەندە گوناهو تاوانی هەبێت، پێویستە ئەم ئایەتە پیرۆزەی پەروەردگار لەبیر نەکات، کە دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ ...﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل. واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار، بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەتو دانایی‌و ئامۆژگاری جوانو بەجێ)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ فصلت. واتە: (جا کێ لەو کەسە جوان گفتارترو قسەی بەجێترە کە بانگەوازی کردووە بۆ لای خودا، کارو کردەوەی چاکیشی ئەنجامداوە، وتووشیەتی: بەڕاستی من لە ڕیزی موسڵماناندام).. پەروەردگار لەگەڵ ئێمەدا دەدوێت، دەی با ئێمەش بە پێی توانا، بانگەواز بۆ ئاینی پەروەردگار بکەین، بە هیوای ئەوەی لە گوناهەکانمان خۆش بێت..

* حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بە پیاوێك دەڵێت: فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەیت؟

پیاوەکە دەڵێت: نەخێر، لەبەر ئەوەی دەترسم فەرمان بە چاکە بکەمو خۆم نەیکەم، ڕێگریش لە خراپە بکەمو خۆم بیکەم، من گوناهو تاوانو سەرپێچیم هەیە..

حەسەنی بەصری دەڵێت: پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگار، شەیتان هەڵی خەڵەتاندوی.. کێ لە ئێمە بێ گوناهو بێ تاوانە؟! بەڵام پێویستە بیری خۆشمانو خەڵکیشی بخەینەوە، سا بەڵکو ببێتە هۆی ڕزگاربوونی کەسێك، پێویستە ڕێگە نەدەیت شەیتان یاریت پێبکات.. کاتێك بە کۆمەڵێك گوناهو تاوانەوە لە ماڵ دێیتە دەر، هەژارێك دەبینیتو یارمەتی دەدەیت، بەو یارمەتی‌و چاکەیە پاداشت دەدرێیتەوە.. کەسێك پێش چەند ساتێك خراپەیەك ئەنجام دەدات، ئەمە لێپرسینەوەی خۆی لە سەرە، بەڵام ڕێگر نیە لەوەی کارێکی خێرو چاکە ئەنجام بدات..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك بۆ جەنگو غەزا دەردەچوو، بە هاوەڵانی نافەرموو: کێ پاکو بێ گوناهە نیە، با لەگەڵمان دەرنەچێت.. ئەوانەی لەگەڵی دەردەچوون، فریشتە نەبوون گوناهو تاوانیان نەبێت.. پێغەمبەری خوداﷺ دەیزانی ئەو خەڵکە نەوەی ئادەمن، هەر بۆیە دەیفەرموو: ((كُلّ ابن آدم خطّاء، وخير الخطائين التوابون)). رواه البخاري. واتە: (هەموو نەوەکانی ئادەم هەڵەو تاوان دەکەن، بەڵام باشترینیان ئەوانەن کە دەگەڕێنەوەو واز لە گوناهو تاوان دەهێنن)..

کەواتە ئێستە هاوڕاین لە سەر ئەوەی لە قوتابخانە، لە زانکۆ، لە کارگە، لە فەرمانگە، لە بازاڕ، ئەگەر خۆشمان کەموکورتیەکمان تێدا بوو، دەبێت هەوڵی فەرمان

به چاکەو ڕێگری لە خراپە بدەین..

بۆ نمونە: ئەگەر ئافرەتێك جلوبەرگەکەشی شەرعی نەبوو، دەتوانێت بە هاوڕێکەی بڵێت: ڕاستە من بالآپۆش نیم، بەڵام واز لە نوێژەکانت مەهێنەو ئەنجامیان بدە، چونکە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((بين الرجل وبين الكفر والشرك، ترك الصلاة)). رواه البخاري. واتە: (نێوانی مرۆڤی موسڵمانو بێباوەڕو هاوەڵدانەر، بریتیە لە وازهێنان لە نوێژەکانی)..

هەروەها دەفەرموێت: ((العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة، فمن تركها فقد كفر)). رواه الترمذي. واتە: (پەیمانی نێوان ئێمەو بێباوەڕان بریتیە لە نوێژ، جا ئەوەی واز لە نوێژ بهێنێت، ئەوا بێباوەڕ دەبێت)..

ئەبومەحجەن تووشی گوناهێکی گەورە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیهێشت زیاتر شەیتان یاری پێبکاتو دەستی کرد بە تێکۆشانو کوشتارێکی زۆری بێباوەڕانی کردو ئاینی پەروەردگاری سەرخست.. داواکارم پەروەردگار ئێمەشو ئێوەش بۆ ئاینەکەی خۆی بەکار بهێنێت.. آمین..

# ئای چەندە چاکەی گەورەمان لە دەستداوە!!

* خەڵکی لە هەوڵدانیان بۆ بە دەست هێنانی پلە بەرزەکانی بەهەشت جیاوازن..

پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام هاوەڵانی هانداوە بۆ ئەوەی هەوڵی پلە بەرزەکانی بەهەشت بدەن.. کاتێك سەیری گەورەو بچوكو هەزارو دەوڵەمەندیان دەکەیت، بە تەواوی هەستی پێدەکرێت.. ئەوەتا هاوەڵێك دێتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، چ کارێك لە لای خودای پەروەردگار زۆر خۆشەویستە؟

بەردەوام بە دوای چاکترینو باشترین کاردا گەڕاون.. پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: نوێژکردن لە کاتی خۆیدا، کارێکە کە لە لای پەروەردگار زۆر خۆشەویستە. (رواه البخاري)..

کەسێکی تر دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕۆژی دواییدا کێ لە تۆوە زۆر نزیکە؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ((إن من أحبكم إليَّ وأقربكم مني مجلساً يوم القيامة، أحاسنكم أخلاقاً)). رواه البخاري. واتە: (بە دڵنیاییەوە خۆشەویسترینتانو نزیکترینتان لە منەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانەتانن کە خاوەنی ڕەوشتی بەرزو جوانن)..

پێش یەکێك لە جەنگەکان، یەکێك لە هاوەڵان دەپرسێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ پەروەردگار بە چ کارێکی بەندەکەی پێدەکەنێت؟

لە وەڵامدا پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((کاتێك خۆی بکات بەناو دوژمنانی گەمارۆدەردا))..

* یەکێك لەو هاوەڵانەش کە زۆر بە دوای کاری باشدا دەگەڕێتو حەز دەکات پاداشتی کردەوە چاکەکان لە دەست نەدات، عبداللەی کوڕی ئیمامی عومەرە‌رضي الله عنه..

عبداللەرضي الله عنه ڕۆژێك گوێی لە ئەبوهورەیرەرضي الله عنه دەبێت فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: ((من صلى على جنازة فله قيراط، ومن تبعها حتى دفن فله قيراطان)). رواه البخاري. واتە: (هەر کەسێك نوێژ لە سەر مردوویەك بکات خێرو پاداشتی قیراتێکی هەیە، هەر کەسێکیش شوێنی مردووەکە بکەوێت، هەتا دەینێژن، ئەوا خێری دوو قیراتی هەیە).. خێری قیراتێکیش بریتیە لە: خێرو چاکەیەك بە ئەندازەی کێوی ئوحود..

عبداللەرضي الله عنه یەکەم جاری دەبێت گوێی لەم فەرموودە پیرۆزە بێت، هەر بۆیە دەڵێت: هاوار بۆ تۆ ئەبوهورەیرە، ئەوە چیت وت؟!

ئەبوهورەیرەش‌ﷺ دەڵێت: سوێند بە خودا شتێکم وتووە، کە لە پێغەمبەری خودامﷺ بیستووە..

بێگومان کاتێك لەگەڵ مردوویەکدا دەچیت بۆ گۆڕستان، بیری مردنت دەکەوێتەوەو پەندو ئامۆژگارییەکی زۆری تیادایە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدان..

مردووی موسڵمانان مافی بە سەر براو خوشکەکانیەوە هەیە، هەر بۆیە پێویستە ڕێزی لێبگرن‌و لەگەڵیدا بن، هەتا دەینێژن، هەروەها پێویستە نوێژی لە سەر بکەن‌و داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار بۆ بکەن..

لەبەر ئەوەی عبداللهﷺ یەکەم جاری دەبێت ئەو فەرموودەیە ببیستێت، کەسێك دەنێرێت بۆ لای عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازیبێت) بۆ ئەوەی پرسیاری ئەو فەرموودەیەی لێبکات..

پیاوەکە دەڕواتو عبداللەشﷺ هەندێك وردە بەردی بە دەستەوە دەبێتو ئەمدیوو ئەودیوی پێدەکات، هەر چاوەڕێی پیاوەکە دەکات، تا بزانێت ئەو فەرموودەیە هەیە یان نا.. بیر لەوە دەکاتەوە بە درێژایی ئەم ساڵانەی ڕابوردوو، چەندێك پاداشتی لە دەستچووە..

پیاوەکە دێتەوەو دەڵێت: بەڵێ.. دایکی ئیمانداران دەڵێت: ئەو فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خوداﷺ بیستووە..

عبداللهﷺ وردە بەردەکان فڕێ دەداتو دەڵێت: پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگار، چەندێك خێرو چاکەمان لە دەستچووە؟!

ئەو مرۆڤەی هەوڵی ئەوە دەدات، کە کردارە چاکەکانی لە دەست نەچێتو بە لە دەستدانیان نارەحەتو غەمبار دەبێت، ئەوە مرۆڤێکی ڕزگار بووە..

* سەعیدی کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: زۆر هەوڵم دەدا لە نوێژی بە کۆمەڵ دوانەکەوم، جارێکیان نوێژێکی بە کۆمەڵم لە دەستچوو، جگەلە هاوەڵێکم کەس سەرەخۆشی لێنەکردم، خۆ ئەگەر منداڵێکم بمردایە، سەدان کەس سەرەخۆشییان لێدەکردم.. ئەم کەسانە لە دەستچوونی نوێژەکانیان بە کۆمەڵ، لە لا گەورەتر بوو، لە مردنی کچو کوڕەکانیان..

* کەسێکی تر کاتێك دەچێت بۆ مزگەوتەکەیان، دەبینێت، نوێژ تەواو بووە، دەچێت بۆ مزگەوتێکی تری نزیکیان، دەبینێت، ئەوانیش تەواو بوون، دەچێت بۆ چەند مزگەوتێکی ترو دەبینێت هەموویان تەواو بوون، بە ناچاری بە غەمو خەفەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو بیستو حەوت جار نوێژی عیشا دەکات، چونکە نوێژی بە کۆمەڵ بیستو حەوت جار، لە نوێژێك خێرو پاداشتی گەورەترە، کە

به تەنها ئەنجام درابێت..

ئەو کەسانە کاتێك پاداشتێکیان لە دەست دەچوو، بە ئاسایی وەریان نەدەگرتو نەیان دەوت: ئینجا چیە، خۆ ئێمە هەموو ڕۆژێك نوێژ دەکەین، با نوێژێکی بە کۆمەڵیشمان لە دەست بچێت؟! یان کاتێك پارمەتیدانی هەژارێکیان لە دەست بچووایە، نەیان دەوت: دەی خۆ ئێمە یارمەتی کەسانی ترمان داوەو خێرو چاکەی تر دەکەین؟!

نەخێر.. بەڵکو بە لە دەستچوونی خێرو چاکە، ناڕەحەت دەبوونو غەم دایدەگرتن..

ئەم پیاوە دەچێتەوە بۆ ماڵەوەو بیستو حەوت جار نوێژی عیشا دەکاتو پاشان لە غەمو خەفەتا خەوی لێدەکەوێت.. لە خەویدا خۆی لە سەر ئەسپێك دەبینێتو ئەو هاوەڵانەش کە ڕۆژانە لەگەڵیدا لە مزگەوت پێکەوە نوێژیان دەکرد بە هەمان شێوەی ئەم، لە سەر ئەسپ بوون، کاتێك ئەوان دەڕۆشتن، ئەمیش هەوڵی دەدا پێیان بگاتەوە، بەڵام نەیدەتوانیو دوادەکەوت..

یەکێك لە هاوەڵانی ئاوڕی لێ دەداتەوەو پێی دەڵێت: خۆت ماندوو مەکە پێمان ناگەیتەوە، چونکە ئێمە نوێژی عیشامان بە کۆمەڵ ئەنجامدا!!

پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام هانی هاوەڵانی دەدا، بۆ ئەوەی بە دوای خێرو چاکەدا بگەڕێن، هەر بۆیە کاتێك عبداللەی کوڕی عومەرﷺ تەمەنی پانزە ساڵی تێنەپەڕاند بوو، پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگاری دەکردو پێی دەفەرموو: ((ئەی عبدالله وەکو فلانە کەس مەبە، کە وازی لە شەونوێژ هێناوە)). (رواه البخاري)..

* عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصﷺ بەردەوام جگەلە دوو جەژنەکە بەڕۆژوو دەبوو.. شەوانیش تا بەیانی شەونوێژی دەکرد.. لە شەوو ڕۆژێکیشدا هەموو قورئانی دەخوێند..

پێغەمبەری خوداﷺ بانگی دەکاتو پێی دەفەرموێت: ئەی عبدالله، تۆ بە درێژایی شەو، شەونوێژ دەکەیت؟!

دەڵێت: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: سێ یەکی شەو شەونوێژ بکە. (رواه البخاري)..

پێغەمبەری خوداﷺ ویستی بە کەم کردنەوەی شەونوێژەکە وا لە عبدالله بکات بێزار نەبێتو بتوانێت لە سەر شەونوێژێك بەردەوام بێت، کە پێی بکرێتو وازی لێنەهێنێت..

* حەسەنی بەصری کاتێك دایکی دەمرێت، زۆر دەگریەت.. پێی دەڵێن: بۆچی ئەوەندە دەگریەیت، خۆ تۆ خۆت فێری ئارامگرتنمان دەکەیت؟!

لە وەڵامدا دەڵێت: سوێند بە خودا بۆ ئەوە دەگریم، باوكو دایك وەکو دوو دەرگای

بەهەشت وان، من دەرگایەکیانم لێداخراو تەنها دەرگایەکیانم ماوە..
دووبارە پێغەمبەری خوداﷺ بە عبداللەی فەرموو: هەموو ڕۆژێك هەموو قورئان دەخوێنیت؟!
عبدالله دەڵێت: بەڵێ..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: بەڵكو مانگی جارێك هەموو قورئان بخوێنە..
عبداللهرضي الله عنه دەڵێت: توانای لەوە زیاترم هەیە..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی لە هەفتەیەکدا هەموو قورئان بخوێنە..
عبدالله رضي الله عنهدەڵێت: توانای زیاترم هەیە..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی هەر سێ ڕۆژ جارێك هەموو قورئان بخوێنە..
عبداللهرضي الله عنه دەڵێت: توانای لەوە زیاترم هەیە..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: نا لەوە کەمتر ئەگەر قورئانی تێدا بخوێنیت، لێی تێناگەیت، بۆ ڕۆژووەکەشی پێی دەفەرموێت: هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبە.. (١٣، ١٤، ١٥)ی هەموو مانگێك..
عبداللهرضي الله عنه دەڵێت: توانای زیاترم هەیە..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی دووشەممانو پێنج شەممان بە ڕۆژووبە..
عبداللهرضي الله عنه دەڵێت: زیاتر دەتوانم..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی ڕۆژ نا ڕۆژێك بە ڕۆژووبە..
عبدالله رضي الله عنهدەڵێت: توانای زیاترم هەیە..
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: نا.. لەمە باشتر نیە، ئەوە ڕۆژووی داود پێغەمبەرەعليه السلام، داود عليه السلامڕۆژ نا ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو. (رواه البخاري).
ئیتر عبداللهرضي الله عنه لە سەر ئەو بەندایەتیو خوداپەرستیە بەردەوام بوو..
بەڵێ.. ئەو کەسانە کاتێك خێرو چاکەیەکیان لە دەست دەچوو، هەناسەیان بۆ هەڵدەکێشا.. جاری وا هەبوو لە کاتی لە دەستچوونی کارێکی باشدا، دەستیان دەکرد بە گریان، بە تایبەتی ئەگەر لە دەستچوونی ئەو کاروبارانە، پەیوەندییان بە حەجو عومرەوە هەبووبێت..
پێغەمبەری خوداﷺ ئەو کاتەی دەچن بۆ حەج، دەچێت بۆ لای عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت)، دەبینێت دەگریەت!!
پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: ئەوە چیتە؟! تووشی بێنوێژی بوویتو نەتتوانی عومرەکەت تەواو بکەیت؟!
عائیشە دەڵێت: بەڵێ.. هاوەڵەکانم حەجیشو عومرەش دەکەن، ئەوسا دەگەڕێنەوە،





کەچی من تەنها حەج بکەم؟!

سەیر بکەن بیرکردنەوە لە لە دەستچوونی پاداشتی عومرە، دایکی ئیمانداران دەخاتە گریان.. حەفصەو ئوم سەلەمەو زەینەب، حەجو عومرەش دەکەن ئەوسا دەگەڕێنەوە، کەچی ئەم تەنها حەج بکاتو بەس؟!

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك فرمێسکەکانی دایکی ئیماندارانی بینی، دڵخۆش بوو بەوەی کە چەندێك خەمی لە دەستچوونی خێرو پاداشتی هەیە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی بە عبدالرحمانی برای کرد، لەگەڵ خۆی بیبات بۆ ناوچەی (تنعیم)، کە ئێستا ناسراوە بە مزگەوتی عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت)و شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەککەو ئەو کەسانەیە کە لە شوێنی دوورەوە دێنو ئەگەر بیانەوێت عومرەی تر ئەنجام بدەن، دەچن لەو شوێنە ئیحرام دەبەستن..

بەڵێ.. دایکی ئیمانداران لەگەڵ براکەیدا دەچێتو ئیحرام دەبەستێتو دێتەوەو عومرەکەی تەواو دەکات..

خوشكو برایان، هەر کەسێك غەم بۆ لە دەستچوونی پاداشت بخوات، ئەوا پشت بە خودا ئەو کەسە کەسێکی سەرفراز دەبێت..

کەسێك کە سوور بێت لە سەر ئەوەی نوێژە سوننەتەکانی لە دەست نەچێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە بۆ لە دەست نەچوونی نوێژە فەرزەکانی سوورتر دەبێت..

* ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودامﷺ بینی لە دوای نوێژی عەسر نوێژی دەکرد، لە لام سەیر بوو!! چونکە کاتی نوێژکردن نەبوو، پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگری کرد بوو، لە دوای نوێژی عەسر نوێژ بکرێت..

دایکی ئیمانداران دەڵێت: کەنیزەکێکم لە لابوو، پێم وت: بچۆ بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئوم سەلەمە دەڵێت: من گوێم لێت بووە، کە ڕێگریت کردووە لەوەی لەم کاتەدا نوێژ بکرێت، ئەی چۆن تۆ نوێژ دەکەیت؟!

کەنیزەکەکە دەچێتو قسەکان بە پێغەمبەری خوداﷺ دەڵێت، لە دوای تەواو بوونی نوێژەکەی، پێغەمبەری خوداﷺ بە دایکی ئیمانداران دەفەرموێت: نوێنەرانی هۆزی عبد قیس هاتن بۆ لامو سەرقاڵیان کردمو دوو ڕکات سوننەتی دوای نوێژی نیوەڕۆم نەکرد، ئەوا ئێستا ئەو دوو ڕکاتەم ئەنجامدا. (رواه البخاري)..

پێغەمبەری خوداﷺ هاوەڵانی لە سەر ئەوە ڕادەهێنا، کە پاداشتو چاکەیان لە دەست نەچێت، ئەگەر کاتەکەشی تێپەڕی، دەتوانن بیگێڕنەوە..

* ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ یەکێك لە هاوەڵانی دەبینێت لە دوای نوێژی بەیانی،

نوێژ دەکات.. ئەو کاتەش یەکێکە لەو کاتانەی کە ڕێگری لێکراوە نوێژی تێدا بکرێت، پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: ئەوە چی دەکەیت؟!

هاوەڵەکەش دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فریا نەکەوتم سوننەتی پێش نوێژی بەیانی بکەم، ئەوا ئێستا ئەنجامی دەدەم..

پێغەمبەری خوداﷺ دانی پێداناو ڕێگری نەکرد..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك خەوی لێکەوت، یان بیری چوو نوێژەکەی بکات، هەر کات بیری کەوتەوە با ئەنجامی بدات. (رواه البخاري)..

پێغەمبەری خوداﷺ ئەگەر لە شەودا بەهۆی نەخۆشیەوە، خوداپەرستییەکی لە دەست بچووایە، ئەوا بەیانی ئەنجامی دەداو دەیگێڕایەوە..

دەی پێویستە ئێمەش ئەو کەسانە بکەین بە سەرمەشقو پێشەواو ئەگەر خێرو چاکەیەکمان لە دەستچوو، ئاەو هەناسەی بۆ هەڵکێشینو هەوڵ بدەین جارێکی تر لە دەستی نەدەین، دەبێت هەوڵ بدەین کارە چاکەکان لە کاتی خۆیاندا ئەنجام بدەین، چونکە هەندێك کات هەیە نوێژ تیایدا زۆر خێرە، هەندێك کات هەیە عومرە کردن تیایدا زۆر خێرە، هەندێك کات هەیە دوعاو پاڕانەوە تیایدا زۆر خێرەو هەروەها..

داواکارین پەروەردگار باوەڕمان زیاد بکاتو یارمەتیمان بداتو ئێمەشو ئێوەش لە چاکەکاران بژمێرێت.. آمین..

# ڕێزی زانایان..

پەروەردگار ڕێزی زانایانی بەرز ڕاگرتووە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران. واتە: (خودای گەورە خۆی شایەتیداوەو دەریخستووەو سەلماندوویەتی کە بەڕاستی جگە لەو هیچ خودایەکی تر نیە کە شایانی پەرستن بێت، هەروەها فریشتەکانو خاوەن زانستەکانیش (پێغەمبەرانو زانایان) کە بە ڕێگەیەکی ڕاستو دروست دەیسەلمێنن خودا هەمیشە دادوەری ڕەهایەو جگە لەو زاتە خودایەکی تر نیەو ئەو خودایەکی باڵادەستو دانایە).. شایەتیدانی زانایانی بە شایەتیدانی فریشتەکانەوە لکاندووە..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ...﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر. واتە: (بەڕاستی هەر زاناکان لەناو بەندەکانی خوادا، هەر ئەوان لە خودا دەترسن)..

زانایان ئەو کەسانەن، کە پەروەردگار هەڵیبژاردوونو ترسی خۆی خستۆتە دڵیانەوە.. ئەو سوودو کاریگارییانەی کە زانایانیش لە سەر ژیانو کۆمەڵگە هەیانە، کەسانی تر نیانە..

* ئیبن قەیم لە پەڕتوکی (مفتاح دار السعادة)دا دەڵێت: خەڵکی دەتوانن بە پێی ئەو ئەزمونەی کە هەیانە، خۆیان جێگەو ڕێگەو خانوو دروست بکەنو پێویستییان بە ئەندازیار نەبێت، ڕاستە لەم ڕۆژگارەی ئێستادا ئەندازیاران گرنگیەکی زۆریان هەیە، بەڵام ئەگەر ئەندازیاریش نەبێت، خەڵکی دەتوانن کاری خۆیان ڕایی بکەن، چونکە زۆر کەس هەن خۆیان خانووەکانیان دروست کردووەو ژیانیشیان تێدا بردۆتە سەرو ئەندازیاریشیان پێویست نەبووە..

جاری وا هەیە خەڵکی بە بێ پزیشکیش دەتوانن بژین، لەبەر ئەوەی لە دێرین زەمانەوە خەڵکی لە سەر زۆرێك لەو شتانە ڕاهاتوونو دەزانن کام شتانە سوود، یان زیانیان پێدەگەیەنێت، دەزانن خواردنی ئەم خواردنە زیان بەخشەو ئەوی تریان بەسوودە.. تەنها زانایانی بواری شەرع نەبێت، کۆمەڵگە بەبێ ئەوان هەڵناکاتو ناتوانێت بەبێ ئەوان درێژە بە ژیان بدات، لەبەر ئەوەی زانینی بنەما شەرعیەکان لە ڕێگەی ئەزمونەوە بە دەست نایەن، بەڵکو تەنها لە ڕێگەی نیگاو سروشی پەروەردگارەوە بە دەست دێن..

پەروەردگار نێردراوو پێغەمبەرانی خۆی بۆ مرۆڤەکان دەنێرێتو لە ڕێگەی ئەوانەوە پەیامی خۆی بە مرۆڤایەتی دەگەیەنێت، هەر بۆیە زانایان ڕێزو پلەوپایەی تایبەتی خۆیان هەیەو زانایانی ڕاستەقینەو پاك دەبن بە جێگرەوەو میراتگری پێغەمبەران،

تەنانەت لە ڕۆژی دواییشدا ڕێزو پلەوپایەی تایبەتیان هەیە، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((فضل العالم على العابد، كفضل القمر على سائر الكواكب)). رواه البخاري. واتە: (پلەوپایەی زانا لە سەر کەسانی تر، وەکو پلەوپایەی مانگ وایە بە سەر ئەستێرەکانی ترەوە)..

هەروەها دەفەرموێت: ((فضل العالم على العابد، كفضلي على أدناكم)). رواه البخاري. واتە: (پلەوپایەی زانا بە سەر کەسانی ترەوە، وەکو پلەوپایەی من وایە بە سەر بچوکترینو کەمترینتانەوە).. واتە: پلەوپایەی پێغەمبەری خوداﷺ چۆنە لە چاو کەمترینو بچوکترین کەس لە خەڵکی، پلەوپایەی زانان لەچاو خەڵکانی تردا ئاوایە.. سەیر بکە چ پلەوپایەیەکە؟!

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هەندێك لە هاوەڵانی بۆ یەکێك لە جەنگەکان دەنێرێت، دوای تەواوبوونی جەنگەکەو لە کاتی گەڕانەوەیاندا، یەکێکیان کە برینێك لە سەریدا دەبێت، شەو کاتێك دەخەوێت لەشی گران دەبێت، کاتێك خەبەری دەبێتەوە، دەڵێت: لەشم گران بووە، ئایا لەبەر برینەکەی سەرم دەتوانم خۆم نەشۆم؟

هاوەڵەکانی لە وەڵامدا دەڵێن: نەخێر ناتوانیو دەبێت خۆت بشۆیت، ئینجا نوێژەکەت بکەیت.. ئەو هاوەڵە خۆی دەشواتو بەهۆی برینەکەی سەرییەوە دەمرێت.. کاتێك دەگەڕێنەوەو دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺو هەواڵی مردنی هاوەڵەکەیانی بۆ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: خۆی شۆردو مرد؟!

ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: کوشتیان، خودا بیان کوژێت.. کوشتیان، خودا بیان کوژێت.. کوشتیان، خودا بیان کوژێت.. ئایا بۆ پرسیار ناکەن کە نازانن؟ بە دڵنیاییەوە چارەسەری نەزانی پرسیارکردنە.. پاشان فەرمووی: هەر ئەوەندە بەس بوو، هەردوو دەستی بدایە لە خۆڵێکی پاكو پاشان بیهێنایە بە دەمو چاوو هەردوو دەستیداو پەڕۆیەکی لە سەری بپێچایەو دەستی بە سەردا بهێنایە. (رواه البخاري)..

* ئیبن هوبەیرەی وەزیر، وەزیرێکی گەورەو خاوەن پلەوپایە بوو، زانایانی کۆ دەکردەوەو لە سەر بابەتە شەرعیو ئاینییەکان گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن..

ڕۆژێك لە دوای عەسر، کۆمەڵێك زانای کۆکردەوە، پاشان زانایەکی مالیکی دێتو لەگەڵیان دادەنیشێت.. زاناکان لەسەر بابەتێك گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە دەکەن، هەموو لەسەر ئەو بابەتە هاوڕا دەبن، تەنها زانا مالیکیەکە نەبێت..

زاناکان هەموو دەڵێن: بابەتەکە بەم شێوەیەیە، بەڵام ڕای پەسەندیش ئاوایە..

زانا مالیکیەکەش بە پێچەوانەی هەمووانەوە دەڵێت: نا ڕای پەسەند بەم شێوەیەیە..

وەزیرەکە سەرسام دەبێتو دەڵێت: هەموو زانایان لەسەر ئەو بۆچوونەن، تەنها تۆ بۆچوونی جیاوازت هەیە؟!

هەر چەند قسەی لەگەڵ دەکەن، زانا مالیکیەکە لەسەر بۆچوونەکەی خۆی سوور دەبێت، وەزیرەکە تووڕە دەبێتو دەڵێت: تۆ گوێدرێژیت؟!

زاناکە بێدەنگ دەبێت.. کاتێك دانیشتنەکە چۆڵ دەبێت، وەزیرەکە زۆر پەشیمان دەبێت.. چۆن ئەو قسەیەی بەو زانا بەڕێزە وت؟! لە تاو تینی غەمو خەفەت، شەوی لێنەدەڕۆیشتو خەوی لێنەدەکەوت..

سەیر بکە.. ئەوانە چۆن ڕێزی زانایانیان گرتووە؟! ڕێزی ئەو کەسانەیان گرتووە کە بۆ فێربوونی زانست لەسەر ئەژنۆ دانیشتوونو کاتی خۆیان لە فێربوونی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بەسەربردووە.. ئەو کەسانە پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت، نەك لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا قسەیان پێ بوترێت..

خەڵکینە ئاگاداربن، هەر نەتەوەیەك زاناکانی لەدەست بدات، ئەوا بە دڵنیاییەوە سەروەریو بەرزیو تەنانەت ئاینەکەشی لەدەست دەدات..

ئیبن هوبەیرە، بە درێژایی شەو غەمبارو دڵتەنگ دەبێت، بەیانی کاتێك ڕۆژ دەبێتەوە زاناکان کۆ دەکاتەوەو ڕێزێکی زۆر لەو زانایە دەگرێتو سەریشی ماچ دەکاتو دەڵێت: ئەی خەڵکینە، سوێند بە خودا لە تاو ئازاری ئەو قسەیەی کە کردم، خەو نەچۆتە چاوم.. پاشان داوای لێبوردنی لە زاناکە کرد.. زاناکەش لێی دەبورێت.. وەزیرەکە دەڵێت: پێویستییەکانت داوا بکە..

زاناکە دەڵێت: هیچ پێویستییەکم نیە..

وەزیرەکە دەڵێت: سوێندت دەدەم بە خودای گەورە، هیچ قەرزێکت لەسەر نیە؟

زاناکە دەڵێت: مادام سوێندت دام، بەڵێ هەندێك قەرزم لەسەر هەیە..

وەزیرەکە دەڵێت: دەی ئاگادارم بکە چەندێك قەرزاریت؟

زاناکە دەڵێت: سەد دینار قەرزارم..

وەزیرەکە دەڵێت: دەی ئەوە سەد دینار لە ماڵی تایبەتی خۆم بۆ قەرزەکەتو ئەوەش سەد دینار لەبەر ئەو قسە ناخۆشەی دوێنێ کردم.. دەی ئەو وەزیرە دەیتوانی فەرمان بکات، زاناکە بکوژن، لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵاتەشیدا، کەچی ڕێزی زانایانی لە لا دەبێتو زۆر ڕێزیان دەگرێت..

* زانایەکی تری بەڕێز بە ناوی سەعید حەلەبی، ئەم زانایە لەو زانایانە بوو، کە قاچی درێژ دەکرد، لەبەر ئەوەی دەستی درێژ نەدەکردو دەستی لە کەس پان نەدەکردەوە.. ئەم زانایە، زانایەکی گەورە بوو.. زۆر بێباك بوو لە دەسەڵاتداران..

هەر زانایەك زۆر لە دەسەڵاتداران نزیك بکەوێتەوەو دیاریو بەخشیشیان لێوەربگرێتو زۆر لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا دابنیشێت، ئەوا ناتوانێت بە ڕاستیو دروستی بۆچوونەکانی شەرع بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوەو لە فەتواکانیدا سەربەخۆ نابێت..

کاتێك یەکێك لە خەلیفەکان ئەم زانایەی بە دادوەر دامەزراند، هەندێك دیاری بۆ نارد، بەڵام وەرینەگرتو وتی: جگە لە موچەکەم هیچ شتێکی تر وەرناگرم..

خەلیفە پێی ڕاگەیاند کە ئەمە دیارییە..

سەعید حەلەبی لە وەڵامدا دەڵێت: ئەگەر دەتەوێت دیاریم بدەیتێ، ئەوا لە دادوەری لام بەرە..

خەلیفەش دەڵێت: نا هەر دادوەربە، پاشان خەلیفە دەڵێت: مادام دیارییەکانی وەرنەگرت، لە هیچ کێشەیەکدا لایەنگریمان ناکاتو حەق چۆن بێت، ئەوا بڕیار دەدات..

ئەم زانایە زۆر سەنگینو بەڕێز بوو.. ڕۆژێك لە مزگەوت دەرسی بە قوتابیەکانی دەوت، بەهۆی تەمەنیەوە، قاچی ئازاری هەبوو، هەر بۆیە درێژی کرد بوون.. لەم کاتەدا ئیبراهیم پادشای کوڕی محەمەد عەلی، دێت بۆ مزگەوتو خەڵکی هەموو لەبەری هەڵدەستن، خۆ ئەگەر بهاتایە بۆ ئەوەی سڵاو لەم زانایە بکات، ئەمیش لەبەری هەڵدەستاو ڕێزی دەگرت، بەڵام ئەو بۆ سەردانی مزگەوتەکە هاتبوو..

ئیبراهیم پادشا کاتێك دەیەوێت بڕوات، بەو کەسانەی کە لەگەڵیدات دەبێت دەڵێت: ئەوە کێ بوو هەڵنەستاو قاچیشی درێژ کرد بوو..

ئەوانیش دەڵێن: ئەوە سەعیدی حەلەبیەو زانایەکی گەورەیە..

ئیبراهیم پاشا دەڵێت: ئەی بۆ خەڵکەکە هەموو هەستانو وازیان لە خوێندنو خوێندنەوەش هێنا، کەچی ئەو خۆی تێکنەداو لەسەر قورئان خوێندنو دەرسی خۆی هەر بەردەوام بوو؟!

ئەوانیش دەڵێن: نازانین..

ئیبراهیم پادشا هەزار دیناری بە یەکێکدا بۆ دەنێرێت.. کاتێك پارەکەی بۆ دەبات، لە مزگەوت دەبێت.. نێردراوەکەی ئیبراهیم پاشا، سڵاوی لێدەکاتو دەڵێت: ئەم هەزار دینارە وەربگرە..

هەزار دینار لەو سەردەمەدا زۆر بوو، زۆر بە باشی دە ساڵ پێی دەژیای..

سەعیدی حەلەبی دەڵێت: ئەمەت لە کوێوە هێناوە؟!

نێردراوەکە دەڵێت: لە لای ئیبراهیم پادشاوە هێناومە..

سەعید دەڵێت: دەی بۆی بەرەوەو پێی بڵێ، سەعید دەڵێت: ئەو کەسەی قاچی درێژ بکات، دەستی درێژ ناکات.. ئەو زانایە ئەوەندە سەربەرز بوو، پێویستی بە پارەی کەسانی تر نەبوو..

مرۆڤ دەتوانێت بە چاك بوونی لەگەڵ خەڵکدا دڵیان داگیر بکات، نەك بە پارەو پوڵ، هەر بۆیە وتی: من زانایەکەمو بەشی خۆم پێداویستی ژیانم هەیەو پێویستم بەوە نیە پارەی ئەمو ئەو وەربگرمو لە فەتواکانمدا لایەنگری بۆ کەسانێك دەربڕم..

* لەوەرزی حەجدا، هارونە ڕەشید پرسیارێکی بۆ دروست دەبێت، پرسیار لەو

زانایانە دەکات کە لەگەڵیدا دەبن‌و ئەوانیش وەڵامەکەی نازانن‌و دەڵێن: ئەم بابەتە تازەیە..

هارونە ڕەشید دەڵێت: دەمەوێت بزانم بڕیارە شەرعیەکەی چیە؟

ئەوانیش دەڵێن: مەگەر تەنها عطائی کوڕی ڕەباح، وەڵامی ئەو پرسیارو بابەتە بزانێت..

عطائی کوڕی ڕەباح بەندەیەکی ڕەش پێستی حەبەشی شەل بوو..

خەلیفە دەڵێت: عطائم بۆ بانگ بکەن..

ئەم زانایە، زانای سەردەمی خۆی بوو.. لە وەرزی حەجدا هەر پرسیارێك قورس‌و گران بووایە، ئاڕاستەی عطائی کوڕی ڕەباح دەکرا.. کاتێك دەچن بۆ لای‌و پێی دەڵێن: خەلیفە بانگت دەکات..

عطائیش لەبەر ئەوەی گەورەترین زانای سەردەمی خۆی دەبێت، سەرقاڵی وەڵامدانەوەی پرسیاری حاجیەکان دەبێت، حاجی وا هەبوو لە کازاخستانەوە هاتبوو، هەبوو لە عێراقەوە، هەبوو لە ئەفریقاو لە شامەوەو لە چەندین وڵاتی ترەوە خەڵکی هاتبوون‌و پرسیاریان دەکرد، هەر بۆیە عطائی کوڕی ڕەباح دەڵێت: ئەم خەڵکە جێ بهێڵم‌و بێم بۆ لای خەلیفە؟! ئەی کێ وەڵامی پرسیاری ئەم هەموو موسڵمانانە بداتەوە؟

بڕۆن بە خەلیفە بڵێن، عطائی کوڕی ڕەباح دەڵێت: سەرقاڵم‌و مرۆڤ دەبێت بچێت بۆ لای زانست، زانست ناچێت بۆ لای مرۆڤ!! قوتابی‌و پرسیارکار دەبێت بچێت بۆ لای مامۆستاو پرسیار لێکراو، نەك مامۆستا بچێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری قوتابی..

کاتێك هەواڵەکەیان گەیاندەوە بە خەلیفە، هارونە ڕەشید کەوتەڕێ‌و هەردوو کوڕەکەشی (ئەمین‌و مەئمون)یشی لەگەڵ خۆی برد.. کاتێك گەیشتنە لای عطائی کوڕی ڕەباح‌و خەڵکەکە خەلیفەیان بینی، هەندێکیان دوورکەوتنەوە.. ئەو خەڵکە هەزارە هەیان بوو ماوەیەکی زۆر بوو وەستا بوو، بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی دەست بکەوێت، بەڵام بەهۆی بینینی خەلیفەو ترسیان لە خەلیفە، دوورکەوتنەوەو ڕیزەکانیان جێهێشت..

عطاء کاتێك ئەمە دەبینێ، تووڕە دەبێت‌و دەڵێت: ئەو خەڵکە هەژارە هەموو یەکسانن‌و مافی خۆیانە پرسیاریان هەبێت‌و پرسیارەکانیان بکەن..

خەلیفە دێتە پێشەوەو سڵاو دەکات‌و دەڵێت: پرسیارێکم هەیە..

عطاء دەڵێت: بچۆ لە ڕیزەکەدا بوەستەو سەرە بگرە، چونکە ئێمە هەموومان لە لای خودای گەورە یەکسانین.. خەلیفە دەگەڕێتە دواوەو لە ڕیزەکەدا دەوەستێت‌و هەردوو کوڕەکەشی لەگەڵیدا دەبن.. کاتێك سەرەی دەگاتێ، پرسیارەکەی دەکات‌و عطائیش وەڵامی دەداتەوەو ڕێزی دەگرێت‌و دوعای خێریشی بۆ دەکات..

خەلیفەش سوپاسی دەکات‌و دەڕوات، پاشان ڕوو دەکاتە هەردوو کوڕەکەی‌و دەڵێت:

ئەی کوڕەکانم.. زانست خواز بن‌و بە دوای زانستدا بگەڕێن.. سوێند بە خودا هیچ کاتێك خۆم ئەوەندە بە بچوك‌و زەلیل نەبینیووە، وەکو ئەوەی ئەمڕۆ لە بەردەم ئەو بەندەیەدا خۆم بینی.. ئەو بەندەیە شتێکی پێیە، کە من پێویستم پێیەتی‌و لە لای کەسی تریش دەستم ناکەوێت، بەڵام من جگە لە ماڵ‌و سەروەت‌و سامان هیچ شتێکی ترم نیە، ئەویش جگە لە منیش لە هەر کەسێك بیەوێت دەتوانێت ماڵ‌و سامانی دەستکەوێت.. داوا لە هەر بازرگانێك بکات، قەرزەکانی بۆ دەدەنەوە.. داوا لە هەر دەوڵەمەندێك بکات، بۆ کڕینی خانوویەك، یان سوارییەك، بۆی دەکڕن‌و دەیکڕێت، بەڵام من بۆ پرسیارەکانم جگە لەو، کەسی ترم دەست نەکەوت..

بەڵێ.. بەڕاستی ڕێزی زانایانیان دەگرت‌و زاناکان پلەو پایەی تایبەتی خۆیان هەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ گاڵتە بە زانایان دەکرێت.. جاری وا هەیە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا، گاڵتە بە زانایان‌و بە هەموو ئەو کەسانە دەکرێت کە سیمایەکی ئاینیان هەیە..

جاری وا هەیە گاڵتە بەو فەتوایانە دەکرێت، کە ئەو زانا بەڕێزانە داویانە.. لە کەناڵە ئاسمانیەکانەوەو لە پێگەکانی ئینتەرنێتەوە، یان لە دراما تەلەفزیۆنیەکانەوە، سوکایەتی‌و گاڵتە بە زانایان‌و بانگخوازان دەکرێت..

ئەمانە هەمووی حەرامن‌و لە گوناهە گەورەکانن، زانایان نوێنەرو میراتگری پێغەمبەرانن، بە هیچ شێوەیەك دروست نیە گاڵتەیان پێبکرێت، بەتایبەت ئەوانەی کە نوێنەری ئاینن‌و بە پاکی‌و بە چاکی پەیامەکەی خودایان گەیاندووە، خۆ ئەگەر تێبینیەکیش هەبێت لەسەر بۆچوونەکانیان، پێویستە بە جوانی پێیان بوترێت‌و ئاگادار بکرێنەوە..

کاتێك دەتەوێت بە نامەیەك ئاگاداریان بکەیت، بە جوانترین شێوە تێبینیەکانت بنوسەو بەڕێزەوە لەگەڵیان بدوێ.. پێویستە گومانی خراپیش بە نیەت‌و مەبەستی زانایان نەبرێت، چونکە ئەوە شتێکە تەنها خودای گەورە لێی ئاگادارە..

خودای گەورە یارمەتیمان بدات، زیاتر ڕێز لە زانایانمان بگرین‌و بە کردارو گوفتار بانگخوازی بەرنامە جوانەکەی پەروەردگار بین.. آمین..

# ئەبوحەنیفەو جێنشینەکەی..

زۆرجار مرۆڤ بە دوای جێگرەوەیەکدا دەگەڕێت بۆ دوای خۆی، حەزیش دەکات ئەو کەسەی کە دەیەوێت بیکات بە جێنیشینی خۆی، کەسێکی زیرەکو خاوەن تواناو ئایینو ڕەوشت بەرز بێت، جا جێگرتنەوەکەی لە بوارێکی زانستیدا بێت، یان زانایەکی ئاینی بێت، یان لە هەر بوارێکی تردا بێت..

* وەرن با وچانێك بدەین لەگەڵ چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەر کە لە نیوان ئەبوحەنیفە (خودا لێی خۆشبێت)و یەکێك لە قوتابیەکانیدا ڕوویداوە..

ئەبوحەنیفە یەکێك بوو لە هەرە زانا گەورەکان.. ئیمامی شافیعی (خودا لێی خۆشبێت) دەفەرموێت: خەڵکی هەموو زۆر پێویستییان بە تێگەیشتنو زانستو زانیاری، ئیمامی ئەبوحەنیفە هەیە..

بەڵێ.. بەڕاستی ئەستێرەیەکی پرشنگداری زانستو لێهاتوویی‌و شارەزایی بوو.. ئەم زانا بەڕێزە لە ساڵی هەشتای کۆچی لەدایك بووەو لە ساڵی سەدو پەنجای کۆچی، کۆچی دوایی کردووە..

ئەبوحەنیفە (خودا لێی خۆشبێت) لە مزگەوتدا دەرسی بە سەدان قوتابی دەوت.. لە هەموو ناوچەکانەوە قوتابیان ئامادەی کۆڕو دانیشتنو وانەکانی دەبوون.. کاتێك دەچوویتە مزگەوتەکەی، دەتبینی خەڵکانێکی زۆر لەسەر کورسی‌و لەسەر زەوی دانیشتوونو خەریکی دەرس‌و دەورن..

لەناو ئەو خەڵکەشدا منداڵێکی دوانزە ساڵە هەبوو، ئامادەی وانەکان دەبوو، جاری واش هەبوو پرسیاری دەکردو پرسیارەکانی ئەومیان دەردەخست، کە ئەم منداڵە خاوەن زیرەکی‌و توانایەکی باشی هەبێت، چونکە جاری واهەیە کەسانێك پرسیار دەکەن، لە پرسیارەکەیانەوە بۆت دەردەکەوێت، کە ئاستی زانستو زانیارییان نزمە، وەك پرسیاری ئەو پیاوەی کاتێك دێت بۆ لای ئەبوحەنیفە، بە شکڵو شێوە لە زانایەکی گەورە دەچوو، جامانەو جلوبەرگی شێوەیەکی بە ویقارو خاوەن زانستی پێدا بوو..

ئەبوحەنیفەش لەو کاتەدا بەهۆی ئازارەوە قاچەکانی درێژ کردبوو، کاتێك پیاوەکە دێت بۆ کۆڕی وانەوتنەوەی ئەبوحەنیفە، ئەبوحەنیفە قاچی کۆ دەکاتەوەو لەبەر شەرمی کابرا، جوان دادەنیشێت.. پیاوەکە دادەنیشێتو ئەبوحەنیفەش نایناسێتو نازانێت ئەم پیاوە کێیە، لەوانەیە زانایەك بێتو لە ناوچەو وڵاتێکی ترەوە هاتبێت..

کاتێك وانەکە تەواو دەبێت، ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: کێ پرسیاری هەیە؟

پیاوەکە دەڵێت: من پرسیارێکم هەیە.. ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات چی بکەین؟

ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: بەڕۆژووبە..

کابرا دەڵێت: ئەی ئەگەر کاتی حەج هات، چی بکەین؟

ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: حەج بکە..

پیاوەکە دەڵێت: ئەی ئەگەر حەجو ڕەمەزان کەوتنە یەك کاتەوە، ئایا حەج بکەین یان بەڕۆژوو بین؟

ئەبوحەنیفە کاتێك گوێی لەم پرسیارە دەبێت، دەفەرموێت: ئێستا کاتی ئەوەیە ئەبوحەنیفە قاچی درێژ بکات.. حەج لە مانگێکدایەو ڕەمەزان لە مانگێکی تردایە، چۆن دەکەونە یەك مانگو یەك کاتەوە؟! هەر بۆیە ئەبوحەنیفە بۆی دەرکەوت، کە شکڵو شێوەی ئەم پیاوە زۆر لە زانستو زانیارییەکەی گەورەتر بوو..

ئەو منداڵە زیرەکەی لە وانەکانی ئەبوحەنیفەدا ئامادە دەبوو، ناوی ئەبویوسف بوو.. هەر ئەم منداڵە بوو، بوو بە گەورەترین زانای فیقهی حەنەفی.. ئەبوحەنیفە زۆر پێی سەرسام بوو، بەڵام تێبینی ئەوەی کرد، ئەم منداڵە زۆرجار لە وانەکان دوادەکەوێتو ئامادە نابێت، ڕۆژێك پرسیاری لێدەکاتو پێی دەڵێت: کوڕەکەم ئەوە بۆ لە وانەکان دوادەکەویتو ئامادە نابیت؟

منداڵەکەش دەڵێت: ئێمەماڵێکی هەژارینو باوکم ناچاری کردووم، بچم بۆ بازاڕ ئیشی کۆڵکێشی بکەم، تا یارمەتیەکی ماڵەوە بدەم..

ئەبوحەنیفە پێی دەفەرموێت: کوڕەکەم خەریکی زانستو زانیاری بە.. بەدەست هێنانی زانستو زانیاری فەرزیشەو مایەی سەربەرزیشە، پەروەردگاریش لە پاشەڕۆژدا بەهۆی ئەو زانستو زانیارییەوە، پلەت بەرز دەکاتەوە..

منداڵەکە دەڵێت: باشە مامۆستاو دادەنیشێت.. لەو کاتەدا باوکی منداڵەکە دێتو دەست دەکات بە لێدانی منداڵەکەیو دەستی دەگرێتو لە مزگەوتەکە دەیباتە دەرەوە..

ئەبوحەنیفەش بە دوایاندا دەچێتە دەرەوەو بە باوکی ئەبویوسف دەڵێت: ئەوە بۆ واز لە کوڕەکەت ناهێنی بۆ خۆی فێری زانستو زانیاری بێت..

باوکی ئەبویوسفیش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەبوحەنیفە تۆ بۆ خۆت حاڵو گوزەرانت باشەو نانی گەرم دەخۆیت، ئێمەش هەژارو نەدارینو ناچارم دەبێت کوڕەکەم کارم لەگەڵ بکاتو لە ژیانو بژێویماندا یارمەتیمان بدات..

ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: کوڕەکەت ڕۆژی چەند پەیدا دەکات؟



باوکی دەڵێت: دوو درهەم..

ئەبوحەنیفە دەفەرموێت: وازی لێ بێنە با لە لای من خەریکی زانستو زانیاری بێت، من هەموو ڕۆژێ دوو درهەمی دەدەمێ.. تۆ بە کۆڵکێشی ڕۆژی دوو درهەمی پێ پەیدا دەکەیت، با لای من وانەکانی بخوێنێت، هەموو ڕۆژێ دوو درهەمی دەدەمێ..

باوکی ئەبویوسف ڕازی دەبێت..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: گوێ بگرە، سوێند بە خودا زانستێك فێری کوڕەکەت دەکەم ئەگەر تیایدا زیرەكو سەرکەوتوو بێت، لە سەرووی کۆڕو کۆبوونەوەکانی خەلیفەوە دادەنیشێتو حەڵواو شیرینیەك دەخوات، کە تەنها خواردنی خەلیفەو بازرگانە گەورەکان بێت..

باوکی ئەبویوسف بە سەرسامیەوە دەڵێت: ئەو منداڵە لە کۆڕی خەلیفەدا دادەنیشێتو ئەو خواردنە گرانە دەخوات؟!

بەڵێ.. ئەبوحەنیفە هەموو ڕۆژێك دوو درهەمی دەدا بە منداڵەکەو ئەویش دەیدا بە باوکی.. ڕۆژ بە ڕۆژ ئەبویوسف گەورەتر دەبوو، زانستو زانیاریشی زیادی دەکردو زیاتر زیرەکی تیادا دەردەکەوتو لەگەڵ مامۆستاکەیدا ڕاو بۆچوونی دەگۆڕییەوە..

ئەبویوسف نەخۆش دەکەوێتو نەخۆشییەکەی پەرە دەسێنێت.. ئەبوحەنیفە کاتێك هەواڵی دیار نەبوونەکەی دەپرسێت، پێی دەڵێن: نەخۆشە، هەر بۆیە ئەبوحەنیفە دەکەوێتە ڕێو دەچێت بۆ لای، کاتێك دەگاتە لای، دەست دەخاتە سەر سەریو دەبینێت زۆر نەخۆشو هیلاکە..

ئەبوحەنیفە بیر دەکاتەوە ماوەیەکی زۆرە ئەم قوتابیە پەروەردەو گەورە دەکاتو ئەو هەموو پارەیەشی تیادا خەرج کردووە، ئەگەر بمرێت ئەم چی بکات؟!

بە هەر حاڵ ئەبوحەنیفە دێتە دەرەوەو دەڵێت: ئاە بۆ ئەبویوسف، من بەتەمابووم لە دوای خۆم جێگەت بگرتمایەتەوەو دەمویست ببیت بە زانایەکی گەورە لە دوای خۆم، بەڵام ئەوەتا مردن هێرشت بۆ دێنێتو دێت بۆ ئەوەی گیانت بکێشێت!!

ئەبوحەنیفە دەچێتەوە بۆ وتنەوەی وانەکانیو لە خوداش داوای چاك بوونەوە بۆ قوتابیەکەی دەکات..

دوای چەند ڕۆژێك پەروەردگار شیفای ئەبویوسف دەداتو هەڵدەستێت خۆی دەشواتو جلوبەرگێکی جوان لەبەر دەکاتو دەیەوێت بچێت بۆ مزگەوت، کەسوکارەکەی پێی دەڵێن: ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟!

دەڵێت: دەچم بۆ خوێندنی وانەکانم..

ئەوانیش دەڵێن: بۆ دەچیت، خۆ تازە تۆ پێویستیت بە ئەبوحەنیفە نەماوە؟! تۆش وەکو ئەو مامۆستاو زانایت!!

ئەبویوسف دەڵێت: چۆن؟!

کەس‌وکارەکەی دەڵێن: کاتێك تۆ نەخۆش بوویت، ئەبوحەنیفە هات بۆ لاتو لە کاتی ڕۆیشتنیدا وتی: ئاە ئەبویوسف دەمویستو هیوادار بووم لە دوای من لەناو خەڵکیدا جێگەی من بگریتەوە، واتە: کاتێك ئەبوحەنیفە دەمرێت، تۆ جێگەی بگریتەوەو لە جێگەی ئەو دابنیشیتو وانە بە خەڵکی بڵێیت، ئەبوحەنیفە مامۆستایەو تۆش مامۆستایت..

ئەبویوسف دەڵێت: ئای.. منیش مامۆستام؟!

ئەبویوسف دەچێت بۆ مزگەوت، بەڵام لەباتی ئەوەی بچێت بۆ کۆڕو دانیشتنی ئەبوحەنیفەی مامۆستای، دەچێتە لایەکی مزگەوتەکەوەو خۆی کۆڕێك بۆ خۆی دروست دەکاتو هەندێك کەس لە دەوری کۆدەبنەوەو دەست دەکات بە قسەکردن بۆیان..

ئەبوحەنیفە دەبینێت مامۆستایەکی تازە لە مزگەوتەکەدا هەیە، هەر بۆیە بە قوتابییەکانی دەڵێت: مامۆستایەکی تازە هاتووە بۆ شارەکەمان؟!

لە وەڵامدا پێی دەڵێن: نەخێر.. بەڵکو ئەوە ئەبویوسفە..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: بۆ چاك بۆتەوە؟!

پێی دەڵێن: بەڵێ..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: ئەی بۆ نایەت بۆ خوێندنی وانەکانی؟!

دەڵێن: قسەکەی تۆیان بۆ گێڕاوەتەوەو ئیتر خۆی وانە بە خەڵکی دەڵێتەوە..

بانگی یەکێك لە قوتابیەکانی دەکاتو پێی دەڵێت: بچۆ بۆ لای ئەو مامۆستایەو بڵێ پرسیارێکم هەیە.. ئەویش دڵخۆش دەبێتو دەڵێت: چ پرسیارێك؟! تۆش بڵێ: پیاوێك جل‌وبەرگێك دەبات بۆ لای بەرگدوویەك، بۆ ئەوەی بۆی کورت بکاتەوە، دوای چەند ڕۆژێك کاتێك پیاوەکە دێتەوە، بەرگدرووەکە نکوڵی لێدەکات.. پیاوەکە دەچێت بۆ لای پۆلیس، کاتێك پۆلیس دێت، جل‌وبەرگەکەی دەدۆزنەوەو دەیدەنەوە بە خاوەنەکەی..

بڵێ: پرسیارەکەم ئەوەیە: ئایا بەرگدرووەکە مافی وەرگرتنی پارەی کورت کردنەوەکەی جل‌وبەرگەکەی هەیە، یان نا؟!

ئەگەر وتی: بەڵێ.. بڵێ: هەڵەت کرد.. ئەگەر وتی: نەخێر.. هەر بڵێ: هەڵەت کرد..

قوتابیەکە دەڕواتو لە بەردەم ئەبویوسفدا دەوەستێتو پرسیارەکەی لێدەکات..

ئەبویوسف زۆر دڵخۆش دەبێت، کە خەڵکی پرسیاری لێدەکەنو دەڵێت: بەڵێ مادام

جلوبەرگەکەی کورت کردۆتەوە، مافی وەرگرتنی پارەی کورت کردنەوەکەی هەیە..

قوتابیەکە دەڵێت: هەڵەت کرد..

ئەبویوسف دەڵێت: دەی پرسیارەکەت دووبارە بکەرەوە..

پرسیارەکەی بۆ دووبارە دەکاتەوەو ئەبویوسف دەڵێت: نکوڵی لە بوونی جلوبەرگەکە دەکات؟!

قوتابیەکە دەڵێت: بەڵێ..

ئەبویوسف دەڵێت: دەی مادام وایە مافی وەرگرتنی پارەی کورت کردنەوەکەی نیە..

قوتابیەکە دەڵێت: هەڵەت کرد..

ئەبویوسف دەڵێت: کێ تۆی ناردووە؟!

قوتابیەکە دەڵێت: ئەبوحەنیفە منی ناردووە..

ئەبویوسف دەچێت بۆ خزمەت ئەبوحەنیفە، دەگاتە بەردەمیو دەڵێت: مامۆستا پرسیارێکم هەیە..

ئەبوحەنیفە خەریکی وتنەوەی وانەکەی دەبێتو هەر ئاوڕیشی لێناداتەوە، کاتێك لە وتنەوەی وانەکەی دەبێتەوە، ئەبویوسف لە بەردەمیدا دادەنیشێتو دووبارە دەڵێت: مامۆستا پرسیارێکم هەیە..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: دەی بۆ وەڵامی نادەیتەوە، تۆ مامۆستا نیت؟!

ئەبویوسف دەڵێت: نەخێر.. نا بەخودا تۆ مامۆستایت نەك من..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: پرسیارەکەت چیە؟!

ئەبویوسف دەڵێت: خۆت دەزانیت، پرسیاری جلوبەرگو بەرگدرووەکە..

ئەبوحەنیفە دەڵێت: سەیری ئەندازەی کورت کردنەوەکە دەکەین، ئەگەر کورت کردنەوەکە بە ئەندازەی باڵاو جەستەی بەرگدرووەکە بوو، ئەوا مافی وەرگرتنی پارەی کورت کردنەوکەی نیە، لەبەر ئەوەی نیەتی دزینی جلوبەرگەکەی هەبووە، پاشان کورتی کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر بە ئەندازەی باڵاو جەستەی خاوەنەکەی کورتی کردبۆوە، ئەوا مافی خۆیەتی پارەی کورت کردنەوەکە وەربگرێت، چونکە سەرەتا ئەو کارەی بۆ پیاوەکە کردووە، پاشان نیەتی گۆڕاوەو ویستوویەتی بۆ خۆی بەرێت.. تێگەیشتی ئەبویوسف؟!

ئەبویوسف دەڵێت: بەڵێ مامۆستا..

ئیتر ئەبویوسف تا مردنی مامۆستاکەی لە ساڵی سەدو پەنجای کۆچی کۆڕو دانیشتنەکانی بەجێناهێڵێت.. لە دوای مردنی مامۆستاکەشی ئەم جێگەی دەگرێتەوە..

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەبویوسف لە کۆڕو دانیشتنی خەلیفەدا ئامادە دەبێت.. کۆڕو دانیشتنەکەش، کۆڕو دانیشتنێکی گەورە دەبێت.. خەلیفە لەسەر تەختو کورسیەکەیو خەڵکیش بە دەوریەوە دەبن.. ئامادەبووان، هەموو جۆرە پیاوێکی گەورەو بەناوبانگیان تێدا دەبێت، قازی.. زانا.. هەر کەسەو دەیویست زیاتر لە خەلیفە نزیك ببێتەوەو شتێك لە ماڵو سەروەتو سامانی دەست بکەوێت..

ئەبویوسف دانیشتبوو، لەو کاتەشدا گەورەو قازی هەموو قازییەکانی ئەو سەردەمە دەبێت.. خواردن دێت بۆ خەڵکەکەو خواردنێکی تایبەتیش بۆ خەلیفە دێت، ئەو خواردنەی کە لە منداڵیدا ئەبوحەنیفە وتی: ڕۆژێك دێت، ئەبویوسف لە کۆڕی خەلیفەدا ئەو خواردنە دەخوات..

کاتێك خواردنەکە دەبەنە بەردەم خەلیفە، خەلیفە ئاماژەی بۆ ئەبویوسف دەکاتو دەڵێت: سەرەتا بیدەن بە مامۆستا.. کاتێك خواردنەکەیان بردە بەردەمی، ئەبویوسف ئەوەندە پێدەکەنێت تا خەریك دەبێت بکەوێت بە پشتا..

خەلیفە لای سەیر بوو، ئەم بەم شیرینیە گرانبەهایە ڕێزی دەگرێت، کەچی ئەو ئاوا پێدەکەنێت، هەر بۆیە دەڵێت: مامۆستا ئەوە چیە؟!

ئەبویوسف دەڵێت: سوێند بە خودا هیچ مەبەستێکم نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت شتێکم بیر کەوتەوە، ئەویش ئەوە بوو، ئەبوحەنیفەی مامۆستام (خوای لێی خۆش بێت) کاتێك بە باوکمی وت: زانستو زانیارییەك فێری کوڕەکەت دەکەم، ئەگەر بە باشیو زیرەکی لێمی وەرگرێت، لە سەرووی دانیشتنەکانی خەلیفەوە دادەنیشێتو لەو شیرینیەش دەخوات کە تەنها خواردنی خەلیفەو بازرگانە گەورەکانە، باوکم کاتێك گوێی لەم قسەیە بوو، بە سەرسامیەوە وتی: ئەم کوڕەی من ئاوای لێدێت؟! سەیرکە ئێستا ئەوەتا دەمبینی، پەروەردگار بەهۆی زانستو زانیارییەوە چۆن پلەوپایەی بەرزکردوومەتەوە..﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ...﴿١١﴾ ﴾ المجادلة.

واتە: (خودای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوەو ئەوانەشتان زانستو زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەوپایە بەرزیان دەکاتەوە)..

* دەمەوێت لەسەر ئەم بەسەرهاتە هەڵوێستەیەك بکەین:

یەکەم: ئەبوحەنیفە گرنگی بە کەسانی لێهاتوو دەدا، ئەگەر ئێمە بڵێین وڵاتانی ڕۆژئاوا گرنگی بە کەسانی شارەزاو زیرەکو لێهاتوو دەدەن، ئەوەتا کەسێکی وەك ئەبوحەنیفە بەو شێوە جوانە گرنگی بە قوتابیەکی زیرەکو لێهاتوو خاوەن بەهرە داوە..

دووەم: ئەبوحەنیفە نەیویست ئەو منداڵە زیرەکە لە دەست بچێت، وەك ئەوەی چەندان منداڵو گەنجو لاو لەملاو لەولا لەدەست دەچن..

بەڵێ.. نەیویست ئەم منداڵە ببێت بە کۆڵکێش، ڕاستە کاری کۆڵکێشی کارێکی پیرۆزە، بەڵام فێربوونی زانیاری لەبەر ئەوەی سوودی بۆ هەموو کۆمەڵگە هەیە، کارێکی پیرۆزترە، هەروەك پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت:(فضل العالم على العابد، كفضل القمر على سائر الكوكب). رواه البخاري. واتە: (پلەوپایەی زانا بەسەر کەسانی ترەوە، وەك پلەوپایەی مانگە بەسەر هەموو ئەستێرەکانەوە)..

سێیەم: ئەبوحەنیفە کاتێك بەهرەی لێهاتووی‌و زیرەکی لە ئەبویوسفدا بینی، هانیداو پشتگیری کرد، بۆ ئەوەی زیاتر بەرەو پێش بچێتو کەسێکی بەسوودی لێدەربچێت، پێویستە ئێمەش کاتێك کەسێك یان هاوەڵێکی خاوەن بەهرەو شارەزا دەبینین، هانی بدەین‌و دەستی یارمەتی‌و کۆمەکی‌و پشتگیری بۆ درێژ بکەین..

کاتێك کەسێك دەبینی وازی لە خوێندن هێناوە، پێی بڵێ: کوڕەکەم.. کچەکەم، ئەوە بۆچی وازت لە خوێندن هێناوە، خۆ تۆ کەسێکی زیرەکیت؟!

ئەگەر وتی: لەبەر نەبوونی‌و بژێوی ناتوانم درێژە بە خوێندن بدەم، ئەوا با دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەین، بۆ ئەوەی تواناو بەهرەکانی لەدەست نەچن..

چوارەم: کەس بەو زانستو زانیارییەی کە بە دەستی هێناوە، لەخۆبایی نەبێت، چونکە لەسەروو هەموو زانایەکەوە زانایەکی شارەزاتر هەیە..

داواکارین ئەم وتانە بۆ ئێمەش‌و ئێوەش سوودمەند بوو بێتو داواکارین پەروەردگار زانیاریمان زیاتر بکات.. آمین..

# قوتابیەك لە ئەندەلوس..

* ئەمرۆ ئێمە لە گەشتێكدا دەبین، بۆ وڵاتی ئەندەلوس.. ماوەی نێوان ئەندەلوس بەرەو مەككەی پیرۆزو بەغداد دەبڕین.. بەنێو ئەندەلوسی كۆندا دەسوڕێینەوە.. كاتێك سەیر دەكەین، شوێنو جێگەی زانستو زانیاری دەبینین.. مزگەوتەكان دەبینین چەندین كۆڕو دانیشتنی زانیارییان تێدایە.. قوتابیانو پەرتوكەكانیان دەبینین..

پاشان دەچین بۆ مەككەی پیرۆزو دەبینین حاجیانو میوانانی ماڵی خودا، لە هەموو شوێنو جێگەیەكەوە، بەرەو ئەو شارە پیرۆزە دێنو (اللەأكبرو لبیك اللهم لبیك) دەڵێن.. ئەم وتانە هەمووی هی پێش هەزار ساڵ، یان زیاترە.. ئەو كاتەی زانایان لەسەر خێرو چاكە كۆدەبوونەوەو هەندێكیان هەندێكیان فێر دەكرد..

وەرن با هەڵوێستەیەك لەگەڵ یەكێك لە زانایان بكەین.. بابزانین چۆن زانست بەدەست دێت؟! چۆنیش بڵاو دەكرێتەوە؟ با بزانین چۆن كەسانێك جلوبەرگی سواڵكەرییان لەبەر كردووە، بۆ ئەوەی نەناسرێنەوەو بەو هۆیەوە كەمێك زانستو زانیاری بەدەست بێنن.. بۆچی نەیان توانیووە جلوبەرگی زانایان لەبەر بكەن؟! بۆچی كەسی واهەبووە هاتووەتە بەردەرگاو هاواری كردووە كە پارچە نانێكی بدەنێ؟!

سەیرە!! ئەوەندە هەژار بووە؟!

نەخێر.. هەژار نەبووە، بەڵام ئەو كەسەی كە ئەم ویستوویەتی زانستی لێوەربگیرێت، مەرجی ئەوەی لەسەر داناوە، كە دەبێت بە جلوبەرگی سواڵكەرییەوە بێت!!

بۆچی؟!

با بزانین ئەم ڕووداوە چۆن بووە؟!

* نقی كوڕی مخلدﷺ لە ئەندەلوسەوەو بەسەر زەریاو دەریاكاندا دەكەوێتە ڕێ، هەتا دەگاتە مەغریبی عەرەبیو پاشان دەچێتە ئەفریقاو هەتا دەگاتە مەككەی پیرۆز، پاشان دەچێت بۆ بەغداد..

ئەم پیاوە بۆ بینینی ئیمامی ئەحمەد (خودا لێی خۆش بێت) خەریك بوو دڵی دەفڕی.. لە كاتێكدا دەگاتە بەغداد، ئیمامی ئەحمەد تووشی بەڵاو نارەحەتییە گەورەكە بووەو فەرمانڕەوایان بەزۆر دەیانەوێت ئیمامی ئەحمەد بڵێت: قورئانی پیرۆز مەخلوقە.. قورئان كەلامی خودایەو كەلامی خوداش بریتیە لە سیفەتێك لە سیفەتەكانی پەروەردگار.. ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡلَمُونَ ٦﴾ التوبة. واتە: (خۆ ئەگەر كەسێك لە

هاوەڵگەران داوای پەنای لێکردیت (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار)، ئەوە تۆش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خودا (قورئان) بێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت (ماڵو گیانو ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکی نەزانن)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾ النساء. واتە: (بەڕاستی خودای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەریو ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە)..

پەروەردگار بە شێوەیەك دەدوێت، کە شایەن بە گەورەییو بەرزیو شکۆی بێت، بەڵام کەسانێك نکوڵیان دەکردو دەیانووت: قورئانیش دروستکراوێکە وەك هەموو دروستکراوەکان..

ئیمامی ئەحمەدیش دەیفەرموو: قورئان وتەی پەروەردگارەو دروستکراوێکی ئاسایی نیە.. قورئان گەورەیی خۆی هەیە، بەڵام ئەوان دەیانووت: قورئانیش وەکو هەموو دروستکراوەکانی تر وایەو هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ شتەکانی تردا..

یەکێك لە وەزیرەکانی خەلیفە معتصم، بە ناوی ئەحمەدی کوڕی دوئاد ئەو بۆچوونە گومڕایە دەخاتە سەری خەلیفەوەو بەو هۆیەشەوە ئیمامی ئەحمەد دوو ساڵو چوار مانگ بەند دەکەنو هەموو ڕۆژێکیش لێی دەدەن..

تەنانەت خەلیفە معتصم خۆی دەهاتو بە قامچی وەشێنەکانی دەوت: قامچیەکەتانم نیشان بدەن، بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوەو بزانێت قامچیەکە بەهێزو پتەوە یان نا، پاشان دەیووت: لێی بدەن.. قامچی وەشێنەکانیش دەستیان دەکرد بە لێدانی..

ئیمامی ئەحمەد ئەو ماوە زۆرەی لە بەندیخانەیەکی کۆنو ڕزیودا بەسەربرد.. بەندیخانەکە هیچ خزمەتگوزارییەکی تێدا نەبوو، تەنانەت سەرئاوی تێدا نەبوو.. پەنجەرەیەکی تۆزێك گەورەی تێدا نەبوو، هەتا ئێستاش لەو جۆرە بەندیخانانە ماونو بەردەوام هەن، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە ئیمامی ئەحمەد لە ناخۆشترینو ناڕەحەتترین بەندیخانەدا بوو، بۆ ئەوەی لە بۆچوونو قسەکانی پەشیمانی بکەنەوەو بیهێننە سەر ڕای خۆیان، بەڵام ئەم زانا بەڕێزو گەورەیە وەکو کێوەکان خۆڕاگر بوو، پاشان ئازادی دەکەن، بەڵام لە وانەوتنەوەو هاتوچۆی مزگەوتو نوێژی جەماعەت، قەدەغەی دەکەنو نایەڵن کەس سەردانی بکاتو پەیوەندی بە خەڵکەوە بە تەواوی دەپچڕێننو هەر کەس پەیوەندی پێوە بکات ڕاستەوخۆ بەندی دەکەن..

ئیمامی ئەحمەد لە ماڵەکەی خۆیدا دەبێت، نقی کوڕی مخلد، لە ئەندەلوسەوە بەرەو مەککەو بەرەو بەغداد ڕێگەیەکی دوورو درێژ بە قاچەکانی دەبڕێت، لەبەر ئەوەی کەسێکی هەژار دەبێتو خاوەنی وڵاخێك نابێت کە گەشتەکەی پێبکات..

کاتێك دەگاتە بەغداد پرسیاری ئیمامی ئەحمەد دەکاتو دەڵێن: بۆچیتە؟

دەڵێت: دەمەوێت زانستی لێ فێر بمو لە لای بخوێنم..

خەڵکەکە دەڵێن: ئیمامی ئەحمەد لە ماڵەکەی خۆیدا دەست بە سەرەو ناتوانێت لە ماڵ بێتە دەرەوەو لە وانەوتنەوە قەدەغەکراوە..

ئەم پیاوە دەچێت بۆ ماڵیانو ئیمامی ئەحمەد دەرگاکەی لێدەکاتەوەو پیاوەکە دەڵێت: من کەسێکم هاتووم بۆ ئەوەی زانستو زانیاریت لێ فێر بم..

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: باشە، بەڵام لەوانەیە هەواڵی منت پێگەیشتبێت؟!

پیاوەکە دەڵێت: دەزانمو هەواڵیشتم پێگەیشتووە، بەڵام سوێند بە خودا لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هاتووم.. ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: لە کوێوە هاتوویت؟

پیاوەکە دەڵێت: لە ئەندەلوسەوەو بەسەر دەریاکاندا چوومەتە مەککەو پاشان هاتووم بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی زانستت لێ فێر بم..

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: بەخودا ڕاست دەکەیت، بەڵام خۆ دەبینی چیمان پێدەکەن، ناتوانم هیچ شتێکت پێبڵێمو هیچت فێر بکەم..

ئەم پیاوە واز ناهێنێتو دەڵێت: هەر چۆنێك بێت دەبێت فێرم بکەیت..

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: باشە.. جلوبەرگێکی سواڵکەرانە لەبەربکەو هەموو ڕۆژێك وەرەو لە دەرگا بدەو داوای خێرو خێرات بکە، منیش وەکو ئەوەی خواردنت بۆ بێنم، فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە..

ئیمامی ئەحمەد دەیزانی خەلیفە چاودێری بەسەریەوە داناوە، بۆیە پێی وت: بە جلوبەرگێکی هەژارو سواڵکەرانەوە وەرە، وەکو ئەوەی بۆ یارمەتیو خێر بێیت، هەر بۆیە هەموو ڕۆژێك وەکو سواڵکەرێك دێتو ئیمامی ئەحمەدیش بۆ ئاشکرا نەبوونیان، خۆی وا دەردەخست کە خواردن بۆ ئەو هەژارە دێنێت، ئیتر ڕۆژانە چەند فەرموودەیەکی بۆ دەگێڕایەوەو پێشی وت: با لە کۆڕی وانە وتنەوەدا نەت بینن، چونکە شتێکی سەیرە تۆ لە لای زانایان خەریکی زانستو زانیاری بیتو لە هەمان کاتیشدا سواڵکەر بیت، با هیچ شێوەیەکی زاناو قوتابیت پێوە دیار نەبێت..

ئەم قوتابیە دڵسۆزو ماندوو نەناسە دەیزانی لەم ڕێگەیەوە نەبێت، دەستی لە ئیمامی ئەحمەد گیر نابێت..

بەڵێ.. هەموو ڕۆژێك جلوبەرگێکی شڕی لەبەر دەکردو گۆچانێکی بە دەستەوە دەگرتو تووڕەکەیەکیشی هەڵدەگرتو شێوەی سواڵکەرێکی نیشان دەداو لە دەرگای ماڵی ئیمامی ئەحمەدی دەداو داوای خێرو خێراتی دەکرد..

کاتێکیش ئیمامی ئەحمەد فەرموودەکانی بۆ دەگێڕایەوە، یەکسەر لەبەری دەکرد،

چونکه نەیدەتوانی بیان نوسێتەوەو کاتی ئەوەیان نەبوو.. بەم شێوەیە بەردەوام بوون، هەتا خەلیفە واثق ئیمامی ئەحمەدی لەو حاڵە هێنایە دەرەوەو ئیمامی ئەحمەد چووەوە مزگەوتو دەستی کردەوە بە وانە وتنەوە، ئیتر نقی کوڕی مخلدیش وەکو سەرجەم قوتابیەکانی تری ئیمامی ئەحمەد لە وانەکاندا ئامادە دەبوو..

ئیمامی ئەحمەد دەیزانی ئەم قوتابیە چەند ماندوو نەناسو دڵسۆزو لێهاتووە، لە خۆی نزیك دەکردەوەو لە تەنیشتی خۆیەوە دایدەنیشاند..

ئەم قوتابیە ڕۆژێك دیار نابێت، کاتێك ئیمامی ئەحمەد هەواڵی دەپرسێت، دەڵێن: نەخۆشە..

بەڵێ ئەم قوتابیە نەخۆش دەبێتو لە میوانخانەیەکدا ژوورێکی بەکرێ گرتبوو، لەوێدا دەژیا.. ئەم قوتابیە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێك نەخۆش بووم، گوێم لە دەنگە دەنگ بوو.. گوێم لێبوو، دەیان ووت: بەڵێ هات.. ئەوا گەیشت.. سەرکەوتە سەرەوە.. ئامادەبن.. وابکەن..

منیش نەمدەزانی چی ڕوودەداتو کێیە وا دێت؟! پاشان زانیم ئیمامی ئەحمەدەو هاتووە بۆ سەردانی من.. بەڵێ هاتو قوتابیەکانیشی لە خزمەتیدا بوونو دەستی خستە سەر سەرەو قوتابیەکانیشی سەیریان دەکردو سوننەتی پێغەمبەری خوداﷺو ڕەوشتو ڕەفتاری لێ فێر دەبوون..

ئیبن جەوزی دەفەرموێت: جاری واهەبووە پانزە هەزار کەس ئامادەی وانەکانی ئیمامی ئەحمەد دەبوون، پێنج هەزاریان فەرموودەیان دەنووسیەوە، دە هەزاریان تەنها سەیری هەڵسوکەوتو ڕەوشتی جوانی ئیمامی ئەحمەدیان دەکردو فێری ئەوە دەبوون، چۆن وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەداتەوەو چۆن خەڵکی فێر دەکات..

نقی کوڕی مخلد دەڵێت: کاتێك دەستی خستە سەر سەرەو دوعای خێری بۆ کردەو فەرمووی: ئارام بگرەو خودا پاداشتت بداتەوە لەسەر ئەم نەخۆشیەت..

دوای ئەوەی ئیمامی ئەحمەد ڕۆیشت، خاوەن میوانخانەکە هات بۆ لامەو وتی: چ پەیوەندییەك لە نێوان تۆو ئیمامی ئەحمەددا هەیە؟!

وتم: بەخودا هیچ پەیوەندییەکمان لە نێواندا نیە، جگە لەوەی من یەکێکم لە قوتابیەکانیو خۆشی دەوێم..

خاوەن میوانخانەکەش دەڵێت: دەی لەمەودوا بە بێبەرامبەر لە میوانخانەکەمدا نیشتەجێبە.. دوای ئەوە، کەسی وا هەبوو ڕاخەری بۆ دەهێنام.. کەسی وا هەبوو خواردنی دەهێنا.. سوێند بە خودا وای لێهات ئەگەر لەناو کەسوکارو ماڵو حاڵی خۆشمدا بوومایە، ئەوەندە گرنگیان پێنەدەدام، وەك ئەوەی ئەو خەڵکە گرنگیان پێدەدام..

ئەوەش هەموو بۆ ئەو ڕێزو پلەوپایەیەی ئیمامی ئەحمەدو هەوڵو ماندووبوونی ئەو قوتابیە بەڕێزە دەگەڕێتەوە، کە چۆن خودا ڕێزو شکۆی پێبەخشین..

زانایانی پێشوو کاتێك بەو شێوەیە بۆ بەدەست هێنانی زانست بە ماڵو تواناو سەروەتو سامانیانەوە، هەوڵیان داوەو لەو پێناوەدا ماندوو بوون، توانیوویانە نەتەوەو گەلەکەیان بەو زانستو زانیارییانە بەرەو پێش بەرنو ڕێزو شکۆیان بۆ بگێڕنەوە.. کێشەی ئێمە ئەمڕۆ بەداخەوە ئەوەیە، زۆرێك لە خەڵکی پشت لە زانستو زانیاری دەکەنو هەوڵی بۆ نادەن، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (إن بين يَدَي الساعة لأياماً يرفع فيها العلم ويفشوا فيها الجهل). رواه البخاري. واتە: (لە نزیك بوونەوەی ڕۆژی دواییدا ڕۆژانێك دێن، کە زانستیان تێدا بەرز دەکرێتەوەو نەزانییان تێدا دادەبەزێن، یان نەزانینیان تێدا بڵاو دەبێتەوە).. هەتا وای لێدێت خەڵکی پرسیار لە بارەی شتانێکی زۆر ئاسانەوە دەکەنو سەیرە کە ئەو بابەتانە نازانن!!

پرسیار دەربارەی نوێژ دەکەن.. سەیرە چل ساڵە نوێژ دەکەیت، نازانی نوێژکردن بەو شێوەیە هەڵەیە؟! ئەی نازانی ئەمەیان سوننەتەو فەرز نیە؟! بەداخەوە ئەمڕۆ خەڵکی لە کاروباری دونیایدا زۆر شارەزان، بەڵام لە ئاینەکەیاندا نەخێر، نەك هەر زانیارییان کەمەو بە دوایدا ناگەڕێن، بەڵکو زۆریش نەزانن..

ئەمڕۆ خەڵکی لە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتو سەیارەو مۆبایلدا زۆر زیرەکنو ئەگەر پرسیارێکیان لێبکەیت، بێ دوودڵیو یەکسەر وەڵامت دەدەنەوە، بەڵام ئەگەر بڵێیت: واتای ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾ چیە؟! نازانێت!! ئەی مانای ﴿غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴾ چیە؟! نازانێت!! ئەگەر بڵێی کەی ئیمام پێویستە پێش سڵاودانەوە سوجدەی لێ تێکچوون (سهو) بەرێتو کەی دوای سڵاودانەوە بیبات؟! نازانێت!!

کەسانی پێش ئێمە بەو هەموو نارەحەتیو هەژاریەشەوە، بە دوای زانستدا دەگەڕان، کەچی ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە هۆکارەکان زۆر ئاسان بوون، ئینجا خەڵکی زۆر نەزانن..

کەسانی وا هەبوون، بیابانەکانو دەریاو زەریاکانی بڕیوە، بۆ ئەوەی زانست بەدەست بهێنێت.. هەیان بووە لەو پێناوەدا گیانی سپاردووەو مردووە، هەیان بووە لە بیابانەکاندا ڕێگەی لێ وون بووە.. ئەمڕۆ جاری وا هەیە بەخۆڕاییو بێبەرامبەر هۆکارەکانی زانستو زانیاریش دەست دەکەوێت، لە پەڕتووکو لە سیدیو شتانی تر، بەڵام خەڵکی پشت لە خوێندنەوەو زانستو زانیاری دەکەن.. ئەمڕۆ نە باوکان منداڵەکانیان فێر دەکەن، نە دایکانیش خەمێکیان لێدەخۆن..

* قوتابیانو فێرخوازانی پێشوو ئەوەندە تامەزرۆی بەدەست هێنانی زانست بوون،

تەنانەت جاری وا هەبووە لەو پێناوەدا فێڵیشیان بەکارهێناوە، وەك لەم ڕووداوەی نێوان ئەعمەشو یەکێك لە قوتابیەکاندا ڕوویداوە..

یەکێك لە قوتابیەکانی ئەعمەش لە شوێنێکی دوورەوە دێت بۆ لای ئەعمەش، بۆ فێربوونی فەرموودەو زانیاری.. نوێژی ئێوارە لەگەڵ ئەعمەش دەکاتو دەیەوێت هەستێتو بچێت ئامادەی وانەکان بێت، بەڵام قوتابیەکانی تر پێی دەڵێن: ئەمڕۆ وانەمان نیە..

قوتابیەکە دەڵێت: بۆچی؟! ئاخر من لە شوێنێکی دوورەوە هاتوومو ماڵو کەسوکارم بەجێ هێشتووە، بۆ ئەوەی شتێك فێر بم..

قوتابیەکان دەڵێن: ئەمڕۆ مامۆستا تووڕەیە، پرسیارێکی نەگونجاومان لێکرد، ئیتر تووڕە بوو، سوێندی خوارد مانگێکی تەواو هیچ وانەیەکمان پێنەڵێت..

قوتابیەکە بە سەرسامیەوە دەڵێت: مانگێك!!

قوتابیەکان دەڵێن: ئێمەش دەمانویست شتێك فێر بووینایەو هەندێك فەرموودەمان لێوەرگرتایەو بۆ لای کەسوکارمان بڕۆیشتینایەتەوە، بەڵام مامۆستا دەیەوێت فێری ئەدەبو ڕەوشتمان بکات، هەر بۆیە سزای داین تا مانگێك هیچ شتێکمان پێنالێت..

قوتابیەکە دەچێت بۆ لای ئەعمەش، ئەعمەش کەسێکی شەوکوێر بوو.. قوتابیەکە دەچێتە پێشەوەو پێی دەڵێت: مامۆستا من لە شوێنێکی دوورەوە هاتووم، پێویستە ئاگات لە حاڵم بێت..

ئەعمەش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر.. مانگێکی تەواو هیچ وانەیەك ناڵێمەوە، چونکە سوێندم خواردووە، پاشان ئەعمەش گۆچانەکەی بە دەستیەوە دەگرێتو هەڵدەستێت بۆ ئەوەی بڕوات، قوتابیەکە دەڵێت: دەی با تا ماڵەوەتان بتگەیەنم..

ئەعمەشیش ڕازی دەبێتو دەڵێت: خودا پاداشتت بداتەوە.. قوتابیەکە دەستی ئەعمەش دەگرێتو لە مزگەوت دەردەچنو دەکەونە ڕێ، بەڵام لەباتی ئەوەی بەرەو ماڵەوەی بەرێ، بەرەو دەشتو دەرو بیابانی دەبات، ئەعمەشیش لەبەر ئەوەی شەوکوێر دەبێت، نازانێت بەرەو ماڵەوەی نابات، هەتا ماوەیەك دەڕۆن، ئەعمەش دەپرسێت: ئێمە لەکوێین؟

قوتابیەکەش دەڵێت: مامۆستا ئێستا ئێمە لە بیابانو چۆڵەوانیداین، یان دەبێت سەد فەرموودەم بۆ بگێڕیتەوە، یان لەم بیابانو چۆڵەوانیەدا جێت دەهێڵم، ئێستە شەویشەو ئێمەش لەم چۆڵەوانیەدا تەنهاین، هەر بۆیە دەمریتو سبەینێ دەبێت لە سکی گورگو ئەژدیهادا دەرت بهێنین، هەر بۆیە سەد فەرموودەم بۆ بگێڕەوە، یان جێت دەهێڵم..

ئەعمەش دەڵێت: ئاخر گوناهت دەگات..

قوتابیەکە دەڵێت: تۆ گوناهت دەگاتێ، من لە شوێنێکی دوورەوە هاتووم‌و هیچ کێشەیەکیشم لەگەڵ تۆدا نیەو هیچم نەکردووە، کەچی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بێبەشم دەکەیت؟!

ئەعمەش کاتێك دەزانێت چاری ناچارە، دەڵێت: بنوسە.. قوتابیەکەش سەد فەرموودە دەنوسێت‌و نوسراوەکە لە لای خۆی هەڵدەگرێت‌و بەرەو ماڵەوە دەکەونە ڕێ..

کاتێك دەگەنە ناوشار، قوتابیەکە نوسراوەکەی دەدات بە یەکێك لە هاوەڵانی‌و ئەعمەش دەگەیەنێتە ماڵەوە، کاتێك دەگەنە ماڵەوە، ئەعمەش دەڵێت: هۆ خەڵکینە.. ئەوە دزەو ئەو نوسراوەی کە لایەتی لێی بسەنن..

قوتابیەکەش دەڵێت: مامۆستا نوسراوەکەم پێنیەو دام بە یەکێك لە هاوەڵەکانم..

ئەعمەش دەڵێت: باشە.. با بزانیت هەموو ئەو فەرموودانەی بۆم گێڕایتەوە، لاوازن..

قوتابیەکەش دەڵێت: سوێند بە خودا تۆ لەوە بەڕێزو پاکتری، کە درۆ بە دەم پێغەمبەری خوداوەﷺ هەڵبەستیت!!

ئەعمەش دەڵێت: ڕاست دەکەیت، بەڵام ویستم چیت نوسیووە بیسڕیتەوەو من چیم بەسەرهات، تۆش ئاوات بەسەر بێت‌و وەك من دڵت بڕەنجێت..

بەڵێ.. ئەوەتا لە پێناوی بەدەست هێنانی زانست‌و زانیاریدا ئامادەبوون، فێڵیش بەکاربهێنن..

داواکارین پەروەردگاری میهرەبان سەرکەوتوو سەرفرازی دونیاو دوارۆژمان بکات‌و زانست‌و زانیاری بەسوودمان پێببەخشێت‌و لە ئەنجامدانی کاری چاکەدا یارمەتیمان بدات.. آمین..

# ئێمەو ژینگە..

* زۆرجار ژینگەو دەوروبەر، کاریگەری لەسەر مرۆڤ دروست دەکەن.. هەر کەس دەیەوێت زمانی، یان شێوازی ژیانی بگۆڕێت، پێویستە سەرەتا ژینگەکەی بگۆڕێت..

کاتێك تێبینی ئەوە دەکەیت، کە کوڕەکەت هەندێك ڕەوشتی ناشیرینو خراپ فێربووە، یان هەندێك وشە فێربووە، کە خۆتان ئەو قسانە ناکەن، یەکەم شت کە پرسیاری لێدەکەیت، ئەوەیە کە پێی دەڵێیت: کوڕەکەم ئایا کەسێکی تازەت ناسیووە؟! کەسێکی خەڵکی دەرەوەی شارەکەی خۆمان، یان وڵاتێکی ترت ناسیووە؟! چونکە شتێکی ئاساییە، دەوروبەرو هاوەڵو هاوڕێ، کاریگەری لەسەر تاکەکان دروست دەکەن..

* وەرن با گوێ بگرین بۆ ڕووداوێکی سەیر، کە بەسەر شاعیرێکدا هاتووە.. ئەم شاعیرە لە بیابانەوە دەچێت بۆ شاری مەدینە.. لە بیاباندا و لەژێر ڕەشماڵێکی کۆندا ژیانی بەسەردەبرد.. بە لای ڕاستو چەپدا جگە لە وشترو مەڕو بزنو بیر، هیچی تری نەبینی بوو.. ئەم شاعیرە لەو ژینگەیەوە بەرەو ژینگەی شاری مەدینەو کۆڕی خەلیفە دەچێت..

عەلی کوڕی جەهم شاعیرێکی ڕەوان بێژو زمان پاراو بوو، بەڵام دێهاتی بوو.. هیچی لە ژیان نەدەزانی، تەنها ئەو شتانە نەبێت کە لە چۆڵەوانیو بیاباندا بینیبوونی..

خەلیفە متوکل، خەلیفەیەکی خاوەن دەسەڵاتو بە توانا بوو.. بەخشیشو دیاری بەو کەسانە دەدا کە پیایا هەڵیاندایا، هەر بۆیە کاتێك عەلی کوڕی جەهم دێتە شاری بەغدا، پێی دەڵێن: ئەوەی بە خەلیفەدا هەڵبدات، ئەوا خەلیفە دیاریو بەخشیشی دەداتێ..

عەلی کوڕی جەهمیش خۆشحاڵ دەبێتو بەرەو کۆشکی خەلیفە دەکەوێتە ڕێ.. کاتێك دەچێتە ژوورەوە دەبینێت وا شاعیران، هۆنراوە دەخوێننەوەو سەروەتو سامان بە دەست دێنن.. عەلی کوڕی جەهم بەرەو لای خەلیفە دەچێت، خەلیفەش بەو هەموو سامو هەیبەتو دەسەڵاتەیەوە.. پاشان بە خەیاڵی خۆی دەست بە پیاهەڵدانو ستایشی خەلیفە دەکاتو دەڵێت:

أنت كالكلب في حفاظك للود    وكالتيس في قراع الخطوب
أنت كالدّلو لا عدمتك دلواً    من كبار الدلا كثيرُ الذَّنوب..

بەڵێ.. خەلیفەی بە سەگو بەرانو بیرو خۆڵو فوڕ وەسف کرد، لە کاتێکدا لە پێش ئەمدا خەلیفەیان بە خۆرو مانگو شاخەکان وەسف کرد بوو!! خەلیفە زۆر تووڕە بوو!!

پاسەوانەکان وروژانو شمشێرەکانیان ڕاکێشاو خۆیان بۆ کوشتنی ئامادە کرد، بەڵام خەلیفە هەستی بەوە کرد کە عەلی کوڕی جەهم لەو سروشتو بوونەوەرەدا گەورە بووەو ئەو کاریگەرییەی بە سەرەوەیە، هەر بۆیە ویستی بیگۆڕێت، فەرمانی کرد لە کۆشکێکی نایابدا نیشتەجێی بکەنو با بە خۆشترین شێوە ژیان بە سەر بەرێت..

بەڵێ.. عەلی کوڕی جەهم تامی خۆشییەکانی چەشت.. لە سەر دۆشەکو سەرینی بە نرخ شانی دائەداو لەگەڵ شاعیرە زۆر بە ناوبانگو ناودارەکاندا دادەنیشت.. ماوەی حەوت مانگ بەم شێوەیە مایەوە..

شەوێك خەلیفە کۆڕو دانیشتنێکی هەبوو، بیری عەلی کوڕی جەهمی کەوتەوەو داوای کرد بۆی بانگ بکەن.. کاتێك عەلی ئامادە بوو، خەلیفە داوای لێکرد هۆنراوەیان بۆ بخوێنێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان لە هۆنراوەکەیدا وشەی زۆر جوانی بەکارهێناو خەلیفەشی بە خۆرو ئەستێرەو شمشێر وەسف کرد!!

سەیرکە خەلیفە چۆن توانی سروشتی عەلی کوڕی جەهم بگۆڕێت؟!

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا چەندین کوڕو کچی لاو هەن، کەوتوونەتە ناو گوناهو تاوانەوە، یان بە پێچەوانەوە بەرەو خێرو چاکە چوون، هەموو ئەمانەش بەهۆی هاوڕێو هاوەڵو دەوروبەرەوە بووە..

چەندین ئافرەت هەبوون، باڵاپۆشو بەڕێزو بەشەرمو شکۆ بوونو بە جوانترین شێوە، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دایكو باوكو کەسوکاریاندا کردووە، بەڵام کاتێك لە قۆناغێکی خوێندنەوە چوونەتە قۆناغێکی تر، گۆڕانکارییەکی زۆریان بەسەرهاتووە، لە ناوەندیو دواناوەندی جۆرێك بوون، کاتێك چوونەتە زانکۆ، یان پەیمانگە، زۆر گۆڕاون.. جا گۆڕانەکەیان بەرەو چاکە بوو بێت، یان بەرەو خراپە.. هۆکارەکەش چی بووە؟!

هۆکاری سەرەکیش بریتی بووە لە: ژینگەو دەوروبەرو هاوڕێ، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الفرقان. واتە: (ڕۆژێك دێت ستەمکار قەپ دەکات بە هەر دوو دەستی خۆیداو گاز لە هەر دوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانیدا)و دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە)..

کێ ڕێگری لەو پیاوە کرد ڕێگەکەی پێغەمبەری خوداﷺ بگرێت؟! کێ لە پێغەمبەری خودایﷺ دوورخستەوە؟!

﴿ يَـٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفرقان. واتە: (مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلان کەسم نەکردایەتە هاوەڵو دۆستی خۆم).. دەی کاتێك فلانە کەسی کرد بە هاوڕێو

هاودەمی خۆی، چی ڕوویدا؟!

﴿ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الفرقان.
واتە: (بەڕاستی گومڕاو وێڵی کردم لە بەرنامەی خودا دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەیانرا بوو، شەیتان هەمیشەو بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناهو تاوان، لە کاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات)..

هۆکاری خەسارەمەندییەکان، گومڕایی‌و سەرلێشێواوی، هەمووی ئەو هاوڕێیە بوو، کە ڕێگەی ڕاستی لێ ون کردم.. کاتێك لە کۆڕی قورئان خوێندندا بووم، پێی دەوتم: بەشداری مەکە.. سەیری فلانە کەناڵ‌و فلانە کەناڵی قورئان‌و ئامۆژگاری مەکە.. ڕەمەزان بەڕۆژوو بووین، ئیتر بەسە، بۆچی دوو شەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو بین!! دەمویست پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتاندا بپچڕێنم، پێی دەوتم: گەنجێتی‌و لاویت، خۆش بەسەربەرە.. ڕێگری لێدەکردم، یادی خودا بکەم.. نەیدەهێشت کاری چاکە ئەنجام بدەم..

پەروەردگار باسێکی ترمان بۆ دەکات، کاتێك باسی ئەو کەسانە دەکات کە لە چ نازو نیعمەتو خۆشییەکی بەهەشتدان.. کاتێك هاوەڵێك چۆن دەیەوێت، هاوەڵەکەی بەرەو خراپ بەرێت، زۆرجار لە خۆشەویستی هاوەڵەکەیدا، لەوانەیە مەبەستی خراپەش نەبێت، بەڵکو خۆی چۆنە، حەز دەکات هاوەڵەکەشی وەکو ئەو بێتو هەمان ڕێچکەو ڕێگە بگرێت..

پەروەردگار لە باسی بەهەشتیەکاندا دەفەرموێت: ﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ ﴾ الصافات. واتە: (یەکێکیان مۆڵەت دەخوازێتو دەڵێت: من بەڕاستی کاتی خۆی لە دونیادا هاوەڵێکم هەبوو)..

یەکێك لە بەهەشتیەکان دەڵێت: لە دونیادا هاوڕێیەکم هەبوو، لە قوتابخانە بەیەکەوە بووین‌و پێکەوە قسەمان دەکرد، هەتا وامان لێهات، بووین بە دوو هاوڕێی زۆر نزیك، بەڵام ئەو هاوەڵە، هاوەڵێکی باش نەبوو..

﴿ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الصافات. واتە: (زۆرجار دەیوت: تۆ باوەڕ بە شتی وا دەکەیت؟! ئایا ئەگەر بووینە خاكو ئێسك، ئێمە بەڕاستی پاداشت دەدرێینەوە؟!)..

بەڵێ.. ئەو هاوەڵە دەیوت: تۆ باوەڕت وایە ڕۆژی دوایی بوونی هەبێت؟!﴿ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الصافات. واتە: (پاشان ئیماندارەکە ڕوو بە هاوەڵانی وتی: ئەرێ ئەوە ئێوە تەماشا ناکەن: با بزانین ئەو هاوەڵەم حاڵی چۆنە)؟!

هاوەڵە بەهەشتییەکە، لە بەهەشتدا بە دوای هاوەڵەکەیدا دەگەڕێتو هەواڵی دەپرسێت، بەڵام نایدۆزێتەوەو نایبینێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مادام لە بەهەشتدا

نیە، کەواتە لە دۆزەخدایە، چونکە لە ژیانی دواییدا، تەنها دوو ماڵو جێگە هەیە..
﴿ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ ﴾ الصافات. واتە: (هەر کە سەیرێکی کرد، بینی وا لە ناوەڕاستی دۆزەخدا گیری خواردووە)..
کاتێك دۆزەخ دەبینێت، ﴿ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الصافات. واتە: (ئەوسا پێی وت: بەخودا خەریك بوو منیش تیابەریت، خەریك بوو منیش وەکو خۆت هەڵدێریت).. نزیك بوو منیش لەگەڵ خۆت خراپ بکەیت..
﴿ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾ الصافات. واتە: (خۆ ئەگەر نیعمەتی هیدایەتی پەروەردگارم نەبووایە، ئەوە منیش لە ئامادەبووانی ناو دۆزەخ دەبووم.. ئینجا بەختەوەران لە خۆشیدا دەڵێن: ئێمە ئیتر نامرین، ژیانمان بەردەوامە.. جگە لە مردنەکەی یەکەم جارمان، ئێمە ئیتر هیچ ئازارو ئەشکەنجەیەکیش ناچێژین)..
پەروەردگاریش دەفەرموێت:﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الصافات. واتە: (بەڕاستی ئا ئەمەیە سەرکەوتنو سەرفرازیو بەختەوەری گەورەو بێ سنور.. دەبا بۆ ئەم بەهەشتە، بۆ ئەم کامەرانییە، بۆ ئەم نازو نیعمەتە بێ سنورە، ئەوانەی کە کارو کۆشش دەکەن، با بۆ ئەم دەستکەوتانە بیکەن)..
بەڵێ.. ئەگەر بەڕاستی دەتەوێت بگۆڕێیت، دەبێت ژینگەو دەوروبەرت بگۆڕیت.. خەلیفە متوکل ژیانو ژینگەی عەلی کوڕی جەهمی گۆڕی.. لە شوێنێکەوە گواستیەوە بۆ شوێنێکی تر.. دەی بە دڵنیایەوە، تۆش دەتوانیت خۆت بگۆڕیت..
* جارێکیان لە یەکێك لە شارەکانی وڵاتێکی کەنداو بووەو وتارێکم پێشکەش کرد، کە لەم بابەتەوە نزیك بوو.. لە بابەتەکەدا باسی پەیوەندی جوانو چاکم کرد لەگەڵ پەروەردگاردا.. هەروەها باسی دوورکەوتنەوەم کرد لەو شتانەی کە بەرەو خراپەمان دەبەن.. باسی ئەوەم کرد، مرۆڤ کاتێك دەیەوێت خۆی چاك بکات، دەبێت دەوروبەرو ژیانی خۆی چاك بکات..
ئەوەی دەیەوێت واز لە مادده بێهۆشکارو سڕکەرەکان بهێنێت، دەبێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەڵسوکەوت نەکات کە ئەو ماددانە بەکاردەهێننو هاوڕێیەتیان نەکاتو ناوو ژمارەی مۆبایلیان بسڕێتەوە..
کاتێك کەسێك دەیەوێت جگەرە نەکێشێت، یان وازی لێ بهێنێت، پێویستە لەگەڵ کەسانێکدا دانەنیشێت کە جگەرە دەکێشنو ڕێگەیان پێنەدات، لەبەر چاوی ئەم ئەو کارە ئەنجام بدەن..
کەسێك دەیەوێت لە خراپەو تاوان دوورکەوێتەوە، دەبێت لە تێکەڵ بوون لەگەڵ

ئافرەتان دووركەوێتەوەو ژمارەی هەموو ئەو ئافرەتانەی ئەگەر لە مۆبایلەكەیدا هەن، بسڕێتەوە..

كەواتە پێویستە بڕیار بدەیت، بۆ ئەوەی ژیانت بگۆڕیت..

لە دوای وتارەكەم گەنجێك هەستاو وتی: مامۆستا قسەیەكم هەیە..

وتم: فەرموو..

وتی: مامۆستا ماوەیەك لەمەو پێش، هەندێك لە هاوەڵانم وتیان: دەمانەوێت بچین بۆ یەكێك لە دەوڵەتانی عەرەبی، بەڵام ئەو دەوڵەتە خراپەو عەرەقو ماددە بێهۆشكارەكانی تێدا زۆر بڵاوە..

منیش وتم: لەگەڵتان دێم، بەڵام بەو مەرجەی نەچنە هیچ شوێنێكی خراپ..

وتیان: باشەو ڕازین..

سێ چوار ڕۆژ لە گەشتەكەمان تێپەڕیو تەنها دەچووین بۆ چێشتخانەو بازاڕو شاری یاری، بەڵام شەوێكیان بەرەو شوێنێك لە شوێنە خراپەكان كەوتنە ڕێ.. وتم: ئەی ئێمە لەسەر ئەوە ڕێنەكەوتین، كە نەچین بۆ ئەو شوێنانە؟! ئەی نازانن ئەو شوێنانە خراپنو دروست نیە بچنو حەرامن؟! لە خودا بترسن!!

وتیان: خۆشی لە گەنجێتیت ببینە، وەرە با بڕۆین..

زۆر هەوڵیاندا لەگەڵ خۆیان بمبەن، بەڵام سوپاس بۆ خودا لەگەڵیان نەچووەمو ڕۆیشتمەوە بۆ ئوتێل.. دوو سێ كاتژمێرێك دانیشتم، گوێم لە دەنگی كردنەوەی دەرگای بەشەكەمان بوو، هەرچەندە من دەرگای ژوورەكەمم داخستبوو، بەڵام گوێم لە دەنگیان بوو كە هاتنەوەو هەستم كرد ئافرەتیشیان لەگەڵدایە، چونكە دەنگیان دەهات، زانیم دەیانەوێت پاشماوەی شەوە تاریكو ڕەشەكەیان لە ئوتێل بەسەربەرن..

دوای دە خولەكێك یەكێكیان هاتو لە دەرگایداو وتی: دەرگاكە بكەرەوەو وەرە بە خۆشی بژی..

دەرگاكەم نەكردەوەو وتم: من ژیانی ئاساییو خۆشی خۆم بەسەردەبەم.. بۆچی ژیان تەنها بە ئەنجامدانی گوناهو تاوان خۆش دەبێت؟! ئەگەر عەرەق نەخۆیتو كاری حەرام ئەنجام نەدەیت ژیان ناخۆش دەبێت؟! سوپاس بۆ خودا من لە ژیانێكی خۆشدامو دڵم خۆشەو پێدەكەنم، ئایا پێویست دەكات تاوان ئەنجام بدەم، بۆ ئەوەی بژیم؟! نا بەخودا دەرگاتان لێناكەمەوە..

پاشان دە خولەكێكی تر یەكێكی تریان هاتو وتی: دەرگاكە بكەرەوەو شەحنی مۆبایلمان دەوێت، كاتێك ئاوڕم دایەوە، ڕاستی دەكرد شەحنی مۆبایلەكەی لێبوو.. شەحنی مۆبایلەكەم هێناو ویستم بیان دەمێ، هەر دەرگام كردەوە، پاڵیان بە ئافرەتێكەوە ناو

کردیانە ژوورەوەو کلیلەکەیان بردو لە دیوی دەرەوە، دەرگایان لەسەر داخستم..

دەستم کرد بە هاوار هاوار، بۆ ئەوەی دەرگاکە بکەنەوە، کەچی ئەوان لە دەرەوە پێم پێدەکەنین.. ئەو ئافرەتەیان بە پارەو سامان ڕازی کرد بوو، کە بێت بۆ لای منو تووشی تاوانم بکات.. زۆر قسەم بۆ ئافرەتەکە کردو پێم دەوت: لە خودا بترسە.. دروست نیە.. حەرامە.. بەڵام هەستم کرد، هیچ سوودی نیەو هاوەڵەکانیشم لە دەرەوە قاقا پێم پێدەکەنین..

ئەمجارەیان ویستم بیترسێنم، هەر بۆیە وتم: دووربکەوەرەوە، من هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزم، لێم نزیك بیتەوە تۆش تووش دەبیت..

وتی: لە کەیەوە تووش بوویت؟

وتم: ماوەی ساڵێکی تەواوە.. وتی: ئینجا ئەوە چیە، ئاساییە من دوو ساڵە تووش بووم..

کاتێك گوێم لەو قسەیە بوو، هاوارم کردو وتم: ئایدز.. نەخۆشی ئایدز!!

هەرکە وام وت: دەرگایان کردەوەو ئافرەتەکەیان دەرکرد، بەڵام نەك لە ترسی خودا، بەڵکو لە ترسی ئایدز!!

مامۆستا بەڕاستی بۆم دەرکەوت، کە خراپەکاران ڕازی نابن تۆ کەسێکی چاك بیت، بەڵکو هەوڵ دەدەن تۆش وەکو خۆیان لێبکەنو بکەویتە ناو گێژاوی گوناهو زەلکاوی تاوانەوە..

پەروەردگار سەرفرازو پارێزراومان بکات، بە دڵنیاییەوە خراپەکاران کاتێك خۆیان خراپە دەکەن، بە منو تۆ ناڵێن: ماشاءالله ئێوە چەند کەسێکی باشو چاکو پاکن، بەڵکو هەموو هەوڵێك دەدەن تۆش وەکو خۆیان لێبکەن..

بابەتەکە ئەوەیە، ئافرەتی خراپەکار، حەز دەکات هەموو ئافرەتان خراپە بکەن.. پیاوی گوناهبار، حەز دەکات خەڵکی هەموو تاوان ئەنجام بدەن.. جاری وا هەیە کچانو کوڕان، خوشکانو برایان، پەیوەندیم پێوە دەکەنو دەڵێن: مامۆستا لە پەروەردگار بپاڕێوە، ڕێنماییمان بکات.. مامۆستا من دەمەوێت، ڕێگەی ڕاست بگرم..

موسڵمانان ئەم بابەتە تەنها بە هیواو خۆزگە خواستن نابێت، ئەوەی کاری خراپ ئەنجام بدات، بێگومان سزاکەی وەردەگرێت، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾ النساء. واتە: (پاداشتو ڕێزو نرخ نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێتو هیچ کەسو هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خودا پشتگیری



بكاتو يارمەتی بدات)..

مرۆڤ ئەگەر بەڕاستی بە شوێن ڕێنماییدا بگەڕێت، پێویستە هۆکارەکان بگرێتەبەر.. ئەگەر دار پرتەقاڵێك بنێژێت، بە دڵنیاییەوە مۆز یان ترێت بۆ ناگرێت، بەڵکو هەر پرتەقاڵ دەگرێت.. کەسانێك خۆیان ماندوو کردووەو هەوڵیانداوە، لە کۆلێژەکانی پزیشکیو ئەندازیاری وەردەگیرێن، کەسانێکیش کاتە بەنرخەکانیان لە شتی خراپو پوچدا بەسەربردووە، بێگومان دەبێت لە ماڵەوەو دەستەو ئەژنۆ دانیشن..

زۆربەی ئەو کەسانەی بەرەو خراپەو ماددە بێهۆشکارەکانو کوشتنو دزی چوون، بەهۆی هاوەڵو دەوروبەریانەوە بووە.. کەسێکی بکوژ، خۆ لە کۆگای چەکو تفەنگدا لەدایك نەبووە؟! کەسانێکی تلیاك کێش، کاتێك لەدایك بوون، خۆ دایکی داماویان خەریکی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان نەبووە؟! بەڵکو ئەمانیش وەکو هەر کەسێکی تر بە ئاسایی لەدایك بوون، بەڵام هاوەڵی خراپ بەرەو خراپە ئاراستەی کردوون، ئەمانیش نەیان توانیووە ژیانی خۆیان بگۆڕنو لەو کەسانە دوورکەونەوە..

*حەسەنی بەصری کاتێك ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە.. ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ (١٠٠) وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ (١٠١) فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ (١٠٢) إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (١٠٣) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ (١٠٤)﴾ الشعراء. واتە: (کەواتە ئێمە هیچ تکاکارێکمان بۆ نیە.. یاخود هاوڕێیەکی دڵسۆز هەوڵێکمان بۆ بدات، یان دڵخۆشیمان بداتەوە.. جا خۆزگە جارێکی تر مۆڵەتمان بدرایەو (بگەڕاینایەتەوە بۆ دونیا)و بەهۆی ئەوەوە بچینە ڕیزی ئیماندارانەوە.. بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگەو نیشانەی (بەهێز هەیە لەسەر دەسەڵاتی خودای پەروەردگار) کەچی زۆربەیان باوەڕدار نەبوون.. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی موحەممەدﷺ، ئەی ئیماندار) بالادەستە (بەسەر بێباوەڕاندا) بەسۆزو میهرەبانیشە (بە ئیمانداران)).. دەیوت: لە دونیادا هەوڵ بدەن هاوەڵی باشتان زۆر بێت.. هەوڵ بدەن ئەگەر لەگەڵ کەسانی باشدا نەبوون بە هاوەڵ، هیچ نەبێت بیان ناسن..

واتە: ئەگەر نەتتوانی ببیت بە هاوەڵو هاوڕێی مامۆستای مزگەوتەکەتان، یان پیاوچاکێك، یان بانگخوازێك، هەوڵبدە هیچ نەبێت یەکتر بناسن.. هیچ نەبێت با ناوت بزانێت.. مەرج نیە هەموو ڕۆژێك یەکتر ببینن، دەتوانن هەفتەی جارێك یەکتر ببینن.. ئەوەندەش باشە کە بە بینینی، ناوت بزانێتو بڵێت: فلانە کەس چۆنی؟

بەڵێ.. حەسەنی بەصری دەیوت: لە دونیادا با هاوەڵو هاوڕێی باشتان زۆر بێت، چونکە لە ڕۆژی دواییدا سوودت پێدەگەیەنن.. وتیان: چۆن چۆنی؟!

لە وەڵامدا حەسەنی بەصری دەڵێت: کەسانێك هەن لە ئاگری دۆزەخدانو پێغەمبەرانﷺ، یان شەهیدان، یان فریشتەکان، تکاو شەفاعەتیان بۆ دەکەن، بەڵام

کاتێك بەهەشتیەکان لە ناوخۆیاندا قسەو گفتوگۆ دەکەنو یەکێکیان دەڵێت: ئەوە خۆ فلانە هاوڕێم لە بەهەشتدا دیار نیە، دەبێت چی بکات؟! لە دونیادا هاوەڵی بووە، بێباوەڕیش نەبووە، بەلام تاوانو گوناهی هەبووە..

بەڵێ.. کاتێك هەواڵی دەپرسێت، پێی دەڵێن: لە دۆزەخدایە.. ئەم بەهەشتییەش دەڵێت: ئەی پەروەردگار با ئەو هاوەڵەشم لەگەڵدا بێت، ئەوسا لە بەهەشتدا زیاتر لە خۆشیو کامەرانیدا دەژیم.. ئەو کاتە پەروەردگار بە بەخشندەیی خۆی هاوەڵەکەی لە دۆزەخ دەردەکاتو دەیخاتە بەهەشت، کاتێك دەیخەنە بەهەشت، دۆزەخیەکان هەندێکیان پرسیار لە هەندێکیان دەکەنو دەڵێن: ئەوە کێ شەفاعەتی بۆ کرد؟!

یەکێك لە پێغەمبەران؟! ئەی یەکێك لە شەهیدان؟! کردەوەیەك لە کردەوە چاکەکانی؟!

نەخێر..

ئەی کێ؟!

دەڵێن: هاوەڵێکی بەهەشتی شەفاعەتی بۆ کردو پەروەردگاریش لە دۆزەخ دەریهێناو خستیە بەهەشت، ئەو کاتە دۆزەخیەکان دەڵێن: ﴿ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ الشعراء. واتە: (کەواتە ئێمە هیچ تکاکارێکمان بۆ نیە.. یاخود هاوڕێیەکی دڵسۆز هەوڵێکمان بۆ بدات، یان دڵخۆشیمان بداتەوە.. جا خۆزگە جارێکی تر مۆڵەتمان بدرایەو (بگەڕاینایەتەوە بۆ دونیا)و بەهۆی ئەوەوە بچینە ڕیزی ئیماندارانەوە).. خۆزگە ئیماندارانمان بناسیایە.. خۆزگە دۆستو هاوەڵی چاکەکاران بووینایە، بۆ ئەوەی ئێمەش چاك بین..

داواکارین پەروەردگار بمانکات بە هاوەڵی چاکو چاکەکاران.. آمین..

# لێبوردنو لێخۆشبوون لە خەڵکی..

* ژیان خاڵی نیە، لە هەندێك ناخۆشیو ناڕەحەتی، كە لە لایەن خەڵكیەوە تووشمان دەبێت.. كەسانێك هەن گاڵتەوگەپی زۆر بێزاركەر دەكەن.. كەسانێك هەن قسەو گوفتاریان زۆر ڕەقو زبرە.. كەسانێك هەن، بەردەوام بوون لەگەڵیاندا، كارێكی ئاسان نیە.. كەسانێك هەن ڕووداوەكان گەورە دەكەنو بە هیچ شێوەیەك لێبوردنو لێخۆشبوون لە بەرنامەیاندا نیە، بەمەش دەروونی خۆیان ئازار دەدەنو بۆ ماوەیەكی زۆر سنگیان بە هۆی ڕقو كینەوە تەسكو غەمبار دەكەن..

ولله در الحسد ما أعدله　　　　بدأ بصاحبه فقتله..

بەڵێ.. ڕقو كینەو ئیرەیی بردن، سەرەتا لە كەسەكە خۆیەوە دەست پێدەكاتو خۆی لەناودەبات.. دەی لە ئێستاوە هەوڵبدە ئازاری دەروونی خۆت مەدە، لەبەر ئەوەی هەندێك كێشە هەن، پێویست ناكات كەسیان لە سەر سزا بدەین، گەورەو دڵفراوان بە.. ڕابوردوو لە بیربەرەوەو بە خۆشیو بەختەوەری بژی..

كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ مەككەی پیرۆزی ڕزگار كرد، بانگی عوسمانی كوڕی تەڵحەی كردو داوای كلیلی كەعبەی لێكرد.. پێغەمبەری خوداﷺ چووە ژوورەوە بۆ ناو كەعبەو بینی بێباوەڕانی قوڕەیش بە نەزانی خۆیان وێنەی فریشتەكانیان لە سەر دیوارەكانی كەعبە كێشا بوو، هەروەها وێنەی ئیبراهیمعليه السلام یان كێشا بوو، زاری پێبوو، قوماری دەكرد!!

پێغەمبەری خوداﷺ كاتێك ئەمەی بینی، فەرمووی: خودا بیان كوژێت، باوكە ئیبراهیم لە كوێو ئەم كارە لە كوێ؟! ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ آل عمران. واتە: (ئاشكرایە كە ئیبراهیم نە جولەكە بووەو نە گاور، بەڵكو ملكەچو فەرمانبەرداروو موسڵمان بووەو لە دەستەی موشریكو هاوەڵگەران نەبووە)..

پاشان بڕیاریدا بە سڕینەوەی هەموو ئەو وێنانە، پاشان پەیكەری كۆترێكی بینی لە نێوان دوو چڵە داردا، بە دەستی خۆی شكاندیو فڕێیدا.. پاشان لەبەر دەرگای كەعبە وەستاو خەڵكەكەش هەموو بە بێباوەڕو باوەڕدارەوە، سەیریان دەكردو چاوەڕێی پێغەمبەری خوداﷺ بوون.. پاشان دوو ڕكات نوێژی ئەنجامدا، پاشان چوو بۆ لای ئاوی زەمزەمو لێی خواردەوەو دەستنوێژی لێگرت، موسڵمانانیش بۆ دەستكەوتنی پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەكەی پێشبڕكێیان دەكرد، بێباوەڕان كاتێك ئەمەیان لە موسڵمانان

بینی، سەرسام بوونو دەیان وت: هەرگیز هیچ پادشاو دەسەڵاتدارێکمان نەبینیوە، بەم شێوەیەی بۆ بکرێت!!

پاشان چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم ﷺو کەمێك هێنایە دواوە، لەبەر ئەوەی بە کەعبەوە نوسا بوو، پاشان لە دەرگای کەعبە وەستاو سەیری خەڵکەکەی دەکردو وتاری بۆدان، خۆزگە ئێمەش لە ناویاندا بووینایە..

پێغەمبەری خودا ﷺ لە وتارەکەیدا فەرمووی: لا إله إلا الله وحده لاشريك له.. صدق وعده.. وهزم الأحزاب وحده..

بەڵێ.. پەروەردگار پەیمانەکەی بردە سەرو بەندەکەی خۆی سەرخستو هەموو تاقمو کۆمەڵی بێباوەڕانی تێك شکاند..

پاشان سەیری گەورەکانی قورەیشی کردو فەرمووی: خەڵکی هەموو لە ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵ دروست بووە، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات. واتە: (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەك دروست کردووە (کە باوکە ئادەمو دایکە حەوایە)و کردوومانن بە چەندەها گەلو تیرەو هۆزی جۆر بە جۆر، تا یەکتر بناسنو پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە.. بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا ئەو کەسانەتانە کەزۆرتر لە خودا ترسەو فەرمانبەری خودایە، بێگومان خودا زاناو ئاگایە بە هەمووان)..

پاشان لە ڕوخساری بێباوەڕان ورد بووەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا ﷺ لەوپەڕی هێزو دەسەڵاتدا بوو، ئەوانیش لەو پەڕی بێهێزیو لاوازیدا بوون..

ئەو کەسانەی ڕۆژانێك بە درۆزن ناویان برد بوو.. ئازاریان دابوو.. لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا ﷺ خەریکی نوێژکردن بوو، ناوسکی ئاژەڵیان کرد بوو بە سەریدا!! ئەوەتا ئێستا بە زەلیلی لە بەردەمیدا وەستاونو نازانن چارەنووسیان بە چی دەگات..

پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکانی قورەیش، گومان دەبەن چیتان لەگەڵ بکەم؟

هەموو ڕاپەڕینو وتیان: خێرو چاکەمان لەگەلا دەکەیت.. تۆ براو برازایەکی بەڕێزی ئێمەی، هەروەها کوڕێکی بەڕێزیشمانی..

سەیرە!! ئایا بیریان چوو، چیان بەو برا بەڕێزەی خۆیان کرد.. ئەی هەر ئەوان نەبوون، بەو برا بەڕێزەی خۆیان دەوت: شێت.. جادوگەر.. درۆزن.. ئەی ئەگەر برای بەڕێزو کوڕی برای بەڕێزتانە، بۆچی دژایەتیان دەکرد؟! بۆ موسڵمانە لاوازو بێهێزەکانتان ئازار دەدا؟!

ئەوە بیلالە وەستاوەو تا ئێستاش شوێنەواری سزادانی ئێوە بە سەر پشتیەوە دیارە..

ئەوە عەممارە وەستاوەو لە ژێر ئەو دارخورمایەدا، زۆر درِندانە باوكو دایكیتان شەهید كرد، كەچی ئێستا دەڵێن: تۆ برای بەرِێزی ئێمەی!!

ئەی هەر ئێوە نەبوون پێغەمبەری خوداﷺ و موسڵمانانتان بۆ ماوەی سێ ساڵ لە شیوی بەنی عامردا، گەمارۆو بەند كرد، هەتا وایان لێهات لە برساندا گەڵای داریان دەخوارد!! بەزەیتان بە گریانی منداڵەكانیاندا نەهاتەوە!! ناڵە ناڵی پیرو بە تەمەنەكان سۆزیان نەجوڵاندن!! بەزەیتان بە ئافرەتانی نەخۆشو دووگیاندا نەهاتەوە!!

ئەی شەرِی بەدرو ئوحودو خەندەقتان بیرچۆتەوە؟! هەر ئێوە نەبوون رِێگەتان لە پێغەمبەری خوداﷺ گرتو نەتان هێشت بێتە شاری مەككە، بۆ ئەوەی عومرە ئەنجام بدات؟! ئێوە نەبوون لە سەرەمەرگدا، رِێگەتان لە موسڵمان بوونی مامەی پێغەمبەری خوداﷺ گرتو هانتان دەدا، بۆ ئەوەی لە سەر بتپەرستی بەردەوام بێتو باوەرِ نەهێنێت؟! ئەی ئێوە نەبوون..؟! ئێوە نەبوون..؟!

چەندان یادەوەری ترشو تاڵ، بە بیرەوەری پێغەمبەری خواداﷺ هاتنو چوون.. تەنها پێغەمبەری خوداﷺ نا، بەڵكو ئەو یادەوەریانە بە یادی ئیمامی ئەبوبەكرو ئیمامی عومەرو بیلالو عەممارو زۆرێك لە هاوەڵاندا دەهاتو دەچوو.. هەر یەكێك لە هاوەڵان چیرۆكو رِووداوی دڵتەزێنی لەگەڵ قورِەیشدا هەبوو..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ دەیتوانی قورسترین سزای بێباوەرِانی قورِەیش بدات، لەبەر ئەوەی ئەوانە بێباوەرِانی جەنگ بوون، هەروەها دەست درێژیكەر بوون، خیانەتكاریش بوون، لەبەر ئەوەی خیانەتیان لە رِێكەوتنی حودەیبیە كرد.. لەبەر ئەوەی زۆر تاوانكارو خراپ بوون، نەیاندەزانی پێغەمبەری خوداﷺ چیان لێدەكات.. پێغەمبەری خوداﷺ بە ورەیەكی بەرزو سەرێكی بڵندەوە، وتەیەكی دا بە گوێیاندا، كە هەتا هەتایە مێژوو شانازی پێوە دەكات..

بەڵێ.. فەرمووی: برِۆن ئێوە هەموو ئازادن..

بێباوەرِان لە خۆشیدا خەریك بوو باڵ بگرنو باوەرِیان نەدەكرد، ئاوا بە ئاسانی لێیان خۆش بێت!! ئایا بە رِاستی لێمان خۆش بوو؟!

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ سەیری كەعبەی پیرۆزی كرد، سێ سەدو شەست بتی تێدا بوو، هەر بۆیە بە دەستی پیرۆزی خۆی، كەوتە شكاندنی بتەكانو دەیفەرموو: حەقو رِاستی هاتنو ئاینی پرِوپووچ، پشتی هەڵكردو هەڵهات..

هەندێك لەو بێباوەرِانەی كە مێژوویەكی رِەشیان لەگەڵ موسڵماناندا هەبوو، پێش ئەوەی موسڵمانان بێنە شاری مەككە، هەڵهاتنو رِایان كرد، سەفوانی كورِی ئومەییەش یەكێك بوو لە رِاكردووانو نەیدەزانی بۆ كوێ بچێت؟! سەفوان بەرەو جەددە كەوتە

ڕێ، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی دەریاوە، بەرەو یەمەن بچێت..
کاتێك خەڵکەکە لێبوردنی پێغەمبەری خودایانﷺ بە چاوی خۆیان بینی، حەزیان دەکرد ڕاکردووەکانیش بگەڕێنەوە، هەر بۆیە عومەیری کوڕی وەهب، دێتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سەفوانی کوڕی ئومەییە، گەورەی هۆزەکەیەتیو لە دەستی تۆ ڕایکردووە، هاتووم مۆڵەتی لێخۆشبوونی بۆ وەربگرم، بۆ ئەوەی پەنای بدەی..
پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە سادەیی فەرمووی: ئەوا لێی خۆشبوومو پەنامدا.. عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ نیشانەیەك، یان شتێکم بدەرێ، بۆ ئەوەی باوەڕم پێبکات..
پێغەمبەری خوداشﷺ ئەو مێزەرەی سەر پێدا، کە لە کاتی هاتنە ناو شاری مەککەدا لە سەری کرد بوو..
عومەیر کەوتە ڕێو گەیشت بە سەفوان، لە کاتێکدا خەریك بوو سواری کەشتی دەبوو، عومەیر پێی دەڵێت: باوکو دایکم بە قوربانت بن، بۆ خاتری خودا خۆت بە هیلاك مەبەو خۆت مەفەوتێنە، ئەو نیشانەیەم بۆ هێناوی کە باوەڕم پێبکەیت، پێغەمبەری خوداﷺ پەنای داویتو لێت خۆشبووە..
سەفوانیش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: قسەم لەگەڵ مەکە، چونکە تۆ درۆزنی.. عومەیریش هاوار دەکاتو دەڵێت: سەفوان، پێغەمبەری خوداﷺ باشترینو نەرمو نیان ترین کەسە.. خۆ ئەو خزمی خۆتە.. سەرکەوتنی ئەو، سەرکەوتنی تۆیە، ڕێزو دەسەڵاتی ئەو، ڕێزو دەسەڵاتی تۆیە..
سەفوان دەڵێت: لە خۆم دەترسم.. عومەیریش دەڵێت: ئەو پێغەمبەرەﷺ زۆر لەوە نەرمو نیانو بە بەزەیی ترە، کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.. سەفوان ڕازی دەبێتو بەیەکەوە دەگەڕێنەوە، هەتا دەگەنە مەککەو عومەیر، سەفوان دەبات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.. کاتێك دەگەنە ئەوێ، سەفوان دەڵێت: عومەیر وای پێشان دەدات، کە پەنات داومو لێم خۆش بوویت؟
پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: ڕاست دەکات.. سەفوان دەڵێت: بەڵام بۆ موسڵمان بوونم، دوو مانگ مۆڵەتم پێبدە، لە سەر بت پەرستیەکەی خۆم بمێنمەوەو بیر بکەمەوە، موسڵمان بم، یان نا..
پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: چوار مانگ بۆ تۆ.. پاشان سەفوان موسڵمان دەبێتو باوەڕ دەهێنێت..
ئای لێخۆش بوونو لێبوردن لە خەڵکیو لە بیربردنەوەی ڕابوردوو چەندە بەرزو جوانە.. ئەم ڕەوشتەش ڕەوشتی مرۆڤە گەورەکانە.. بە هەرحاڵ ژیانی دونیا زۆر

کورتە.. زۆر لەوە کورتترە، کە جوانیەکانی بە ڕقو کینە، ناشیرین بکەین..

پێغەمبەری خوداﷺ لە ئیشو کارە تایبەتیەکانیشدا، هەمیشە نەرمو نیان بووە..

میقدادی کوڕی ئەسوەدﷺ دەفەرموێت: منو دوو هاوەڵم چووین بۆ شاری مەدینە، جگەلە پێغەمبەری خوداﷺ کەس میوانداری نەکردین.. پێغەمبەری خوداﷺ بردمانی بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی، کە چوار بزنی لێبوو، پاشان فەرمووی: میقداد بزنەکان بدۆشەو بیکە بە چوار بەشەوەو هەر بەشەی بۆ کەسێکتان..

میقدادﷺ دەفەرموێت: هەموو ئێوارەیەك بزنەکانم دەدۆشیو سێ بەشیمان دەخواردو بەشێکیشمان بۆ پێغەمبەری خوداﷺ هەڵدەگرت، لە کاتی گەڕانەوەیدا دەیخوارد..

شەوێکیان میقدادﷺ وەکو شەوانی تر، بزنەکان دەدۆشێتو دەیکات بە چوار بەشەوە، خۆییو دوو هاوەڵەکەی سێ بەشەکەی خۆیان دەخۆنو بەشێکیشی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ هەڵدەگرێت.. پێغەمبەری خوداﷺ لە گەڕانەوەیدا دوا دەکەوێت.. میقدادیشﷺ لە سەر جێگەکەی پاڵ دەکەوێتو لە دڵی خۆیدا دەڵێت: لەوانەیە پێغەمبەری خوداﷺ لە میوانی بێت، بەشە شیرەکەی بخۆم باشە.. هەڵدەستێت شیرەکە دەخواتو هیچ بۆ پێغەمبەری خودا ﷺناهێڵێتەوە..

میقدادﷺ دەفەرموێت: کاتێك شیرەکەم خواردەوە، سکم کەوتە جوڵە جوڵو قوڕە قوڕو لەو کارەی کردم، پەشیمان بوومەوەو لە دڵی خۆمدا وتم: ئێستا پێغەمبەری خوداﷺ بە برسێتی دێتەوەو هیچ نابێت بیخواتو دۆعام لێدەکات، هەر بۆیە لە خەفەتدا سەرم داپۆشی..

کاتێك بەشێك لە شەو تێپەڕی، پێغەمبەری خوداﷺ هاتەوەو سڵاوی کرد، سڵاوێك کە کەسێکی بەخەبەر گوێی لێبێتو خەوتوو بەخەبەر نەهێنێت.. میقداد لە سەر جێگەکەیەوەو لە ژێرەوە سەیری پێغەمبەری خودایﷺ دەکرد، کاتێك بەرەو قاپی شیرەکە ڕۆیشتو بینی هیچی تێدا نیە، سەری پیرۆزی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.. میقدادﷺ ترساو وتی: ئا ئێستا دۆعام لێدەکات، هەر بۆیە بە وردی گوێی ڕاگرت، بۆ ئەوەی بزانێت پێغەمبەری خوداﷺ چی دەڵێت: پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: خودایە خواردنو خواردنەوە بدەیت بە کەسێك، کە خواردنو خواردنەوەم دەداتێ..

کاتێك میقدادﷺ گوێی لەم دۆعایە دەبێت، حەز دەکات پیرۆزی دۆعاکە بە دەست بهێنێت، هەر بۆیە چەقۆیەك هەڵدەگرێت، بۆ ئەوەی بزنێکیان سەرببڕێتو خواردنی پێغەمبەری خودایﷺ لێ دروست بکات.. کاتێك دەستی لە بزنەکان دەدا، بۆ ئەوەی بزانێت کامیان قەڵەوە، دەستی بەر گوانی یەکێکیان دەکەوێتو دەبینێت پڕە لە شیر،

دەست لە گوانی یەکێکی تریان دەدات، ئەویش پڕ دەبێت لە شیر، هەر چواریان تاقی دەکاتەوە، گوانی هەموویان پڕ دەبێت لە شیر..

هەر چواریانی دۆشی، هەتا قاپەکەی پڕ کردو کەفی کرد، پاشان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بخۆرەوە..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەو هەموو شیرەی بینی، فەرمووی: میقداد ئەی ئەمشەو ئێوە شیرەکەتان نەخواردەوە؟! میقدادیش فەرمووی: بخۆرەوە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: میقداد هەواڵ چیەو چی ڕوویداوە؟ میقدادیش فەرمووی: بخۆرەوە دوایی بۆت باس دەکەم.. کاتێك میقدادرضي الله عنه زانی پێغەمبەری خوداﷺ تێری شیر خواردەوەو پیرۆزی دوعاکەشی بەرکەوت، لە خۆشیدا دەستی کرد بە پێکەنینو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك شەو درەنگ هاتیتەوە، منیش برسیم بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە پێغەمبەری خوداﷺ نانی خوارد بێتو میوان بوو بێت، هەر بۆیە بەشەکەی تۆشم خواردو پاشان هەموو ڕووداوەکەی گێڕایەوە..

پێغەمبەری خوداشﷺ سەرسام بوو بەوەی، چۆن ئاوا زوو گوانی بزنەکان پڕ لە شیر بوونەوە!! چۆن لە شەوێکدا بزنەکان دووجار دەدۆشرێن؟! پاشان فەرمووی: ئەمە تەنها لە سۆزو بەزەیی پەروەردگارەوەیە، ئەی بۆچی ئاگادارت نەکردمو پێشتر پێت نەوتم، بۆ ئەوەی دوو هاوەڵەکەشت لێیان بخواردایەو توشی ئەو دۆعاو پاڕانەوە خێرەش ببوونایە..

میقدادیشرضي الله عنه فەرمووی: سوێند بەو خودایەی تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردووە، مادام منو تۆ توشی ئەو دۆعا خێرە بووین، ئیتر کێ توشی ئەو خێرە دەبێت، یان نا، بە لامەوە گرنگ نیە..

# فریودەرەکان..

* بابەتێکم خوێندەوە کە تیایدا نوسرابوو: گەنجێکی موسڵمان لە بەریتانیا، بانگەوازی کۆمپانیایەك دەبینێت، سەبارەت بەوەی پێویستیان بە چەند کارمەندێك هەیە بۆ ئێشکگرتن..

گەنجە موسڵمانەکە دەچێت بۆ چاوپێکەوتن‌و کۆمەڵێکی زۆر گەنج‌و لاو دەبینێت، کە بۆ هەمان مەبەست هاتبوون.. کەسەکان یەکە یەکەو بە شوێن یەکدا، دەچوونە ژوورەوە بە مەبەستی چاوپێکەوتن.. هەر کەسێك لە چاوپێکەوتنەکە تەواو دەبوو، پاشان دەهاتە دەرەوەو لێیان دەپرسی: چیان لێ پرسیت؟! ئەی چیت وەڵامدانەوە؟!

گرنگترین پرسیار کە لیژنەی چاوپێکەوتن‌و تاقیکردنەوە دەیکرد، بریتی بوو لەم پرسیارە: ڕۆژانە چەند پەرداخ عەرەق دەخۆیتەوە؟

سەرە هاتە سەر گەنجە موسڵمانەکەو چووە ژوورەوەو پرسیار لە دوای پرسیار وەڵامی دانەوە، هەتا گەیشتە ئەو پرسیارەی: ڕۆژانە چەند پەرداخ عەرەق دەخۆیتەوە؟

گەنجەکە دوودڵ دەبێت‌و نازانێت درۆ بکات‌و وەکو ئەوانەی تر بڵێت: ڕۆژی ئەوەندە پەرداخ عەرەق دەخۆم، بۆ ئەوەی پێی نەڵێن: تۆ موسڵمانێکی توندڕەویت، یان بە ڕاستی وەڵام بداتەوەو بڵێت: من موسڵمانم‌و لە لای ئێمە عەرەق حەرام‌و قەدەغەکراوەو بە هیچ شێوەیەك عەرەق ناخۆمەوە!!

دوای بیرکردنەوەیەکی خێرا، بڕیار دەدات بە ڕاستی وەڵام بداتەوە، هەر بۆیە دەڵێت: من عەرەق ناخۆمەوە..

ئەوانیش دەڵێن: بۆچی، نەخۆشیت؟! گەنجەکە دەڵێت: نەخێر.. بەڵکو من موسڵمانم‌و عەرەق لە لای ئێمە حەرامە.. ئەوانیش دەڵێن: تەنانەت لە پشووی کۆتای هەفتەشدا هەر ناخۆیتەوە؟! گەنجەکەش دەڵێت: نەخێر.. بە هیچ شێوەیەك ناخۆمەوە..

بە سەرسامیەوە سەیری یەکتر دەکەن‌و زۆر لە لایان سەیر دەبێت!! کاتێك ئەنجامی چاوپێکەوتنەکە دەردەچێت، ناوی گەنجەکە لە ناوەکانی پێشەوەی وەرگیراوەکان دەبێت.. گەنجەکە دادەمەزرێت‌و دوای چەند مانگێك یەکێك لە بەرپرسەکانی کۆمپانیاکە دەبینێت‌و پێی دەڵێت: بۆچی پرسیاری عەرەقتان لە هەمووان کردو زۆر دوبارەتان دەکردەوە؟!

بەرپرسەکەش دەڵێت: لەبەر ئەوەی کارەکەی ئێمە سەبارەت بە ئێشکگرتن بوو، هەر گەنجێکمان دادەمەزراند، عەرەق خۆر بوو، دوای ئەوەی سەرخۆش دەبوو، شوێنەکەی

جێدەهێشتو دزیمان لێدەکراو زەرەرمان لێدەکەوت.. کاتێك تۆمان بینیو زانیمان کە عەرەق ناخۆیت، دامانمەزراندیو ئەو کەسەمان دەستکەوت کە بە دوایدا دەگەڕاین..

ئای چەند جوانە مرۆڤ خاوەنی بیرو باوەڕێکی دامەزراو بێتو لە پێناو خۆشیەکانی دونیادا، دەستی لێ هەڵنەگرێتو جێگیرو خۆڕاگر بێت.. کێشەی ئێمە ئەوەیە، لە کۆمەڵگەیەکدا دەژین، کەسانێکی کەم پابەندن بە بیرو بۆچوونەکانیانەوە.. کەمن ئەو کەسانەی لە پێناوی بنەماو بیرو باوەڕیاندا، دەژینو دەمرن..

کاتێك بە بیرو باوەڕتەوە پابەند دەبیتو بە ڕێگەی ڕاستو دروستدا هەنگاو هەڵدەنێی، خاوەن بیرو بۆچوونە پڕوپووچەکان وازت لێناهێننو دەبێت چاوەڕێی فڕوفێڵو پیلانەکانیان بیت!! کاتێك بەرتیل وەرناگریت، هاوکارە بەرتیل خۆرەکانت لێت توڕە دەبن.. کاتێك داوێن پیسیو زینا ئەنجام نادەیت، خراپەکارانو بێڕەوشتان توڕە دەبن..

* دەگێڕنەوە ئیمامی عومەرﷺ شەوێك لە شەوان بە شاردا دەگەڕاو چاودێری ژیانو ئاسایشی خەڵکی دەکرد، لە تاریکی شەودا بە لای ماڵێکدا دەڕوات، گوێی لە دەنگی پێکەنینو گاڵتەوگەپێکی زۆر دەبێت، وەك ئەوەی دەنگی چەند کەسێکی سەرخۆشی تێدا بێت.. دەیەوێت لە دەرگاکەیان بدات، بەڵام دەترسێت گومانەکەی هەڵە بێت، هەربۆیە لە دەرگا نادات، بەڵکو پارچەیەك خەڵوز هەڵدەگرێتو بە نیشانەیەك دەرگای ماڵەکە نیشان دەکاتو دەڕوات..

خاوەن ماڵەکە گوێی لە دەنگی دەرگاکەیان دەبێت، دێتە دەرەوەو نیشانەیەك لە سەر دەرگاکەیان دەبینێت، کاتێك لە دوورەوە پشتی ئیمامی عومەریشﷺ دەبینێت، لە ڕووداوەکە تێدەگاتو دەزانێت ئەو نیشانەیەی سەر دەرگاکەیان، کاری ئیمامی عومەرە..

پیاوەکە پێویست بوو، نیشانەی سەر دەرگاکەیان بسڕێتەوە، بەڵام وای نەکرد، بەڵکو پارچە خەڵوزێك هەڵدەگرێتو هەمان نیشانە لە دەرگای دراوسێکانی دەداتو ماڵەکەی خۆی لە ناویاندا ون دەکات!! وەکو ئەوەی بیەوێت هەموو دەرودراوسێکانی بهێنێتە ئاستی خۆیو وەکو خۆی ناشرینیان بکاتو سەرخۆش بن!!

بەڵێ.. نەیویست ئاستی خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئاستی دراوسێکانی، بەڵکو ویستی ئەوان بهێنێتە ئاستی خۆی..

بە دڵنیاییەوە کەسی زیناکەر، حەز دەکات هەموو کەس زینا کارو داوێن پیس بن.. کاتێك ئافرەتێك دەبینێت بەردەوام درۆ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات، کەسێکیش ئامۆژگاری دەکات، بۆ ئەوەی واز لەو کارە ناشیرینە بهێنێت، کەچی لە باتی ئەوەی بە گوێی بکات، حەز دەکاتو هەوڵیش دەدات بۆ ئەوەی ئەویش وەك خۆی ماڵ وێران

بکاتو دەڵێت: پیاوان هەر ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەیت باشە.. ئیشو کارەکان بە درۆکردن نەبێت ناڕوات..

بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك کاتێك ڕاستگۆیە لەگەڵ فەرمانبەرەکانیداو خاوەن هەڵسوکەوتێکی جوانەو دڵی ئاسودەیەو بەختەوەرە لە ژیانیدا، کاتێك بەڕێوەبەرێکی خراپ دەبینێت، لە باتی ئەمیش وەکو ئەو خۆی چاك بکات، کەچی پێی دەڵێت: وامەکەو وابکە.. ڕووی خۆش مەدە بە کارمەندەکانت.. دەم بە خەندە مەبە..

دوکاندارێکی جگەرەفرۆش کاتێك دوکاندارێکی هاوڕێی دەبینێت، جگەرە نافرۆشێت، حەز دەکات ئەویش وەك ئەم بێتو پێی دەڵێت: بۆ ئەوەی قازانج زیاتر بکەیت، بۆچی جگەرەش نافرۆشیت؟!

دەی پاڵەوان بەو لە سەر بیرو باوەڕە جوانەکانت دامەزراوو خۆڕاگربەو بە هەموو هێزێکەوە بڵێ: نەخێر.. هەرگیز ناتوانن هەڵمخەڵەتێنن.. هەر لە کۆنیشەوە بێباوەڕان زۆر هەوڵیان دەدا، پێغەمبەری خوداﷺ لە بیرو باوەڕەکەیدا سازشکاری بکات.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ ﴾ القلم. واتە: (تۆ هەرگیز بە قسەی ئەوانە مەکە، کە باوەڕیان بە تۆ نیەو بەرنامەکەت بە درۆ دەزانن.. ئەوانە ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بنوێنیت، ئینجا ئەوانیش نەرمی بنوێنن)..

دەی ئاگادارو وریابەو هەرگیز واز لە بیرو باوەڕە جوانەکانت نەهێنیتو وریابە هەڵتنەخەڵەتێنن..

# ڕاستگۆیی..

* بیرم دێت ڕۆژێك له هۆڵی تاقیکردنەوەدا، چاودێری قوتابیەکانم دەکرد، تاقیکردنەوەکەش له ڕۆژی پێنج شەممەدا بوو، هەر چەندە ڕۆژی پێنج شەممە مۆڵەتو پشوو بوو، بەڵام له بەر زۆری وانەکان ناچار بووین تاقیکردنەوەی تێدا ئەنجام بدەین.. له دوای دەست پێکردنی تاقیکردنەوەکە بە چەند خولەکێك، قوتابیەك هات، کە دواکەوتبوو، ئەو هەژارە زۆر شڵەژا بوو، پێم وت: ببورە درەنگ هاتیت، ڕێگەت نادەم تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت.. داوای کرد ڕێگەی بدەم..

وتم: چی بووە هۆی ئەوەی دوابکەویت ؟!

وتی: بڕوا بکە خەوم لێکەوتبوو..

بە ڕاستگۆییەکەی سەرسام بووم، هەر بۆیە وتم: فەرموو..

دوای چەند خولەکێکی تر، قوتابیەکی تر هات.. وتم: چی بووە هۆی ئەوەی دوا بکەویت؟!

وتی: سوێند بە خودا ڕێگە زۆر قەرەباڵغ بوو، خۆت دەزانی بەیانیان خەڵکی دەچن بۆ سەر کارەکانیان، یەکێك بۆ زانکۆ.. یەکێك بۆ کۆمپانیا.. یەکێك بۆ شوێنێکی تر.. زۆرێك قسەی کرد، بۆ ئەوەی پێم بسەلمێنێت کە ڕێگە قەرەباڵغ بووە.. ئەو داماوە بیری چوو بوو، ئەمڕۆ پشووی فەرمیە.. لەوانەیە شەقامەکان تەنها قوتابیەکانی ئێمەی لێبووبن!!

وتم: شەقامەکان قەرەباڵغ بوون ها؟! ئۆتۆمبیلەکانیش زۆر بوون؟!

وتی: بەڵێ.. سوێند بە خودا هەر دەڵێی لەگەڵمدا بووی!!

وتم: ئەگەر درۆ دەکەیت، بزانە چۆن دەیکەیت.. برای خۆم، ئەمڕۆ پێنج شەممەیەو پشووە!! کام شەقام قەرەباڵغ بوو؟!

وتی: ئاە!! بە ڕاستی بیرم چوو پێت بڵێم: یەکێك له تایەکانی ئۆتۆمبیلەکەم پەنچەر بوو، وەستام بۆ ئەوەی چاکی بکەمەوە!!

داماوە زۆر تێکچوو بوو، پێکەنیمو پاشان ڕێگەمداو چووە ژوورەوە بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەکەی ئەنجام بدات..

ئای چەندە ناشیرینە، کاتێك بۆ خەڵکی ڕوون دەبێتەوە، کە درۆت لەگەڵ کردوون!! درۆ خەڵکیت لێ دەڕەوێنێتەوەو باوەڕیان پێت نامێنێتو متمانەت پێناکەن.. وات لێدێت، کە دۆستەکانت کێشەیەکیان بۆ دروست دەبێت، داوای یارمەتیت لێناکەن،

هەروەها کاتێك قسە دەکەیت، گوێت لێناگرن.. ئای درۆ چەندە ناشیرینو بێزراوە؟!

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوداﷺو وتیان: موسڵمان ترسنۆك دەبێت؟

فەرمووی: بەڵێ..

وتیان: ئەی چروكو ڕەزیل دەبێت..

فەرمووی: بەڵێ.. وتیان:

ئەی موسڵمان درۆزن دەبێت: فەرمووی: نەخێر. (رواه مالك)..

عبداللەی کوڕی عامرؓ دەفەرموێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لەماڵمان دانیشتبوو، دایکم بانگی کردمو وتی: وەرە شتێکت بدەمێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەتەوێت چی بدەیتێ؟ دایکیشم وتی: خورمای دەدەمێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەگەر پێت نەدایە، ئەوا درۆیەکت لە سەر دەنوسرا. (رواه أبوداود)..

کەسانی درۆزن، زۆر پەیمان دەدەنو ناشی بەنە سەرو پۆزشو بیانووی جۆراو جۆریش دەهێننەوە، بۆ ئەوەی ڕازیت بکەن، زۆر زووش درۆکەیان دەردەکەوێتو ئاشکرا دەبن..

* ئیمامی زوهری لە لای کاربەدەستێك شایەدییەك دەدات.. کاربەدەستو دەسەڵاتدارەکەش دەڵێت: درۆ دەکەیت..

ئیمامی زوهری هاوار دەکاتو دەڵێت: پەنا بە خودا.. من درۆ دەکەم؟! سوێند بە خودا ئەگەر بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگ بکاتو بڵێت: خودا درۆی حەڵاڵ کردووەو ڕێگەیداوە درۆ بکەن، ئینجا درۆ ناکەم، ئەی چۆن درۆ دەکەم لە کاتێکدا کە حەرامو قەدەغەکراو بێت؟!

# خوداپەرستی نهێنیو شاراوە..

* دە ساڵێك لەمەوبەرو لە ڕۆژێکی بەهارو شەوێکی ساردا، لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانمدا، لە گەشتێکدا بووین.. یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکانمان لەکارکەوتو ناچاربووین لەو شوێنەدا بمێنینەوە.. ئاگرمان کردەوەو بە دەوریدا دانیشتین..

چەند جوانو خۆشە، لە شەوێکی ساردا، لە دەوری ئاگر گوێ بیستی قسەی خۆش بین!! دانیشتنەکەمان درێژەی کێشا.. تێبینی ئەوەم کرد یەکێك لە هاوەڵانمان، کە کەسێکی زۆر چاكو بۆ خودا گونجاو بوو، لە نێوانماندا هەستاو دوورکەوتەوە!! ئەو هاوەڵەمان زۆر جار خوداپەرستی بە نهێنی ئەنجام دەدا.. ڕۆژانی هەینی دەمبینی زۆر بە زوویی، دەچوو بۆ مزگەوت، بەڵکو جاری وا هەبوو هێشتا دەرگای مزگەوت نەکرابووەوە، دەچوو بۆ مزگەوت..

بەڵێ.. لە ناوماندا هەستاو هەندێك ئاوی لەگەڵ خۆی برد، گومانم وا بوو دەچێت بۆ ئەوەی دەست بە ئاو بگەیەنێت.. کاتێکی زۆری پێچوو، منیش کەوتمە چاودێری کردنی.. کاتێك بینیم، لێمان دوورکەوتبۆوەو لەتاو سەرما پەشتەماڵێکی لە خۆی پێچابوو، سەری خستبووە سەر زەویو لەو تاریکیەداو بە تەنها خەریکی نوێژکردن بوو.. بە ئاشکرا پێوەی دیار بوو، کە پەروەردگاری خۆشدەوێت، وا گومانم دەبرد، پەروەردگاریش ئەوی خۆش بووێت..

دڵنیا بووم، ئەو جۆرە چاکەو خوداپەرستیە نهێنیانە، مایەی سەربەرزی دونیاو دوارۆژە.. چەندین ساڵ تێپەڕی.. ئەمرۆ ئەو پیاوە بووە بە کەسێکی بانگخوازو خۆشەویستی خەڵکیو هۆکار بووە بۆ ڕێنمایی کردنی چەندین کەس.. کاتێك لە مزگەوت یان لە بازاڕ دەبینرێت، منداڵو بچوکەکان پێش گەورەکان پێشبڕکێ دەکەن، بۆ ئەوەی چاكو چۆنی لەگەڵ بکەن.. زۆرێك لە بازرگانو پیاوە ناودارو دەسەڵاتدارەکان، خۆزگە دەخوازن، وەکو ئەو هاوەڵەمان لە دڵی خەڵکیدا خۆشەویست بن، بەڵام ئەوە زۆر دوورە!!

کەسێك شەونخونی بکاتو کەسێکیش شەوان دەست لە ملانی خەو بێت، ئایا کەسی دووەم دەتوانێت بە کەسی یەکەم بگات؟!

بێگومان نەخێر.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾﴾ مریم. واتە: (بە ڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە ئایندەدا خودای میهرەبان سۆزو خۆشەویستیو ڕێزی تایبەتییان بۆ ئامادە دەکات، (هەروەها لە لایەن فریشتەکانو ئیماندارانو نیشتەجێکانی

بەهەشتەوە) خۆشەویستو ڕێزدارن)..

بەڵێ.. کاتێك پەروەردگار خۆشی بووێت، خەڵکی سەرزەویش خۆشیان دەوێت.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: پەروەردگار کاتێك کەسێکی خۆش بووێت، بانگی جوبرائیل دەکاتو دەفەرموێت: بە دڵنیاییەوە من فلانە کەسم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بووێت.. جوبرائیلیش ئەو کەسەی خۆش دەوێتو پاشان بانگی فریشتەکانی ئاسمان دەکاتو دەفەرموێت: پەروەدگار فلانە کەسی خۆش دەوێتو ئێوەش خۆشتان بووێت، فریشتەکانیش هەموویان ئەو کەسەیان خۆشدەوێت، پاشان دانیشتوانی سەر زەویش خۆشیان دەوێت..

بە هەمان شێوە ئەگەر پەروەردگار ڕقی لە کەسێك بێت، بانگی جوبرائیل دەکاتو پێی دەفەرموێت: ڕقم لە فلانە کەسەو تۆش ڕقت لێی بێت، جوبرائیلیش ڕقی لەو کەسە دەبێتو پاشان بانگی فریشتەکانی ئاسمان دەکاتو دەفەرموێت: پەروەردگار ڕقی لە فلانە کەسەو ئێوەش ڕقتان لێی بێت.. فریشتەکانیش هەموو ڕقیان لێی دەبێت، پاشان دانیشتووانی زەویش ڕقیان لێی دەبێت. (رواه البخاري ومسلم)..

ئای چەندە خۆشە، کەسێك لە سەر زەوی ژیان بە سەربەرێتو بخەوێتو بخواتو بخواتەوە، پەروەردگاریش لە ئاسمانەوە بە ناوەکەی خۆیەوە بانگی بکاتو بفەرموێت: من فلانە کەسم خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بووێت!!

زوبێری کوڕی عەوامﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك دەتوانێت بە نهێنی کرداری چاك ئەنجام بدات، با بیکات..

کرداری چاکەو پەرستشە نادیارەکانیش جۆراو جۆرن، لەوانە:

* ئەنجامدانی شەونوێژ، ئەگەر تەنها ڕکاتێکی وەتریش بێت، جا ڕاستەوخۆ لە دوای نوێژی خەوتنان بێت، یان پێش خەوتن، یان پێش نوێژی بەیانی، بۆ ئەوەی لە لای خودای پەروەردگار لە ڕیزی ئەو کەسانەدا ناوت تۆمار بکرێت، کە شەونوێژ ئەنجام دەدەن.. پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: (إن الله وتر يحب الوتر، فأوتروا ياأهل القرآن).. واتە: (پەروەردگار تاکەو تاکی خۆش دەوێت، ئەی دۆستانی قورئان نوێژی وەتر ئەنجام بدەن)..

* هەروەها هەوڵدان بۆ یەکخستنو ئاشت کردنەوەی نێوان خەڵکی.. نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان دراوسێکاندا، هەروەها لە نێوان هاوسەرو خوشکو براکاندا.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (ألا أخبركم بأفضل من درجة الصلاة والصيام والصدقة؟ قالوا: بلى.. قال: إصلاح ذات البين). رواه أحمد. واتە: (ئایا لە کارێك ئاگادارتان بکەم، کە پلەی لە نوێژو ڕۆژوو خێرو خێرات چاکتر بێت؟ هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: یەکخستنو ڕێکخستنی نێوان خەڵکی)..

* هەروەها زۆر یادی خودا کردن، لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك کێی زۆر خۆش

بوویێت، زۆر باسی دەکات.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئایا ئاگادارتان بکەم بە باشترین‌و پاکترین‌و چاکترین‌و بەرزترین کردارەکانتان لە لای پەروەردگارو باشتر بێت بۆتان لە بەخشینی زێڕو پارە، لەوەش چاکتر بێت، کە بە دوژمنەکانتان بگەن‌و لە گەردنیان بدەن‌و ئەوانیش لە گەردنتان بدەن؟ هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زیکرو یادی پەروەردگار. (رواه أحمد والترمذي)..

زۆر یادکردنی پەروەردگار هۆکارێکە بۆ گیرابوونی نزاو پاڕانەوەکان، وەك لەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەدا دەردەکەوێت:

* ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) جارێك لە جاران ڕێی دەکەوێتە ناوچەیەك، دوای نوێژی خەوتنان، ئیمامی ئەحمەد دەیەوێت لە مزگەوتەکەدا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی خانەخوێیەکی ناسیاوی نابێت‌و حەزیش ناکات خۆی بە خەڵکەکە بناسێنێت، لەبەر ئەوەی خەڵکەکەش بە کارگوزاری مزگەوتەکەشەوە نایناسن، هەر بۆیە کارگوزارەکە مزگەوتەکە دادەخات‌و ئیمامی ئەحمەد دەکاتە دەرەوە..

ئیمامی ئەحمەدیش هەر چۆنێك بێت تا نزیك بەرەبەیان لە کوچەو کۆڵانەکاندا دەیگوزەرێنێت، نزیك بەرەبەیان کابرایەکی نانەواچی دێت‌و نانەواخانەکەی دەکاتەوە، کاتێك ڕێبوارێك دەبینێت، بە تەنها لە کۆڵاندایە، بانگی دەکات‌و پێی دەڵێت: وەرە ژوورەوە کەمێك خۆت گەرم بکەرەوە..

ئیمامی ئەحمەد دەچێتە ژوورەوەو دادەنیشێت، ماوەیەك دەمێنێتەوەو دەبینێت ئەم پیاوە بەردەوام یادی پەروەردگار دەکات‌و هەمیشە زمانی دەجوڵێت‌و خەریکی وتنی: سبحان اللهو أستغفراللهو الحمدللهو اللهأكبره..

ئیمامی ئەحمەد سەرسام دەبێت، چونکە کەسێکی نەبینیووە ئاوا بەم شێوەیە بەردەوام یادی پەروەردگاری بکات، هەر بۆیە پرسیاری لێدەکات‌و پێی دەڵێت: لە کەیەوە بەم شێوەیە ئاوا بەردەوام یادی پەروەردگارت دەکەیت؟!

پیاوەکەش دەڵێت: ماوەیەکی زۆرە ئەوەندەی پێم کرا بێت، زمانی خۆم بە یادی پەروەردگارەوە خەریك کردوە..

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: لە ئەنجامی ئەم کارەتدا چیت بە دەست هێناوەو چ سوودێکت لە ژیانی دونیادا لەم کارەت بینیووە؟!

پیاوەکەش دەڵێت: هەرچیم لە خودای پەروەردگار داوا کردبێت، پێی بەخشیووم، تەنها یەك شت نەبێت!!

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: ئەو شتە چیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: داوام لە پەروەردگار کردووە، بە چاوی خۆم ئیمامی ئەحمەد ببینم‌و بە خزمەتی بگەم.. ئیمامی ئەحمەدیش دەفەرموێت: دەی مۆژدە بێت من

ئیمامی ئەحمەدەو بە قاچەکانی خۆم هاتووم بۆ لات.. سبحان الله!!

* یەکێکی تر لە کارە نهێنییەکان بریتیە لە: چاکەکردنو بەخشین بە نهێنی، چونکە بەخشین بە نهێنی، دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ڕقو تووڕەیی پەروەردگار..

ئیمامی ئەبوبەکرﷺ لە دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، دەچوو بۆ دەرەوەی شاری مەدینەو کەمێك دەمایەوەو پاشان دەگەڕایەوە..

ئیمامی عومەرﷺ لەم کارەی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ سەری سوڕما بوو، هەر بۆیە ڕۆژێك لە دوای نوێژی بەیانی دەکەوێتە شوێنی، هەتا ئیمامی ئەبوبەکرﷺی بینی، خۆی بە ڕەشماڵێکی کۆنو ڕزیودا کرد..

ئیمامی عومەرﷺ لە پەنای گاشە بەردێکدا خۆی حەشارداو پاش کەمێك ئیمامی ئەبوبەکر ﷺلە ڕەشماڵەکە هاتە دەرەوەو ڕۆی.. ڕاستەوخۆ ئیمامی عومەرﷺ خۆی کرد بە ڕەشماڵەکەداو بینی تەنها ئافرەتێکی لاوازی نابینای تێدایە، لەگەڵ چەند کچۆڵەیەکی بچووك.. ئیمامی عومەرﷺ پرسی: ئەوە کێ بوو هات بۆ لاتان؟! ئافرەتەکەش دەڵێت: نایناسم، بەڵام دەزانم پیاوێکە لە موسڵمانانو ماوەیەکی زۆرە هەموو بەیانیەك سەرمان لێدەدات..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: کە دێت چی دەکات؟! ئافرەتەکە دەڵێت: ماڵەکەمان بۆ گسك دەداتو هەویرمان بۆ دەشێلێتو شیرمان بۆ دەدۆشێتو هەر پێویستیەکی ترمان هەبێت، بۆمان ئەنجام دەداتو پاشان دەڕوات..

ئیمامی عومەر دێتە دەرەوەو ئاهێك هەڵدەکێشێتو لەبەر خۆیەوە دەڵێت: بە ڕاستی ئەی ئەبوبەکر بەم کارانەت جێنیشینەکانی دوای خۆت هیلاکو ماندوو کرد!!

ئیمامی عومەریشﷺ لەم کارانەدا زۆر دوور نەبوو، لە ئیمامی ئەبوبەکرﷺ، ئەوەتا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێکیان لە تاریکی شەودا ئیمامی عومەرم بینی خۆی کرد بە ماڵێکدا، پاشان هاتە دەرەوەو خۆی کرد بە ماڵێکی تردا.. منیش سەرم سوڕماو لە دەروونی خۆمدا وتم: دەبێت ئیمامی عومەر لەو ماڵەدا چی بکات؟! کاتێك ڕۆژ بووەوە، چووم بۆ ماڵی یەکەمیان.. کاتێك چوومە ژوورەوە، پیرێژنێکی نابینا دانیشتبوو.. وتم: ئەو پیاوەی شەو بۆچی هات بۆ لاتان؟!

پیرێژنەکەش لە وەڵامدا وتی: ماوەیەکی زۆر زۆرە، پەیمانی پێداوم دێتو پێداویستیەکانم بۆ جێبەجێ دەکاتو پاشان دەڕوات..

تەڵحە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، بە خۆی دەڵێت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی تەڵحە، چاودێری عومەر دەکەیتو بە دوای عەیبو عاریدا دەگەڕێیت؟!

شەوێکی تریان ئیمامی عومەرﷺ دەچێت بۆ دەرەوەی شاری مەدینەو پیاوێکی ڕێبوار دەبینێت، لە نزیك ڕێگەکە ڕەشماڵێکی هەڵداوەو زۆر بە شپرزەیی لە بەردەم دەرگای ڕەشماڵەکە دانیشتووە.. ئیمامی عومەرﷺ کاتێك ئەم پیاوە بەم شێوە دەبینێت،

لێی دەپرسێتو دەڵێت: تۆ کێیت؟! پیاوەکەش دەڵێت: ڕێبوارێکمو هاتووم بۆ لای ئەمیری ئیمانداران بۆ ئەوەی یارمەتیەکم بدات..

ئیمامی عومەرﷺ لەم کاتەدا، لە ناو ڕەشماڵەکەدا گوێی لە ناڵە ناڵی ئافرەتێك دەبێت، پرسیار دەکاتو دەڵێت: ئەوە چیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: ڕەحمەتی خودات لێ بێت، بڕۆ بە دەم کارو پێداویستیەوەو وازمان لێ بهێنە..

ئیمامی عومەریشﷺ دەفەرموێت: ئەمە کاری منەو پێم بڵێ..

پیاوەکە دەڵێت: ئەوە خێزانەکەمەو خەریکە منداڵی دەبێت، کەسێکی لا نیەو هیچ خواردنو خواردنەوەیەکیشمان پێ نیە..

ئیمامی عومەرﷺ زۆر بە پەلە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو خێزانەکەی، کە کچی ئیمامی عەلیەﷺ، لە ڕووداوەکە ئاگادار دەکات.. هەر شتێك پێویست بێت، ئامادەی دەکەنو هەردووکیان بەرەو دەرەوەی شاری مەدینەو بەرەو ڕەشماڵی ژنو پیاوەکە دەکەونە ڕێ.. کاتێك دەگەنە ڕەشماڵەکە، خێزانەکەی ئیمامی عومەرﷺ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتەکەو ئیمامی عومەریشﷺ لە دەرەوە لەگەڵ پیاوەکەدا خەریکی ئاگرکردنەوەو خواردن دروست کردن دەبێت..

ئیمامی عومەرﷺ کاتێك فووی لە ئاگرەکە دەکرد، دووکەڵو تەپوتۆزی دارو ئاگرەکە تێکەڵ بە ڕیشی پیرۆزی ببوون، پیاوەکەش دانیشتبوو سەیری دەکرد، لەم کاتەدا خێزانەکەی ئیمامی عومەرﷺ هاواری دەکاتو بە دەنگی بەرز دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران موژدەی ئەوە بدە بە هاوەڵەکەت، کە کوڕێکیان بوو.. کاتێك پیاوەکە گوێی لە وشەی ئەمیری ئیمانداران دەبێت، دەترسێتو دەڵێت: تۆ عومەری کوڕی خەتتابیت؟!

ئەویش فەرمووی: بەڵێ.. پیاوەکە ترساو ویستی دووربکەوێتەوە، بەڵام ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: لە شوێنی خۆت بمێنەوەو دوور مەکەوەرەوە.. پاشان ئیمامی عومەرﷺ مەنجەڵە خواردنەکەی هەڵگرتو لە ڕەشماڵەکەی نزیك کردەوەو بە خێزانەکەی وت: خواردن بدە بەو ئافرەتە.. ئافرەتەکەش لە خواردنەکەی خوارد، پاشان ئیمامی عومەرﷺ خواردنی برد بۆ پیاوەکەو فەرمووی: بخۆ تۆ ماندوویتو ئەمشەو نەخەوتوویت..

پاشان ئیمامی عومەرﷺ بانگی خێزانەکەی کرد، بۆ ئەوەی بڕۆنو بە پیاوەکەشی فەرموو: سبەینێ وەرە، بۆ لام بۆ ئەوەی شتێکت بۆ بکەین..

ڕەحمەتو سۆزو بەزەیی پەروەردگار لە ئیمامی عومەرﷺ بێت.. چەندە خۆ بە کەم زان بوو؟! چۆن بە نهێنی خودای لە خۆی ڕازی دەکرد؟! هەموو ئەم کارانەشی بە مەبەستی ئەوە بوو، خۆشەویستی خودا بە دەست بهێنێت..

عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی‌ﷺ بە شەوان توورەکە ئاردی بە پشتی هەڵدەگرتو دەیبرد بۆ ماڵە هەژارەکان، کاتێك کۆچی دوایی کرد، بینیان پشتی ڕەش بووەتەوەو شین هەڵگەڕاوە.. وتیان: ئەم پشتە، بە پشتی بارهەڵگرو کۆڵ کێش دەچێت، واش نازانین ڕۆژێك کاری بارهەڵگریو کۆڵ کێشی کرد بێت!! بەڵام کاتێك نانی سەد ماڵە بێوەژنو هەتیوی شاری مەدینە بڕا، ئەوسا زانییان کە ئەمە عەلی کوڕی حوسەین بووە، شەوانە ئاردی بۆ بردوونو ماڵە هەژارەکانی بە سەر کردۆتەوە!!

* پیاو چاکێك بیست ساڵ بە نهێنی ڕۆژ نا ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو، بە بێ ئەوەی ماڵی خۆشیان بەم کارەی بزانن.. ئەم پیاوە کاری دوکانداری دەکرد، بەیانیان کاتێك دەڕۆی بۆ سەر کارەکەی خواردنی بەیانیو نیوەڕۆی لەگەڵا خۆی دەبرد، ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژوو بووایە، خواردنەکەی دەبەخشی، ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژووش نەبوایە خۆی دەیخوارد، ئێوارانیش کاتێك دەگەڕایەوە، لەگەڵ خێزانو منداڵەکانیدا خواردنی ئێوارەی دەخوارد..

بەڵێ.. بە ڕاستی ئەو جۆرە کەسانە هەست بە خۆشەویستی پەروەردگاریان دەکەنو مەبەستیانە ڕەزامەندی خودا بە دەست بهێنن.. ئەو کەسانە، کەسانی ئیماندارو پارێزکارن، ئەو کەسانەن کە پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَـٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾ النبأ. واتە: (بە ڕاستی بۆ خوداناسو پارێزکاران سەرفرازیو خۆشیو شادیو کامەرانی فراوان ئامادەیە.. چەندەها باخچەی جوانو جۆری ترێ.. (لەو جێگەو ڕێگە خۆشانەدا هاوسەرو هاودەمی) ئافرەتانی سینە جوانو (دیمەن جوان) هاوتەمەن ئامادەیە.. لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا.. لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕوپووچو درۆو دەلەسەیەك نابیستن.. ئەمەش هەمووی پاداشتێکە (ئەی ئیماندار)، بەخششێکە بە حسابێکی ورد دەبەخشرێت بە بەختەوەران)..

دەی داوای خۆشەویستی پەروەردگارت بکە، یارمەتی ئەم داوایەشت بەوە دەبێت، کە خۆشەویستی خۆت، لە دڵی دروست کراوەکانی پەروەردگارتدا بچێنێت..

# گەورەی ئافرەتانی بەهەشت..

* ئێمە لێرەدا باسی سۆزی باوکایەتی دەکەین.. باسی میهرەبانیو بەزەیی باوک دەکەین.. باسی خۆشەویسترین منداڵی پێغەمبەری خوداﷺ دەکەین..

باسی فاطمەی کچی خەدیجە (خودایان لێ ڕازی بێت) دەکەین..

باسی کچی ئافرەتێك دەکەین، کە یەکەم کەس بوو لە پیاوانو ئافرەتان کە موسڵمان بوو.. ئەو ئافرەتەی ماڵو سەروەتو سامانەکەی کرد بە قوربانی ئیسلام..

وەرن با کەمێك لەگەڵ فاطمەدا (خودا لێی ڕازی بێت) دابنیشین.. بزانین نێوانی لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ چۆن بوو.. باسی هەندێك لەو ڕووداوانە بکەین، کە لە نێوانیاندا ڕوویانداوە.. باوکانو کچان دەتوانن سوود لەو ڕووداوانە وەربگرنو لە هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگ بداتەوە..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) پارچەیەك بوو لە پێغەمبەری خوداﷺ..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دایکی دوو گەنجەکەی گەورەی گەنجانی بەهەشتە.. دایکی حەسەنو حوسەینە..

هاوسەری پاڵەوانو تێکۆشەرو هاوەڵی بەناوبانگ ئیمامی عەلیەرضي الله عنه..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) لە هەموو کەس زیاتر شێوەو هەڵسوکەوتی لە پێغەمبەری خوداﷺ چووە.. ڕۆژێك فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو پێغەمبەری خوداشﷺ لە کۆتایی ڕۆژەکانی تەمەنیداو لەناو هاوسەرەکانیدا دەبێت..

کاتێك فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەهات بۆ لای باوکی، پێغەمبەری خوداﷺ بەرەو پیری دەچوو، هەروەها ماچی دەکردو لە جێگەکەی خۆی دایدەنیشاند، بەڵام هاتنی ئەمجارەی فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنی پێغەمبەری خوداﷺ بوو..

ئەمجارەیان پێغەمبەری خوداﷺ بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە، لەسەر جێگە ڕاکشا بوو..

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەمجارەیان کە فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) هات، پێغەمبەری خوداﷺ لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو، نەیتوانی لەبەری هەستێت، بەڵکو فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) هاتو لە تەنیشت پێغەمبەری خوداوەﷺ دانیشتو پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەخێربێیت کچەکەم، پاشان وتەیەکی چرپاند بە گوێیدا، فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) کاتێك گوێی لەم قسەیە

بوو، دەستی کرد بە گریان..

پێغەمبەری خوداﷺ وتەیەکی تری بە گوێیدا چرپاند، ئەمجارەیان فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەستی کرد بە پێکەنین..

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: هەرگیز شتی وا سەرسوڕهێنەرم نەبینیووە، گریانو پێکەنین ئاوا لەیەکەوە نزیکبن!!

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) پاشان پرسیار لە فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەکاتو هۆکاری پێکەنینو گریانەکەی لێدەپرسێت، بەڵام فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) ڕەتی دەکاتەوەو دەڵێت: نهێنی پێغەمبەری خوداﷺ ئاشکرا ناکەم..

ڕۆژەکان تێپەڕینو پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی کرد، دوبارە عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) هەمان پرسیار لە فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەکات..

ئەمجارەیان فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێت: لە جاری یەکەمدا پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: کچە شیرینەکەم، هەموو ساڵێك جوبرائیل‌ عليه السلام جارێك دەوری قورئانی پێدەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار دەوری پێکردمەوە، وا دەبینم مردنم نزیك بووبێتەوە..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئیتر منیش دەستم کرد بە گریان، جاری دووەم پێی فەرمووم: ئایا ڕازی نابیت ببیت بە گەورەی ئافرەتانی بەهەشت؟! ئیتر منیش بەو مژدە خۆشە دەستم کرد بە پێکەنین..

پێغەمبەری خوداﷺ لە دوای شووکردنی فاطمەش (خودای لێ ڕازی بێت) بە ئیمامی عەلی‌ رضي الله عنه هەر گرنگی پێدەداو خۆشەویستی بۆی کەمی نەکرد..

ماوەیەکی کەم بوو فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) شووی بە ئیمامی عەلی‌ رضي الله عنه کرد بوو، بەڵام بەهۆی زۆری ئیشو کاریماڵەوە، فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) بە تەواوی هیلاکو ماندوو ببوو.. ئافرەتانی پێشوو وەکو ئافرەتانی ئێستا نەبوون، خۆیان دەبوایە بچوونایە لە بیر ئاویان هەڵکێشایەو بە شانیان بیان هێنایەتەوەو خۆیان گەنمو جۆیان بهاڕیایەو بیان کردایە بە ئاردو هەر خۆشیان خواردنیان بۆ ئاژەڵی سواری پیاوەکانیان ئامادە بکردایە..

ئیمامی عەلی‌ رضي الله عنه بە فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: فاطمە لە ئیشو کاری ماڵ ماندوو نەبوویت؟!

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بەڵێ.. هیلاك بووم..

هاوەڵان لە سەرەتادا هەژارو نەدار بوون، ئەوەی کە کۆشیان دەکردەوە، لە پێناوی خوادا خەرجیان دەکرد، هەتا ڕۆژێك ئیمامی عەلی‌ رضي الله عنه‌و خێزانەکەی زۆر برسی دەبن، هەر بۆیە دەچێت بۆ کێڵگەو ڕەزی جولەکەیەكو پێی دەڵێت: دەمەوێت کار بکەم..

جولەکەکەش پێی دەڵێت: لەو بیرە ئاو هەڵکێشەو بیکەرە ئەو حەوزەوە، هەر دۆڵکە

ئاوێکیش بە دەنکێك خورما..

هەڵکێشانی ئاو لە بیرێکی قوڵ، خۆی ناخۆشە، جا کەسەکە برسیشی بێت، ئەوا ناخۆشتر.. بە هەر حاڵ بایی پانزە دەنك خورما هەڵدەکێشێتو دەڕواتەوە بۆ ماڵەوەو دەڵێت: ئەمە خواردنی ئێوەیە..

بەڵێ.. دوای ئەوەی ئیمامی عەلیﷺ هەست دەکات، فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) بە دەست ئیشو کارەوە زۆر هیلاکو ماندووە، دەڵێت: کارەکەرو خزمەتگوزارت دەوێت؟

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: بەڵێ.. دەمەوێت..

ئیمامی عەلیﷺ دەفەرموێت: دەی بچۆ بۆ لای باوکتو کارگوزارێکی لێ داوا بکە..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) بەرەو ماڵی باوکی کەوتە ڕێ، هەتا گەیشتە ماڵی پێغەمبەری خوداﷺو لە دەرگایداو چووە ژوورەوەو پێغەمبەری خودایﷺ نەبینی..

دوای ئەوەی لەگەڵ عائیشەدا (خودای لێ ڕازی بێت) یەکتریان ماچ کرد، نێوانیان زۆر خۆش بوو، هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ یەك نەبوو، زۆریش یەکتریان خۆش دەویست.. لە نێوان قسەکانیاندا، عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) لێی پرسی: پێغەمبەری خوداتﷺ بۆچیەو چ کارێکت پێیەتی؟

فاطمەش (خودای لێ ڕازی بێت) لە وەڵامدا فەرمووی: ئیشو کاری ماڵ، بە تەواوی ماندوویان کردووەو هاتووم داوای کارگوزارێکی لێبکەم..

عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ دێتەوە، ئاگاداری دەکەم..

پێغەمبەری خوداﷺ درەنگانێکی شەو بە ماندوویێتی دێتەوە، عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) هۆکاری هاتنەکەی فاطمەی(خودای لێ ڕازی بێت) بۆ دەگێڕێتەوەو هانی پێغەمبەری خوداشﷺ دەدات، کە کارگوزارێکی بداتێ..

سەیر بکەن عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) چەند دەروونێکی پاکی هەبووە، هانی پێغەمبەری خوداﷺ دەدات کە داوکارییەکەی فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) جێبەجێ بکات، نەشی وت: منیش مافی خۆمە داوای کارگوزار بکەم، یان بۆچی ئەو کارگوزاری دەمەوێت من نەمەوێت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ دەکەوێتە ڕێو دەچێت بۆ ماڵی ئیمامی عەلیﷺ.. ئیمامی عەلیو فاطمە تازە بوكو زاوا دەبن، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە دەرگا دەدات، ئیمامی عەلیﷺ پێی دەفەرموێت: کەمێك چاوەڕێ بکە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئێوە لەسەر جێگەی خۆتان هەڵمەستنو لە شوێنی خۆتان بمێننەوەو دەچێتە نێوانیانەوەو دادەنیشێت..

بەڵێ.. لە نێوان کچەکەیو زاواکەی، کە ئامۆزاشی دەبێت دادەنیشێت.. پێغەمبەری خوداﷺ وەکو کوڕی خۆی سەیری ئیمامی عەلیﷺ دەکات، هەر لە ماڵی خۆشیدا

گەورەی کرد بوو.. لەو کاتەدا فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) بیستو شەش ساڵ دەبێت، پێغەمبەری خوداش ﷺ نزیکەی شەست ساڵ دەبێتو زۆریش لە ئیمامی عەلی رضي الله عنه بە تەمەنتر دەبێت، جیاوازی تەمەنیان ساڵو دوو ساڵ نابێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ بە فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەمڕۆ هاتبووی بۆ لام؟

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: چیت دەوێت؟

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کارگوزارێك، یان خزمەتگوزارێکم دەوێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((ڕێنماییتان بکەم بۆ شتێك کە باشتر بێت لە کارگوزار))؟

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێك چوونە سەر جێگەی خەوتن، سیو سێ جار سبحان اللهو سیو سێ جار الحمدللهو سیو چوار جار اللهأکبر بکەن، ئەوە باشترە بۆ ئێوە لە کارگوزار))..

ئیمامی عەلی رضي الله عنه سەیرێکی فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەکاتو فاطمەش (خودای لێ ڕازی بێت) بە هەمان شێوە، پاشان فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەی کارگوزار؟

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((کارگوزارت نادەمێ.. سوێند بە خودا، هەندێك لە موسڵمانانی (أهل الصفة) لە برساندا سکیان دەگوشن))..

(أهل الصفة) هەندێك لە موسڵمانە هەژارەکان بوون، هاتبوون بۆ مەدینەو موسڵمان ببوونو نەیان دەتوانی بۆ لای کەسوکارەکانیان بگەڕێنەوە، لەبەر ئەوەی کەسوکارەکانیان موسڵمان نەبوون، لە مەدینەش شوێنو جێگەو ڕێگەیان نەبوو، ناچار لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ ژیانیان بەسەردەبردو ڕۆژانە هەندێك ئیشو کاری وەکو داربڕینیان دەکردو دەیان فرۆشتو ژیانێکی مەمریو مەژی دەژیان، ژمارەشیان زۆر ببوو، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەو کارگوزەرانە دەفرۆشمو پارەکەی دەدەم بەو موسڵمانە هەژارانە..

ئیمامی عەلی رضي الله عنه دەفەرموێت: هەرگیز وازم لەو زیکرانە نەهێنا، کە پێغەمبەری خودا ﷺ فێری کردین..

بەڵێ.. خۆیو هاوسەرەکەی هەتا لە ژیاندا بوون، هەموو شەوێك ئەو زیکرانەیان دەخوێند..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) خۆشەویستو ئازیزی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو.. لە دوای پێغەمبەری خوداش ﷺ، ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه فاطمەی لە کچو کوڕەکانی خۆی

زیاتر خۆش دەویست..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (إنا معاشر الأنبياء مانورث، ماتركناه صدقة). رواه البخاري. واتە: (ئێمەی پێغەمبەران میراتمان لێناگیرێت، ئەوەی لە دوامان جێدەمێنێت، خێرو خێراتە بۆ موسڵمانان)..

پەروەردگار فەرمانی داوە، کە هەرچیەك لە دوای پێغەمبەران جێدەمێنێت بۆ موسڵمانانە، چونکە پێغەمبەرانیش مرۆڤنو نەوەکو کۆکردنەوەی ماڵو سامان لە دونیادا کاریان تێبکات، ئەوەتا داودﷺ کاتێك کۆچی دوایی کرد، هیچ شتێك لە ماڵو سامانەکەی نەگوازرایەوە بۆ سولەیمانی کوڕیﷺ، بەڵکو تەنها پێغەمبەرایەتیەکەی گوازرایەوە بۆ سولەیمانﷺ..

هەروەها زەکەریاﷺ کاتێك داوا لە خودا دەکات کە کوڕێکی پێببەخشێت، کوڕەکەشی ببێت بە میراتگری، بەڵام میراتگری لەچیدا؟

ببێت بە میراتگری لە پێغەمبەرایەتیەکەیدا، هەروەك دەفەرموێت: ﴿فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ۝٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ۝٦﴾ مريم. واتە: (داواکارم لە بەخششی خۆت بەهرەوەرم بکەو منداڵێکم پێ ببەخشێت کە بتوانێت جێگەی من بگرێتەوە.. تا میراتی پێغەمبەرایەتی منو نەوەی یەعقوب وەربگرێت، هەروەها پەروەردگارا بیکە بە کەسێکی وا، کە تۆشو بەندە چاکەکانیشت لێی ڕازی بن)..

پێغەمبەران لە دوای خۆیان زانستو زانیاریان جێهێشتووە، نەك سەروەتو سامان، ئەوەتا کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی کرد، زرێکەی لە لای جولەکەیەك بارمتە بوو، پێغەمبەری خوداﷺ دەچێت بۆ لای جولەکەیەكو داوای هەندێك جۆی لێدەکات بۆ ماڵو منداڵیو پێی دەفەرموێت: دوای ماوەیەك بۆی دەگێڕێتەوە، یان پارەکەی دەداتێ بەڵام جولەکەکە دەڵێت: یان نرخەکەی، یان شتێکم بە بارمتە بدەرێ بۆ ئەوەی ئەگەر بۆت نەهێنامەوە، یان نرخەکەیت نەدا بیفرۆشم..

پێغەمبەری خوداشﷺ زرێکەی وەکو بارمتە دەداتێ، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی دەکات، زرێکەی لە لای ئەو جولەکەیە بارمتە دەبێ..

پێغەمبەری خوداﷺ جگە لە زەوییەك هیچی لە دوا جێنامێنێت، کە لە کاتی خۆیدا خۆیو هاوسەرەکانیو ماڵو منداڵی سوودیان لێدەبینی..

پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی دەکاتو ئیمامی ئەبوبەکرﷺ دەچێت بۆ لای فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت)و پێی دەفەرموێت: ئەی کچی پێغەمبەری خوداﷺ خۆشەویستیم بۆ تۆ، زیاترە لە خۆشەویستیم بۆ منداڵەکانم، چیت دەوێ لە ماڵو سەروەتو سامانی خۆم، لە وشترو مەڕوماڵاتو شتومەكو کەلوپەل، بیبەو دەتدەمێ، سوێند بە خودا ماڵو سامان بدەم بە تۆ، پێم خۆشترە لەوەی بیدەم بە منداڵەکانی خۆم، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ئەو زەویەی لە دوای خۆی جێهێشتووە، بۆ موسڵمانانی

جێهێشتووەو بۆ ئەوانەو دەبێت بیگێڕێتەوە بۆ ماڵی گشت موسڵمانان..

فاطمەش (خودای لێ ڕازی بێت) ڕازی دەبێت..

کاتێك گەورەی ئافرەتانی بەهەشت لە سەرەمەرگدا دەبێت، لە دوای شەش مانگ لە کۆچی دوایی پێغەمبەری خوداﷺ، ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر (خودایان لێ ڕازیبێت) دەیانەوێت ماڵئاوایی لێبکەن، مۆڵەت دەخوازنو دەچنە ژوورەوەو لەدیار سەری دادەنیشنو لە پەروەردگار بۆی دەپاڕێنەوەو ئەویش لە پەروەردگار بۆیان دەپاڕێتەوەو پاشان دێنە دەرەوە..

فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەوەندە دڵی پاك بووە، ڕقو کینەی بەرامبەر هیچ یەکێك لە هاوەڵان نەبووە، لە دوای کۆچی دوای باوکیشی، پەیوەندییەکی خۆشی لەگەڵ عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت)و سەرجەم هاوسەرەکانی باوکیدا هەبووە..

فاطمە(خودای لێ ڕازی بێت) کچی خەدیجە (خودای لێ ڕازی بێت) بوو.. پێغەمبەری خوداﷺ پەروەردەو گەورەی کرد.. لە تەمەنی هەژدەساڵیدا شووی بە ئیمامی عەلیرضي الله عنه کردو دایکی حەسەنو حوسەین بوو.. زۆربەی کات خۆیو دوو کوڕەکەی لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ بوونو پێغەمبەری خوداﷺ یاری لەگەڵ دەکردنو زۆری خۆش دەویستن..

پەروەردگار لە فاطمە ڕازی بێت.. هەروەها لە منداڵەکانیو لە هاوسەرەکەی.. پەروەردگار لە بەهەشتەکەتدا لەگەڵ فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت)و هاوسەرەکانی پێغەمبەری خواداﷺو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا کۆمان بکەیتەوە.. آمین..

# هەواڵگری..

* هەواڵگریو گەڕان بە دوای هەواڵو دەنگوباسی ئەمو ئەو، مێژوویەکی کۆنی هەیە.. لەناو هەموو گەلو نەتەوەیەکدا ئەم دیاردەیە هەبووەو هەیە، جاری وا هەیە کەسانێك، یان نەتەوەیەك بۆ خۆپاراستن لە زەرەرو زیانو لە ترسی لایەنی بەرامبەر، هەوڵیانداوە لە هەواڵی کەسانو نەتەوەکانی تر بزانن، بۆ ئەوەی خۆیانیان لێبپارێزن..

پێغەمبەری خوداﷺ ئاگاداری کردووین، کە دوور بکەوینەوە لەو دیاردەو ڕەوشتە ناشیرینە، هەروەك دەفەرموێت: (لاتجسَّسوا ولاتحسَّسوا). رواه البخاري..

هەوڵدانو بەدواگەڕان، بۆ زانینی هەواڵی خەڵکی بەبێ پرسو بەبێ مۆڵەت، کارێکی حەرامو ڕێگەنەدراوە، پێغەمبەری خوداﷺ ئاگاداری کردووین، بەبێ پرس سەیری نوسینی کەسێکی تر نەکەین، هەروەك دەفەرموێت: (لايَحلُّ لأحدكم أن ينظر في كتاب أخيه بغير إذنِهِ). رواه البخاري..

جیاوازی نێوان (تجسس)، لەگەڵ (تحسس) بریتیە لەوەی (تجسس) ئەوەیە کە کەسەکە پشت بە خۆی دەبەستێتو خۆی هەوڵی ئەوە دەدات کە زانیاریو هەواڵی لەسەر ئەو کەسە دەست بکەوێت کە دەیەوێت، بەڵام (تحسس) ئەوەیە هەواڵو زانیاری لە کەسانی ترەوە وەربگریت، لەسەر ئەو کەسەی کە دەتەوێت، وەك ئەوەی لە کەسێك بپرسیت: ئەوە هەواڵی فلانە کەس چۆنەو چی دەکات؟ بیستوومە ئەوەو ئەوەی کرد!!

بە شێوەیەکی گشتی حەزکردن بە زانینی هەواڵی ئەمو ئەو لە لای زۆرێك لە خەڵکی، یان لە لای هەموو خەڵکی هەیەو ئەم بابەتە پەیوەندی بە فەرمانگەیەك، یان وەزارەتێك، یان نەتەوەیەکی دیاریکراوەوە نیە.. جاری وا هەیە متمانەیەکی زۆرت بە کەسێك هەیەو هەواڵو دەنگوباسێکی خۆتی پێدەڵێیت، کەچی دوایی بۆت دەردەکەوێت، کە ئەم هەواڵەی تۆی گەیاندووە بە کەسانی تر، هەر بۆیە پێویستە ئێمەی مرۆڤ:

یەکەم: نهێنی خۆمان لای کەس باس نەکەین، هەروەك وتراویشە: ئەگەر کەسێك سنگو دەروونی ئەوەندە تەسكو بچوکەو جێگەی نهێنییەکانی خۆی تێدا نابێتەوە، بە دڵنیاییەوە ئەو کەسەی کە تۆ نهێنییەکەی لەلا دەدرکێنی، سنگو دەروونی لە تۆ بچوکترو تەسکترە..

دووەم: دروست نیە مرۆڤ بە دوای هەواڵی ئەمو ئەوەوە بێت، مەگەر بۆ بەرژەوەندییەکی گشتی، وەك ئەوەی کەسێك گومانی ئەوەی لەسەرە، کە کڕینو فرۆشتن بە مادده هۆشبەرەکانەوە دەکات، یان پەیوەندی حەرام بۆ ئافرەتانو پیاوان ڕێکدەخات، لەم کاتەدا دروستە لە ڕاستیو دروستی ئەم باسە بکۆڵینەوەو لایەنە پەیوەندیدارەکانی

لێ ئاگادار بکەین، تەنانەت پێغەمبەری خوداﷺ خوێنی دانەناوە بۆ کەسێك چاوی کەسێك کوێر بکات، ئەگەر ئەو کەسە سەیری ماڵی خەڵکی دەکردو بە دوای هەواڵی ئەمو ئەوەوە بوو، لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ ...﴿٤٥﴾﴾ المائدة. واتە: (چاوی یەکێك کوێر بکات، دەبێت چاوی کوێر بکرێتەوە)..

ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست چاوی کەسێکی کوێر کرد، ئەوا دەبێت بە تەواوی ئەو خوێنە بدات کە شەرع دیاری کردووە، خۆ ئەگەر بە هەڵەو نەزانیش ئەوە بکات، ئەوا دەبێت نیوەی خوێنەکە هەر بدات، مەگەر ببەخشرێت، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست چاوی کەسێکت کوێر کرد، کە بەبێ ئیزن لە دەرگاوە، یان لەسەر لێوارەوە سەیری ماڵەکەتی دەکرد، ئەوا هیچ خوێنێکت ناکەوێتە سەرو خوێنی ئەو کەسەی چاوی کوێر کراوە، بەفیرۆ دەڕوات..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (من حسن إسلام المرء ترکه مالايعنيه). واتە: (لە ڕەوشتی جوانی موسڵمان ئەوەیە واز لە شتێك بهێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت)..

هەروەها دەفەرموێت: (كفى بالمرء إثماً ان يحدّث بكل ماسمع). رواه البخاري. واتە: (ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە تاوانبارو گوناهبار بێت، کە هەرچیەکی بیست، بیگێڕێتەوەو باسی بکات)..

کەسێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کێشەیەکی هەیە، چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟ موچەی فلانە کەس چەندێکەو چەندێك نیە، تۆ حەقت چیە؟ دوێنێ لە ماڵی فلانە کەس، هاوار هاوار، دەنگە دەنگ دەهات، کێشەیەکی نێوان خۆیانە، بە تۆ چی؟ ئەوەی پەیوەندی بە تۆوە هەیەو سوودی بۆت هەیە، ئەوەیە ڕۆژانە چەندێك قورئان دەخوێنیت؟ چەندێك یادی پەروەردگار دەکەیت؟ نوێژە سوننەتەکان دەکەیت یان نا؟

* پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز شتێك پەیوەندی بەوەوە نەبووایە، نزیکی نەدەکەوتەوەو نەدەچووە وردەکارییەوە، هاوەڵە بەڕێزەکانیشی بە هەمان شێوە، هەرگیز پێغەمبەری خوداﷺ چاودێری هاوەڵێکی نەکردووە، مەگەر بۆ ئەوەی یارمەتییەکی بدات، یان باری سەر شانی سوك بکات، هەروەك ئەوەی لە یەکێك لە غەزاکاندا، کاتێك پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی دەگەڕێنەوە، پێغەمبەری خوداﷺ دەبینێت وشترەکەی جابری کوڕی عبدالله (خودایان لێ ڕازی بێت) هەر دوا دەکەوێت..

پێغەمبەری خوداﷺ لە جابرﷺ نزیك دەبێتەوەو پێی دەفەرموێت: جابر بڕۆ..

جابریشﷺ دەڵێت: وشترەکەم نەخۆشەو ناڕوات..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: وشترەکەت پەخ بدەو گۆچانێك یان دارێکم بدەرێ..

پێغەمبەری خوداﷺ بە دارەکە لە وشترەکە دەداتو لە پەروەردگاریش بۆی دەپاڕێتەوە..

وشترەکە بە یارمەتی خودا هەڵدەستێت بە گورجو گۆڵی دەست دەکات بە ڕۆیشتن..

جابرﷺو پێغەمبەری خوداﷺ سواری وشترەکانیان دەبنو لە نزیك یەکەوە

دەکەونە ڕێ.. جابرﷺ لەو کاتەدا تەمەنی بیستو یەك ساڵ دەبێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ لێی دەپرسێتو دەفەرموێت: جابر هاوسەرگیریت کردووە؟ پێغەمبەری خوداﷺ نایەوێت بچێتە وردەکاری ژیانی جابرەوە، بەڵکو بۆ ئەوە پرسیاری لێدەکات، بۆ ئەوەی بزانێت ژیانی چۆنەو چی پێویستە، بۆ ئەوەی کارێکی بۆ ئەنجام بدات..

پرسیارەکەی پێغەمبەری خوداﷺ وەکو پرسیاری ئەو کەسانە نیە، وەکو ئەمڕۆ کەسانێك هەن، پرسیار لە خەڵکی دەکەنو دەڵێن: ئەوە بیستم لەگەڵ هاوسەرەکەتدا کێشەتان هەیە؟ هۆکارەکانی چین؟

ئاخر چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟ تۆ باوکی ئەویت؟! برای ئەویت؟! ئەی لە ڕەوشت جوانی موسڵمان ئەوە نیە، کە واز لە شتێك بهێنیت، کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێت؟!

بەڵێ.. پرسیارەکەی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەوە بوو یارمەتییەکی بدات، وەکو ئەوەی بە هەژارێك بڵێیت: حاڵت چۆنە؟ لەکوێ دەژین؟ کرێی خانووەکەتان زۆرە، یان کەم؟! تۆ مەبەستت ئەوەیە ئەگەر کرێی خانووەکەیان زۆر بێت، یارمەتی بدەیت، ئەمەش لە کاتی گفتوگۆدا بۆ کەسی پرسیار لێکراو دەردەکەوێت کە ئەو کەسەی پرسیارەکە دەکات، مەبەستو نیەتی چیە..

جابرﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەری خوداﷺ هاوسەرگیریم کردووە..

پێغەمبەری خوداﷺ بەم وەڵامە زۆر دڵخۆش بوو، پاشان فەرمووی: کچ بوو یان بێوەژن؟

جابرﷺ لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بێوەژن بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی با کچ بووایە، یاریت لەگەڵ دەکردو یاری لەگەڵ دەکردی..

جابرﷺ دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ باوکم شەهید بووەو نۆ خوشکی بۆ جێهێشتووم، بۆیە کچم نەهێناوە، نەوەکو کێشە بکەوێتە نێوانیان، بێوەژنێکم هێناوە کە تەمەنی هەبێتو لەوانیش گەورەتربێت، بۆ ئەوەیی وەکو دایکیش وابێت بۆیان..

دەبینن ئەم گەنجە چۆن لە پێناو خوشکەکانی قوربانی بە خۆشییەکانی خۆیداوە، پێغەمبەری خوداشﷺ بەم هەڵوێستە جوانەی جابرﷺ سەرسام دەبێت، پاشان دەیەوێت یارمەتیەکی بدات، هەر بۆیە پێی دەفەرموێت: جابر وشترەکەتم پێنافرۆشی؟ وشترەکە باش ببوو، شان بە شانی وشتری خەڵکیو بەڵکو چاکتریش دەڕۆیشت..

جابرﷺ لە وەڵامدا دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ خۆ ئێستا وشترەکەم باش بووە، بیفرۆ م؟!

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: پێمی بفرۆشە..

جابر ﷺ دەفەرمویت: دەی بۆ خۆت..
پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: نا پێمی بفرۆشە..
جابر ﷺ دەفەرمویت: بە چەند ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ..
پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: بە درهەمێك دەیفرۆشی؟
جابر ﷺ دەفەرمویت: وشترێك بە درهەمێك، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام پارەکەی بۆ زیاد دەکات، هەتا دەگاتە چل درهەمو زیاتریش.. کاتێك پارەکە دەگاتە چل درهەم، جابر ﷺ دەفەرمویت: بەڵێ بەوەندەی دەدەدەم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڵام بەو مەرجەی تا دەگەمەوە مەدینە هەر بە خۆم بێت..

بەڵێ.. جابر ﷺ دەگاتەوە مەدینەو کەلوپەلو شمەکەکانی لەسەر وشترەکە دادەگرێت.. پێغەمبەری خودا ﷺ، بیلال ﷺ دەنێرێت بۆ لای جابر ﷺو پێی دەفەرمویت: بیلال بچۆ چل درهەمو زیاتریشی بدەرێ..

جابر ﷺ پارەکە وەردەگرێتو بیر دەکاتەوە، چی لەو پارەیە بکات؟ وشترێکی تری پێبکرێت؟ یان خوشکەکانی پێبدات بە شوو، یان خواردنو کەلوپەلی بۆ ماڵ پێبکرێت؟ ئەو وشترە هەر ئەو وشترە بوو، کە دارو ئاوی پێدەهێناو ڕۆیشتنو هاتنیشی هەر بەو وشترە بوو..

کاتێك بیلال ﷺ وشترەکە دێنێت، پێغەمبەری خودا ﷺ بە بیلال ﷺ دەفەرمویت: بیلال وشترەکە بدەرەوە بە جابرو پێی بڵێ: وشترەکەشو پارەکەش بۆ خۆت..

بیلال وشترەکە دەداتەوە بە جابرو جابریش بە سەرسامیەوە دەپرسێت: ئەوە چیە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ وشترەکەی نەویست؟!

بیلال ﷺ دەفەرمویت: نا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: پارەکەو وشترەکەش بۆ خۆت..

ئیتر جابر ﷺ بەم هەڵوێستەی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر دڵخۆش دەبێت..

بەڵێ.. پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی خەڵکی دەپرسی، بۆ ئەوەی ئاگاداری حاڵو گوزەرانیان بێتو هاوکارییان بکات..

پەروەردگار نهێنیەکانمان بپارێزێتو لە ئابڕووچوونی دونیاو دوارۆژ پەنات پێدەگرینو لە هەر شوێنێك بووین، بەڕێزو سەنگینمان بکەیت.. آمین..

# له ستەم خۆت بپارێزە..

نهێنیەکانی مێژوو زۆرن.. هەندێك ڕووداو ڕوویانداوەو هەندێك بڕیاریش لە لایەن کەسانێکەوە دراوە، کە تا ئێستاش هۆکارەکانیان بە تەواوی ئاشکرا نەبوون..

* لێرەدا باسێکی یەحیای بەرمەکی دەکەین، کە کەسایەتییەکی بەناوبانگی بەرمەکیەکانەو باوکی شیری هارونە ڕەشیدیش بووەو کەسایەتییەکی گەورەی لە لای هارونە ڕەشیدیش هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەندی کردو لە بەندیخانەدا کۆچی دوایی کرد!!

هۆکاری ئەو شکستەی بەسەر بەرمەکیەکاندا هاتو هارونە ڕەشید بۆچی وای لێکردن، چی بوو؟! نەزانراوە.. تەنانەت کاتێك لێیان پرسی: هۆکاری ئەوە چی بوو، لە بەیانیەکداو لەپڕ فەرمانی کرد هەندێك لە بەرمەکیەکان بکوژنو هەندێکی تریان بگرنو بەندیان بکەن؟

لە وەڵامدا هارونە ڕەشید دەڵێت: سوێند بە خودا ئەگەر بزانم دەستیشم ئەو نهێنیە دەزانێت، دەیبڕمەوە..

یەحیای بەرمەکی پیاوێکی بەساڵاچووی بەتەمەن بوو، هەشتا ساڵی تێپەڕاند بوو، کوڕێکیشی بەناوی خالید لەگەڵیدا لە بەندیخانە بوو.. ئەم کوڕەی زۆر چاك بوو لەگەڵ باوکیدا..

پاسەوانی بەندیخانەکە، بۆ ئەوەی سزاکەیان لەسەر قورستر بکات، ڕێگری دەکرد دار بەرنە ژوورەوەو ئاگری پێبکەنەوەو خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە.. یەحیای بەرمەکیش پیاوێکی پیر بوو، کاتێك بەیانییان دەیویست دەستنوێژ بگرێت، بەهۆی نەبوونی ئاگرو ساردی ئاوەکەوە، تووشی ناڕەحەتیەکی زۆر دەبوو.. بەندیخانەکانی ئەو کاتەش، هیچ خزمەتگوزارییەکی ئەوتۆیان تێدا نەبوو..

خالید کاتێك باوکی بەو ناڕەحەتیە دەبینێت، شەوانە کە هەموو دەخەوتن، قاپێکی پڕ لە ئاو دەکردو بەرزی دەکردەوە بۆ لای ئەو چرایەی بە بەرزییەکەوە هەڵواسرا بوو، قاپە ئاوەکەی لێ نزیك دەکردەوە، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت ساردی ئاوەکە کەم بکاتەوەو تۆزێکیش گەرم بێت.. ئەم کارەش کاتێکی زۆری دەویست، هەتا کاتی بانگ دەهات، بەم شێوەیە ئاوی بۆ باوکی گەرم دەکرد، پاشان ئاوەکەی دەدایە دەست باوکی، بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێبگرێت..

پاسەوانی بەندیخانەکە، کاتێك بەمە دەزانێت شەوان لە کاتی خەوتن بە دواوە، چراکەی دەبردە دەرەوە.. دوای ئەوەی چراکەش نەما، خالید شەوانە کاتێك باوکی

دەخەوت، قاپەکەی پڕ لە ئاو دەکردو سکی ڕووت دەکردو قاپەکەی بە سکیەوە دەنوساندو باوەشی بە قاپە ئاوەکەدا دەکردو تا بانگی بەیانی پاڵی بە دیوارێکەوە دەداو بەو حاڵەوە دەمایەوەو پاشان ئاوەکەی دەدا بە باوکی بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێبگرێت..

دەگێڕنەوە یەکێك لە پیاوەکانی لای خەلیفە تۆمەتی دزی دە ملیۆن درهەمی دەدرێتە پاڵ، لەبەر ئەوەی یەحیای بەرمەکی، خاوەنی سەروەتو سامانێکی زۆر دەبێت، پیاوەکە دێتو داوای پارمەتی دەکاتو دەڵێت، خەلیفە پێی وتووم: ئەگەر دە ملیۆن درهەم ئامادە نەکەیت، دەتکوژم..

یەحیای بەرمەکیش پارەکەی بۆ ئامادە دەکات، بەڵام پیاوەکە کاتێك دەڕوات، ڕوو دەکاتە ئەو کەسەی کە لەگەڵیدا دەبێتو دەڵێت: سوێند بە خودا لەبەر چاکەو پیاوەتی ئەوەی لەگەڵ نەکردم، بەڵکو لێم ترسا بۆیە ئەوەی لەگەڵ کردم..

ئەی کە ئەوەندە ئازایتو خەڵکی لێت دەترسن، بۆچی خەلیفە ئاوات پێدەکاتو ناتوانیت هیچ بڵێیت؟!

ئێمە لێرەدا باسی چاکەو خراپەی یەحیای بەرمەکی ناکەین.. باسی ئەوە ناکەین کە ئایا ڕاستە باپیرانی ئاگریان بە گەورە زانیوە، یان نا؟! ئەمە بابەتێکی ترە.. باسی ئەو هەڵوێستەی دەکەین کە پیاوێکی لە مردن ڕزگار کردو دە ملیۆن درهەمی بۆدا، کەچی پیاوەکە ئاوای پێووت.. کاتێك ئەو کەسەی لەگەڵ پیاوەکەی خەلیفەدا بوو، ئەم قسەیەی بۆ یەحیای بەرمەکی گێڕایەوە، یەحیای بەرمەکی دەڵێت: لەوانەیە ئەو پیاوە ئاگای لە خۆی نەبوو بێت، یان پەلە پەلی بوو بێتو بیانووی خۆشی هەیە..

یەحیای بەرمەکی، خاوەنی سەروەتو سامانو پلەوپایەیەکی زۆر بوو، بەڵام لە کتوپڕێکدا هەمووی لە دەستچوو.. ڕۆژێك خالیدی کوڕی بەهۆی سەرماو گەرماو ناڕەحەتیەکانی بەندیخانەوە، بێزار دەبێتو دەڵێت: باوکە چی ئێمەی گەیاند، بەم حاڵە؟! باوکی لە وەڵامدا دەڵێت: دۆعای ستەم لێکراوان، چونکە ئێمە لێیان بێئاگا بووین، بەڵام پەروەردگار لێیان بێئاگا نابێت..

دەڵێن: کاتێك یەحیا لە بەندیخانە مردنی نزیك دەبێتەوە، داوای پەڕەیەك دەکاتو هەندێك شتی لێدەنوسێتو دەڵێت: ئەگەر مردم بیدەن بە خەلیفە.. کاتێك دەمرێت، نوسراوەکە دەدەن بە خەلیفەو تێیدا هاتبوو، کە لە دادگای خوداو بە شایەتی فریشتەکان کۆ دەکرێینەوە.. ئەی هارونە ڕەشید تۆ ستەمت لێکردمو بەندت کردمو ئەوەی پێت کردم پێت کردم، بەڵام منیشو تۆش لە خزمەتی پەروەردگار کۆ دەکرێینەوە..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ مەعازیﷺی نارد بۆ یەمەن، مەعازﷺ لەسەر وشترەکەی بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ بە پێ دەڕۆی، پاشان پێی فەرموو: ((ئەی مەعاز لەوانەیە دوای ئەم یەکتر بینینە، ئیتر یەکتر نەبینینەوە)).. پاشان ڕاسپاردەو ئامۆژگاری کرد، چ ئامۆژگاریو ڕاسپاردەیەك؟!

مەعازﷺ لە باشترینەکانی هاوەڵان بوو.. لە حەرامو حەڵاڵدا زۆر زیرەك بوو.. لە زانستو لەبەرکردندا وەکو شاخێك وابوو.. پێغەمبەری خوداﷺ مەعازیﷺ نارد بۆ ئەوەی خەڵکی یەمەن لە ئیسلام شارەزا بکاتو فێریان بکات..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ((لەوانەیە ئەمە کۆتا یەکتربینینمان بێت، لەوانەیە بێیتەوەو بە لای مزگەوتەکەمدا، یان بە لای گۆڕەکەمدا تێپەڕیت))، هەرواش بوو.. ئیتر جارێکی تر مەعازﷺ پێغەمبەری خوداﷺی نەبینیەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ لەناو ئامۆژگاریو ڕاسپاردەکانیدا فەرمووی: ((ئەی مەعاز لە پاڕانەوەی ستەم لێکراو بترسەو (خۆتی لێ بپارێزە) چونکە لە نێوان پاڕانەوەی ستەم لێکراوو خودای پەروەردگاردا، هیچ پەردەو بەربەستێك نیە)). (رواه البخاري)..

داناو زاناکانیش وتوویانە: لە پاڕانەوەی کەسانێك بترسە، کاتێك تۆ خەوتوویتو ئەویش دۆعات لێدەکات..

نامت جفونك والمظلوم منتبهٌ          يدعو عليك وعين الله لم تَنَمِ..

بەڵێ.. تۆ دەخەویت، بەڵام ستەم لێکراو هەر بە ئاگایەو خەو ناچێتە چاویو خەوی لێناکەوێتو دۆعات لێدەکات، چاوی پەروەردگاریش هەرگیز ناخەوێتو ئاگاداری هەموو شتێکە.. کەسانێك هەن ستەمیان لە کەسانێك کردووە.. ستەم لێکراوانیش لە تاریکی شەودا دۆعا لە ستەمکارەکان دەکەنو هەر لە ژیانی دونیادا ستەمکارەکان تووشی چەندین تاقیکردنەوەو ناڕەحەتی گەورە دەبن..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ستەمکارو ئازار دەری دایكو باوك، هەر لە ژیانی دونیادا سزای تاوانەکانیان وەردەگرن.. جا سزاکەی زەرەرو زیانی بازرگانی بێت، دڵتەنگی بێت، کێشەی خێزانی بێت، یان نەخۆشیو ئازارو ناڕەحەتی بێت، ڕۆژێك تووشی کۆلیسترۆڵ دەبێت، ڕۆژێك شەکرە، ڕۆژێك فشاری خوێن.. ستەملێکراوێك لە تاریکی شەودا دۆعای لێکردوویتو تۆش بێئاگایت لێی، بەڵام پەروەردگار لێی بێ ئاگا نیە..

پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: (يقول الله تعالى: ياعبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرماً فلاتظالموا). واتە: (پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم من ستەمم لە خۆم حەرام کردووە، لە نێوان ئێوەشدا حەرامو قەدەغەم کردووە، دەی ستەم مەکەن)..

نابێت بەڕێوەبەر ستەم لە فەرمانبەران بکات.. مێرد لە ژنەکەی.. برا لە خوشکەکەی.. مامۆستا نابێت بەبێ هۆکاری دروست لە قوتابییەکەی تووڕە بێتو لێی بدات.. نابێت سەرۆك ستەم لە گەلەکەی بکات.. بە زمانت ستەم لە براکانت مەکەو غەیبەتیان مەکە.. پەروەردگار بە گەورەیی خۆیەوە، ستەمی لە خۆی قەدەغەو حەرام کردووەو بە ئێمەش دەفەرموێت: لە نێوان ئێوەشدا ستەمم حەرامو قەدەغە کردووە، فەرمانیشمان پێدەکات،

ستەم نەکەین..

فەرمانبەرێك گرێبەستەکەی تەواو بووەو دەیەوێت ڕاژەکەی بگوازێتەوە بۆ فەرمانگەیەك، یان بۆ کۆمپانیایەکی تر، بەڵام بەڕێوەبەرەکەی ڕێگەی پێنادات و کاتێك فەرمانبەرەکە داوای بڕوانامەی شارەزایی و پسپۆڕی لێدەکات، پێی نادات و نایەڵێت بڕوات و ڕێگری لێدەکات و دەڵێت: ئەگەر هەر دەڕۆی ئەوا باسی بڕوانامە مەکە..

فەرمانبەرێك لە فەرمانگەیەك، یان لە نەخۆشخانەیەك کار دەکات، کاتێك هاوڵاتییەك دێت، بەبێ هۆ مەڵێ: چاوەڕێ بکە.. بۆچی کاتژمێرێك بەبێ هۆ چاوەڕێ بکات؟! ئاخر ئۆتۆمبیلی لە سەرشەقام ڕاگرتووە.. منداڵی جێهێشتووە.. ئەویش کاری هەیەو مۆڵەتی خواستووە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((هەر کەسێك مافی برایەکی لە لایە، با بیداتەوە، پێش ئەوەی ڕۆژی دوایی بێت، کە کەس لەو ڕۆژەدا دینارو درهەمی پێنابێت)). (رواه البخاري)..

پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنیدا، چوو بۆ مزگەوت و سەرکەوتە سەر مینبەر، مزگەوتەکەش لێوان لێو بوو لە هاوەڵی بەڕێزو پارێزکار.. هەموو بە شێوەیەك سەیری پێغەمبەری خودایانﷺ دەکرد، وەکو ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە نیشتبێتەوە.. ئەو هاوەڵانە پێغەمبەری خودایانﷺ لە ماڵ و منداڵ و لە چاوی خۆیان خۆشتر دەویست..

کاتێك سەرکەوتە سەر مینبەر فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەگەر قامچییەکم لە پشتی کەسێکتان دابێت، ئەوە پشتی منەو با تۆڵەی خۆی بکاتەوە.. ئەگەر ماڵ و سامانێکم لە کەسێك وەرگرتبێت، ئەوە ماڵ و سامانی منەو چەندی دەیەوێت با بیبات.. ئەگەر قسەیەکم بە کەسێك وتبێت، با پێمی بڵێتەوە.. پاشان فەرمووی: لەوەش مەترسن کە ڕق و کینە هەڵگرم چونکە ئەوە لە منەوە دوورەو لە من ناوەشێتەوە.. هاوەڵان فرمێسك و ئەسرین بە چاو و ڕوومەتەکانیاندا دەهاتە خوارەوەو خەریك بوو دڵیان دەفڕی، هیچ کەسێکیش هەڵنەستا، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: یان بمبەخشن، بۆ ئەوەی بە دەروونێکی پاك و بێگەردەوە بچمەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارو مافی هیچ کەسێکم لەلا نەبێت. (رواه البخاري)..

بەڕێوەبەرەکان، خاوەن کۆمپانیاکان، بۆ لە کاتی خۆیدا موچەو کرێی فەرمانبەرو کرێکارەکانتان نادەن؟!

ئافرەتان.. ئەی ئەوانەی لە ماڵەوە خزمەتگوزارتان هەیە، ستەمیان لێ مەکەن.. کاری قورس و گرانیان پێمەکەن و یارمەتیان بدەن..

باوکان.. ستەم لە منداڵەکانتان مەکەن، کاتێك کوڕو کچەکانتان کاتی هاوسەرگیرییانەو تۆش لە تواناتدا هەیە، هاوسەرگیرییان بۆ بکەیت، دوایان مەخەو کاریان ڕاپەڕێنە..

ئەی ئەو خوشکانەی منداڵی پیاوەکانتان لەلایە لە ژنە مردووەکانیان، یان لە ژنە تەڵاقدراوەکانیان، ستەمیان لێ مەکەن.. قسەی ناشیرینیان پێمەڵێن..

باوکان کاتێك منداڵەکانتان داوای ئۆتۆمبیل دەکەنو لە تواناتاندا هەیە بۆیان بکڕن، ئەوا بۆیان بکڕن..

ئەی ئەو پیاوانەی لە یەك خێزان زیاترتان هەیە، لەگەڵیان یەکسان بنو ستەمیان لێ مەکەن..

دەی هەوڵ بدەن لە ستەم خۆتان بپارێزن، بۆ ئەوەی بە چاکیو بە پاکی بگەن بە خزمەتی پەروەردگارو مافی هیچ کەسێکتان لەلا نەبێتو مایەپووچ نەبن..

* ئیبن تەیمیە (خودا لێی خۆش بێت) دەفەرموێت: پەروەردگار دەوڵەتی دادگەر سەرکەوتووو بەردەوام دەکات، با بێباوەڕیش بن، بەڵام دەوڵەتی ستەمکار سەرکەوتووو بەردەوام ناکات، با موسڵمانیش بن..

تەنها ئەوەندە بەس نیە، کە ستەم نەکەینو نزیکی ستەم نەکەوین، بەڵکو پێویستە ئامۆژگاری ستەمکاران بکەین، بۆ ئەوەی واز لە ستەم بهێنن.. جا ستەم لە لایەن براوە بێت بۆ خوشك، یان لە لایەن باوکەوە بێت بۆ منداڵەکانی، یان بۆ هاوسەرەکەی، یان ستەم لە لایەن کاربەدەستانەوە بێت بۆ گەلو نەتەوەکەی، بەڵام دەبێت بە شێوەیەکی جوان ئاگاداریان بکەینو لە ستەمەکەیان ئاگاداریان بکەین..

پەروەردگار یارمەتیمان بدەیت، ستەم نەکەینو لە ستەمکاران نەبین.. آمین..

# کلیلی خراپە مەبە..

* ئەعشای کوڕی قەیس پیاوێکی دەم سپی خەڵکی نەجد بوو لە یەمامە.. لەو سەردەمەدا لە نەجدەوە گەنمو جۆ بۆ مەدینە دەنێردراو بازرگانی لە نێوان مەدینەو نەجددا هەبوو، هەروەها شمەك ڕەوانەی مەککەش دەکرا، بەتایبەت لە وەرزی حەجدا، مەککە بە ناوەندێکی بازرگانی دادەنرا..

ئەم پیاوە گەورەی هۆزەکەی بوو، شاعیرێکی زۆر بەتواناو لێهاتووش بوو.. شیعرەکانی بە زۆر شوێنو ناوچەدا بڵاوببوونەوە.. کاتێك تەمەنی نەوەد ساڵی تێپەڕاند، هاتنی هەواڵی پێغەمبەری ﷺ بیست، کە قورئانی لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ دابەزیوە..

ئەمان لەو کاتەدا بت پەرست بوون، هەر بۆیە سواری وشترەکەی بوو، کەوتە ڕێ بەرەو مەدینە، بەڵام لە ڕێگە چی ڕوویدا؟!

ئەم پیاوە لە ڕێگە هۆنراوەی بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ دەوت، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە مەدینە، تووشی هەندێك لە بێباوەڕانی قوڕەیش دەبێتو پێی دەڵێن: تۆ کێیت؟!

ئەمیش دەڵێت: من ئەعشای کوڕی قەیسم.. ئەعشا ئەوەندە شاعیرێکی گەورە بوو، هۆنراوەکانی لە بازاڕەکانی مەککەشدا دەخوێندرانەوە، هەر بۆیە بە سەرسامیەوە وتیان: تۆ ئەعشای کوڕی قەیسیت؟! ئەمیش دەڵێت: بەڵێ..

دەڵێن: دەی چیت دەوێتو بۆ کوێ دەچیت؟!

ئەعشا دەڵێت: دەچم بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو موسڵمان دەبم..

سەیرێکیان کردو وتیان: ئەعشا واز لە ئاینی خۆتو باووباپیرانت دەهێنیت!!

قوڕەیش زۆری پێناخۆش بوو ئەم پیاوە موسڵمان بێت، چونکە دەبووە زمانێکی بەهێزو پاراو بۆ پێغەمبەری خوداﷺ، پێش ئەمیش حەسانی کوڕی سابت رضي الله عنه موسڵمان ببوو، ئەمیش شاعیرێکی بەناوبانگو گەورە بوو..

هۆنراوە لەو سەردەمەدا کاریگەری زۆری هەبوو.. چەکێکی بەهێز بوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان..

دەگێڕنەوە شاعیرێك لە هۆنراوەیەکدا لۆمەو سەرزەنشتی یەکێك لە ئەمیرەکان دەکات، ئەو ئەمیرەش تووڕە دەبێتو دوای ئازاردان، هەموو گیانی پیس دەکەنو بە شاردا دەیگێڕنو زۆر سوکایەتی پێدەکەن، پاشان شاعیرەکە دەچێتەوە بۆ ماڵەوەو خۆیو جلوبەرگەکانی دەشواتو پاشان لە دێڕە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

يغسل الماء ماصَنَعتَ شعري ثابت منك في العظام الخوالي..

واتە: تۆ ئێستا منت بە شاردا گێڕاو گەورەو بچوك بە شکڵو شێوەم پێکەنینو زۆرت

سوکایەتی پێکردم..

ڕاستە سوکایەتیت پێکردم، بەڵام ئەو سوکایەتی پێکردنە، لە ماوەیەکی کەمدا کۆتایی هاتو ئەوەی پێت کردم، هەر بە ئاو پاك بۆوەو نەما، بەڵام ئەو هۆنراوەیەی من بەسەر تۆدا وتم، ئەگەر بمریتو بتکەنە گۆڕیشەوە، هەر دەمێنیو لەگەڵتدا دەبێت.. لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان کەسانێك بە لای گۆڕەکەیدا تێپەڕێتو بڵێن: ئەوە گۆڕی ئەو کەسەیە کە فلانە کەس ئەو هۆنراوەیەی لە بارەوە وتووە..

هۆنراوە تا ئێستاش کاریگەری خۆی هەیە، جاری وا هەبووە لەسەر هۆنراوەیەك، خاوەنی هۆنراوەکەیان کوشتووە.. جاری وا هەبووە کەسێك بەهۆی هۆنراوەیەکەوە، زۆر دەوڵەمەند بووە، یان لەسەر کار لابراوە، زۆر جار هۆنراوەیەك بووە بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگو هەرایەکی گەورە..

بەڵێ.. قورەیشیەکان کاتێك ئەعشای کوڕی قەیسیان بینی، لە ناوخۆیاندا وتیان: ئەگەر ئەمیش موسڵمان بێت، ئەوا لەگەڵ حەساندا دەبن بە دوو شاعیری زۆر بەهێز، هەر بۆیە زۆر هەوڵیانداو ویستیان پەشیمانی بکەنەوەو پێیان وت: ئاخر موحەممەد زینای قەدەغە کردووەو ئەگەر موسڵمان بیت، نابێت زینا بکەیت، بەڵام ئێستا بە ئارەزووی خۆت چیت پێخۆشە دەتوانیت بیکەیتو لاتو عوززاش قەدەغەت ناکەن..

ئەعشا دەڵێت: ئینجا من تازە کەسێکی بەتەمەنمو چیم داوە لە زینا؟! وازم لێبێنن، دەمەوێت بڕۆم..

جارێکی تر پێیان وت: ئاخر موحەممەد عەرەقیشی قەدەغە کردووەو ئەگەر موسڵمان بیت، نابێت عەرەق بخۆیتەوە، خۆ ئەگەر عەرەق بخۆیتەوە سزات دەدات..

ئەعشا ئەمجارە دەڵێت: من پیاوێکی پیرمو عەرەقیش ژیری ناهێڵێتو چ ئیشم بە عەرەقە!!

لە سەردەمی نەفامیشدا کەسانێك هەبوون عەرەقیان نەخواردووە.. کەسانێك لە سەردەمی نەفامیدا بتیان دەپەرستو کچانیشیان زیندە بە چاڵ کردووە، بەڵام کاتێك پێیان وتراوە: بۆچی عەرەق ناخۆنەوە؟ لە وەڵامدا وتوویانە: کەسی وا هەیە، کاتێك عەرەقی خواردۆتەوە، دەست درێژی کردۆتە سەر دایكو خوشکی..

پێغەمبەری خوداﷺ ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێت: (من شَرِبَ الخمر في الدنيا، لم يشربها في الآخرة). رواه البخاري. واتە: (هەر کەسێك لە دونیادا عەرەق بخواتەوە، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوەو لێی قەدەغە دەکرێت)..

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ بە دایکی پیسیو خراپەکان (أم الخبائث) ناوی بردووەو پێغەمبەری خوداﷺ سێ جار دەفەرموێت: ئایا لە تاوانە گەورەکان ئاگادارتان بکەم؟

هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: جادوو، لەگەڵ هاوەڵ بۆ خودا دانان، لە شوێنێکی

تردا فەرمووی: خواردنەوەی عەرەق، لەبەر ئەوەی عەرەق زیری لەناودەباتو مرۆڤ بەرەو لادانو چەندین تاوانو گوناهو خراپە دەبات، هەر بۆیە کەسانێك هەبوون سەرەرای بێباوەرییان، خۆیان لە خواردنەوەی عەرەق پاراستووە، ئەی چۆن کەسانێك عەرەق دەخۆنەوە کاتێك موسڵمان بوونو باوەر بهێنن؟!

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ المائدة. واتە: (دڵنیابن کە عەرەقو قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربراو بۆ غەیری خودا لەو شوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورجو حەرامو حەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسنو لە کارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دووربگرنو خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیو بەختەوەری بەدەست بهێنن)..

پەروەردگار خواردنەوەی عەرەقی لەگەڵ بت پەرستیدا باس کردووە.. بە دڵنیاییشەوە، ئەوانەی عەرەق دەخۆن سەرفراز نابن، هەر بۆیە پەروەردگاریش دەفەرموێت: لێی دوور بکەونەوەو نزیکی مەبنەوە، بۆ ئەوەی سەرکەوتووو سەرفراز بن..

بەڵێ.. ئەمجارەیان پەیمانی شتێکی گەورەیان بە ئەعشادا.. ئەویش ئەو شتە بوو، کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: نەوەکانی ئادەم تەمەنیان زۆر دەبێتو پیر دەبنو گەورە دەبن، بەڵام دڵیان هەر گەنجەو زۆر حەز بە دوو شت دەکەن، ئەو دوو شتە دەبێت چی بن؟!

ئەو دوو شتەش بریتین لە: خۆشەویستی دونیاو سەروەتو سامان، لەگەڵ بە هیوابوونو تەمەن درێژی..

کەس ناتوانێت تەمەنی کەس درێژ بکات، بەڵام سەروەتو سامان دەتوانرێت بدرێت بە خەڵکی، هەر بۆیە دەڵێن: ئەعشا بگەرێوە بۆ لای هۆزەکەتو لەسەر بت پەرستی خۆت بمێنەرەوە، سەد دانە وشترت دەدەینێ..

وشتر لەو سەردەمەدا زۆر بەنرخ بوو، زۆربەی کاروباری خەڵکی بەهۆی وشترەوە بووە.. کێڵانی زەویو ئاو هەڵکێشانو گەشت کردنو دار هێنان، هەموو ئەمانە بەهۆی وشترەوە ئەنجام دەدران، تەنانەت مارەیی ئافرەتیش بە وشتر دیاری دەکرا..

هەروەها خوێن باییو رێکەوتنەکان بە وشتر دەکرانو وشتر لەبری دەدران، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾﴾ الغاشية. واتە: (ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروست کراوە؟!)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾﴾ النحل. واتە: (ماڵاتیشی دروست کردووە بۆ خزمەتی ئێوە، (لە خوریو موو پێستیان جۆرەها پۆشاکو رایەخ دروست دەکەن) کە گەرمیتان پێدەبەخشێت (لە سەرماو سۆڵەدا)، هەروەها جۆرەها سوودی تری لێوەردەگرن لە

شیرو گۆشتەکەشی دەخۆن)..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك دەربچوایە بۆ غەزایەك، داوای لە هاوەڵان دەکرد، وشتر ببەخشنو بە وشتر یارمەتیی هاوکاری سوپای موسڵمانان بکەن..

ئەوەتا لە یەکێك لە غەزاکاندا پێغەمبەری خوداﷺ داوای بەخشین لە موسڵمانان دەکات، ئیمامی عوسمانؓ ژمارەیەکی زۆر وشتر بە موسڵمانان دەبەخشێت، پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: لەمەو بەدواوە عوسمان هەر کارێك ئەنجام بدات، هیچ زەرەرو زیانێکی پێناگات..

مەبەستەکەمان ئەوەیە، وشتر زۆر بەنرخ بووە، بۆیە بێباوەڕانی قورەیش ویستیان لەم ڕێگەیەوە، کار بکەنە سەر ئەعشا.. ڕاستە ئەم پیاوە، کەسێکی پیرو بەتەمەن بوو، بەڵام سەروەتو سامانی خۆش دەویستو ژمارەی وشترەکانیش کەم نەبوون..

ئەعشا کاتێك گوێ بیستی ئەم قسەیە دەبێت، دەڵێت: هەر ئێستا سەد وشترم بۆ کۆ دەکەنەوەو دەمدەنێ؟!

ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.. بەڕاستی پەروەردگار جوانی فەرمووە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الأنفال. واتە: (بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن، ماڵو سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بە شێنەیی بەربەست دانێنو ڕێگری بکەن لە بەردەم ئاینو ڕێبازی خوادا، جا ماڵو سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکەن! پاشان دەبێتە پەشیمانیو داخو حەسرەت لەسەریان، لە دواییدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێباوەڕبوون بۆ دۆزەخ کۆدەکرێنەوەو ڕاپێچ دەکرێن)..

بابزانین پەروەردگار چی لە ئەعشا دەکات؟

ئەعشا وشترەکانی دەست دەکەوێتو لە کاتی گەڕانەوەیدا، بۆ لای کەسوکارو هۆزەکەی، لە ڕێگەدا هەر بیری لەوە دەکردەوە، ئەم هەموو سامانە چی لێبکات، زۆری نامێنێت بگاتەوە لای کەسوکاری، وشترەکەی ژێری دەکەوێتو ئەعشاش بەردەبێتەوەو دەمرێت..﴿خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ ﴾ الحج. واتە: (ئا بەو حاڵەتەی دونیاو قیامەت لە دەست خۆی دەداتو زەرەرمەندی هەر دوو لایەو هەر ئەوەشە خەسارەتمەندو زەرەرمەندی ڕوونو ئاشکرا)..

بەڵێ.. لە دونیادا ڕەنجەڕۆ بوو، چونکە مردو وشترەکانی هەموو لە دەستچوو، لە ڕۆژی دواییشدا هەر بە هەمان شێوە، چونکە باوەڕی نەهێناو موسڵمان نەبوو..

ئەم ڕووداوەش بەڵگەی ئەوەیە، جاری وا هەیە کەسانێك دەیانەوێت ڕێگەی ڕاست بگرنو واز لە تاوانو گوناهو سەرپێچی بهێنن، بەڵام دۆستو برادەرو کەسانی نزیك، نایەڵن..

* کەسانێك هەن دەیانەوێت، واز لە خواردنەوەی عەرەق، یان پەیوەندی ناڕەواو

دروست بهێنن، بەڵام هاوڕێکانیان نایەڵن.. ئافرەتانێك هەن دەیانەوێت باڵاپۆش‌و سەرپۆش بەسەربن، کەچی پێیان دەڵێن: ئەگەر باڵاپۆش بن، شێوەو ڕوخسارتان دەگۆڕێت‌و لەوانەیە بە فەیرەیی بمێننەوەو شووتان بۆ نەکرێت..

گەنجانێك هەن دەیانەوێت پابەندی ئاینی پەروەردگار بن، پێیان دەوترێت: نەکەن ریش بهێڵنەوە، شێوەتان جوان نابێت‌و خەڵکی پێتان پێدەکەنن، براکانم بەبێ ڕیشیش نوێژو ڕۆژووی خۆت ئەنجام بدەو ئەو قسانە کارتان تێنەکات..

کەسانێك کاتێك دەیانەوێت واز لە حەرام‌و خواردنی سوو بهێنن، بە هەژاری‌و نەداری دەیان ترسێنن، دەی پەروەردگار ڕزقی باڵندەو مێروولەکان دەدات، چۆن ڕزقی تۆ نادات..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾﴾ فصلت. واتە: (ئەوانە بەهۆی تاوان‌و سەرکەشیانەوە کەسانێکمان کردە هاوەڵیان کە کارو کردەوەی ڕابوردوو داهاتوویان بۆ برازێننەوە، تا سەرئەنجام بڕیاری تۆڵە ئەمانیشی گرتەوە وەك کۆمەڵانی پێش ئەمان لە پەری‌و ئینسانەکان، بەڕاستی هەر هەموویان زەرەرمەندو دۆڕاون)..

ئاگاداری هاوڕێ‌و هاوەڵ‌و کەسانی خراپ بن.. ئاگاداربن نەبن بە کلیلێك بۆ کردنەوەی دەرگاکانی شەڕو خراپە.. ئەبوجەهل‌و ئومەیەی کوڕی خەلەف، کلیلی شەڕ بوون.. ئاگاداربن شەیتان بەکارتان نەهێنێت‌و نەتانکات بە داردەستی خۆی..

پەروەردگار لە شەڕی شەیتان بمان پارێزێت‌و لە پەرستنی خۆتدا بەکارمان بهێنی‌و یارمەتیمان بدەیت بۆ ئەنجامدانی کارە چاکەکان.. آمین..

# دزێکی زاناو شارەزا..

* جاری واهەیە کاتێك کەسانێك دەکەونە ناو تاوانو گوناهێکەوە، بە دوای دەروازەکانی ڕزگاریدا دەگەڕێنو لەباتی وازهێنان لە تاوانو گوناهەکە، پاساوو بیانوو بۆ خۆیان دەهێننەوە..

بۆ نمونە: کاتێك کەسێك ئازاری دڵی باوكو دایکی دەداتو پاشان دەروونی سەرزەنشتی دەکاتو بیری دەخاتەوە کە ئازاردانی دایكو باوك، گوناهو حەرامەو دروست نیە، بەڵام لەباتی وازهێنان لەو کارە، خۆی بە خۆی دەڵێت: ئاخر باوکم بۆچی ئۆتۆمبیلم بۆ ناکڕێت؟ بۆچی وەکو باوکی فلانە هاوەڵم باش نیە؟ فلانە کەس باوکی ئەوەو ئەوەی بۆ کرد، ئەی من چی؟

بەڵێ.. بە دوای پاساوێکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بێت..

یان کەسێك دزی لە کۆمپانیایەك، یان لە فەرمانگەکەی دەکات، پاساوو بیانوو بۆ خۆی دەهێنێتەوەو بە دەروونی خۆی دەڵێت: ئاخر من شایەنی لەو موچەیە زیاترەو ستەمم لێکراوە..

ئێمە لێرەدا باسی دزێکی زاناو شارەزا دەکەین..

ئەی کە شارەزایە لە ڕووی شەرعییەوە، چۆن بووە بە دزو دزی دەکات؟!

* (التنوخي) لە پەڕتوکی (الفرج بعد الشدة) دا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: قوتابیەکی گەنج هەبوو، دەیویست لە ناوچەو وڵاتێکەوە بچێت بۆ ناوچەو وڵاتێکی تر..

جاران وەکو ئێستا نەبوو، هۆکارەکانی گواستنەوەو تەکنەلۆجیا بەم شێوەیەی ئێستا پێشکەوتوو نەبوو، ئێستا جاری وا هەیە لە زانکۆیەك قوتابی چەندین وڵات هەن، یاخود قوتابییەکی زۆر لە ڕێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە دەتوانن لە زانکۆ جیهانیەکان بخوێنن، بەڵام لە کۆندا وانەبووەو قوتابی دەبووایە ئەم شارو ئەو شارو ئەم وڵاتو ئەو وڵات بە دوای مامۆستاو زانستو زانیاریدا بگەڕایە..

ئەبو عەلای مەعەڕی دەڵێت: جارێکیان پەڕتوکەکانم هەڵگرتو بۆ وڵاتێکی تر کەوتمە ڕێ، ئەوەندە هیلاكو ماندوو بووم، بەشێك لە پەڕتوکەکانم لە ئارەقمدا تەڕ ببوون..

ئەم گەنجەش زانست خواز بوو، پەڕتوکەکانیو هەندێك جلوبەرگی کردە تورەکەیەکەوەو لەگەڵ کاروانێکدا کەوتەڕێ، جاران خەڵکی لەگەڵ کارواندا بە کۆمەڵ دەڕۆیشتن، جا کاروانەکە بازرگانو ژنو منداڵو چەندین وشتری لەخۆ دەگرتو هەتا

کاروانەکەش زۆرتر بووایە باشتر بوو، چونکە کەمتر لە جەردەو ڕێگر دەترسان..

بەڵێ.. گەنجەکە بە خۆیی‌و تورەکە پەڕتوکەکەیەوە کە لە چاوانی زیاتر خۆشی دەویستن کەوتەڕێ.. ئەم گەنجە لە ڕێگە پێش نوێژی بۆ کاروانچیەکان دەکردو وتاری بۆ دەدان‌و ئامۆژگاری دەکردن..

کاروانەکە لە بیاباندا ڕێگەی دەبڕی‌و لەپڕ کۆمەڵێك چەتەو ڕێگر کاروانەکەیان وەستاندو هەرچیەکیان پێبوو، لێیان سەندن‌و تەنانەت جلوبەرگەکانیشیان، جگە لەوەندەی کە لەشیانی پێ داپۆشرا بوو، لەبەرداکەندن‌و بە تەواوی ڕووتیان کردنەوە..

گەنجەکە لەگەڵ خەڵکەکەو بازرگانەکاندا وەستا بوو، سەیری دەکرد کە چۆن ئەو دزانە ئەو خەڵکەیان ڕووت دەکردەوەو ماڵ‌و سامانیان بە تاڵان دەبردو دەیبینی چۆن لە نێوان خۆیاندا بەشی دەکەن.. تورەکە پەڕتوکەکەو کەلوپەلەکانی گەنجەکەشیان برد، بەڵام گەنجەکە تەنها خەمی پەڕتوکەکانی بوو، چونکە دەیزانی دزەکان نرخی ئەو تورەکەیە نازانن..

ئەمڕۆ ئەگەر بۆ نمونە: کتێبێکی (رياض الصالحين) یان (تفسير إبن كثير) لە دەست بدەیت‌و بفەوتێت، زۆر بە ئاسانی بە پارەیەکی کەم دەتوانی بیکڕیتەوە، بەڵام لە کۆندا وانەبووەو قوتابی تا پەڕتوکێکی دەنوسیەوە زۆر هیلاك‌و ماندوو دەبوو، سەرەڕای ئەوەی قوتابی لە پەڕتوکەکەی تێبینی‌و وردەکاری خۆی دەنوسی، هەر بۆیە ئەو پەڕتوکانە بۆ ئەو قوتابیە گەنجە زۆر گرنگ‌و بە بایەخ بوون..

گەنجەکە لە سەردەستەی دزەکان دەچێتە پێشەوەو دەچێتە پێشەوەو دەڵێت: السلام علیکم..

سەردەستەی دزەکان لەباتی وەڵامدانەوەی سڵاوەکە پێی دەڵێت: بڕۆ دواوە ئەگەر نا دەتکوژم..

گەنجەکە دەڵێت: شتێکتان لێسەندووم کە زیان بە من دەگەیەنێت، بەڵام هیچ سوودێکی بۆ ئێوە نیە..

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: ئەو شتە چیە؟! پارەو جلوبەرگەکانت بۆ ناگێڕینەوە..

گەنجەکە ئاماژەی بۆ تورەکەکەی کردو وتی: ئەو تورەکەیەم دەوێت، پەڕتوکەکانمی تێدایە، زۆر بە نارەحەتی کۆم کردوونەتەوەو پێویستیم پێیانە، چونکە من وتار بۆ خەڵکی دەدەم‌و پێش نوێژیان بۆ دەکەم‌و وەڵامی پرسیارەکانیان دەدەمەوە، لەبەر ئەوە دەزانم ئەو تورەکەیە هیچ سوودێکی بۆ ئێوە نابێت..

سەردەستەی دزەکان فەرمان دەکات، تورەکەکەی بۆ دەهێنن‌و کە دەیکەنەوە دەبینێت پەڕتوکی تێدایەو دەڵێت: پەڕتوکەکانت هەڵبگرە، گەنجەکە زۆر دڵخۆش‌و

شادومان دەبێت..

سەردەستەی دزەکان زۆر بەم گەنجە سەرسام دەبێت، گەنجێك جلوبەرگەکانیشیان لەبەرداکەندووەو بە ڕووتی دانیشتووە، کەچی خەمی پەڕتوکەکانیەتی، هەر بۆیە دەڵێت: جلوبەرگەکانیشی بدەنەوە، پاشان دەڵێت وڵاخە سوارییەکەشی بدەنەوە، پاشان هەندێك پارەشی بۆ درێژ دەکاتو دەڵێت: ئەمەش دیارییەکە لە منەوە بۆ تۆ..

گەنجەکە دەڵێت: ئەو پارەیە حەرامەو نامەوێت..

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: حەرامە؟!

گەنجەکە دەڵێت: بەڵێ حەرامە، ئێستا بە بەر چاومەوە لەو خەڵکەت سەند..

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: سوێند بە خودا لە ئاوی باران بۆمان حەڵاڵ ترە..

گەنجەکە دەڵێت: چۆن حەڵاڵە ئێستا بەزۆر لەو خەڵکەت نەسەند؟!

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: بەڵێ وابوو، لەو خەڵکەم سەند، دەتەوێت بۆتی بسەلمێنم چۆن حەڵاڵە؟

گەنجەکە دەڵێت: بەڵێ..

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: دانیشە با بۆتی بسەلمێنم، بانگی یەکێك لە بازرگانەکان دەکاتو پێی دەڵێت: وەرە بزانم تۆ بازرگانی چی دەکەیت؟

بازرگانەکە دەڵێت: وشترو مەڕومالآت دەکڕمو دەفرۆشم.. پێی دەڵێت: زەکاتی وشترو مەڕومالآت، چۆنەو لە چەند سەر دەدرێت؟

بازرگانەکە دەڵێت: نازانم.. ئەی ئەگەر دە وشترو پێنج مەڕو شەش مانگات هەبێت، زەکاتیان چەندە؟

بازرگانەکە دەڵێت: نازانم..

ئەی تا ئێستا زەکاتت نەداوە؟

بازرگانەکە دەڵێت: نەخێر..

سەردەستەی دزەکان بانگی بازرگانێکی تر دەکاتو پێی دەڵێت: تۆ بازرگانی چی دەکەیت؟

بازرگانەکە دەڵێت: بازرگانی زێڕو زیو دەکەم.. دەی زەکاتی زێڕو زیو لە چەند دەدرێت؟

بازرگانەکە دەڵێت: نازانم..

لە حەفتا..

هەڵەیە..

لە هەشتا..

هەڵەیە..

دەی ئەگەر ئاڵتونەکانت ئەوەندە نەدەبوون کە زەکاتیان لێبدەیت، بەڵام لەگەڵ زیوەکاندا دەگەیشتنە سنوری زەکات، زەکاتی لێدەدرێت، یان نا؟

بازرگانەکە دەڵێت: نازانم..

سەردەستەی دزەکان دەڵێت: برۆ.. تۆ تا ئێستا زەکاتی سەروەتو سامانەکەت نەداوە..

بانگی بازرگانێکی تر دەکاتو دەڵێت: تۆ بازرگانی چی دەکەیت؟

بازرگانەکە دەڵێت: جلوبەرگ دەفرۆشم.. هەندێك پرسیاری زەکات لەمیش دەکاتو ئەمیش هەروەکو دوو بازرگانەکەی پێشوو، وەڵامی ڕاست ناداتەوەو شارەزاییەکی ئەوتۆی نابێت، سەردەستەی دزەکان ڕوو دەکاتە گەنجەکەو دەڵێت: براکەم ئەوەتا ئەمانە زەکاتی ماڵەکەیان نەداوەو ئەو ماڵەی کە هەیانە هەمووی هی خۆیان نیە، ئێمە هاتووینو ئەو بەشەی هی خۆیان نیە، لێیان دەسەنینەوەو تەمێشیان دەکەین..

ئەم وتەیە هەڵەیە، ئەگەر کەسێك زەکاتیش نەدات، دروست نیە دزی لێ بکەیت، هەروەك چۆن کەسێك پارەی عەرەق بدات بە منداڵێکی بێباوك، یان ئافرەتێك زینا بکاتو بە پارەکەی خێر بکات..

نەخێر، نە زینا بکەو نەخێریش..

سەیری ئەو دزە بکەن، چۆن چۆنی پاساوو بیانوو بۆ کارەکەی دەهێنێتەوە..

* دەگێڕنەوە دزێك لە بەردەم دادوەرێکدا ڕادەگرن، دزەکە باز دەداتە ماڵێکەوەو ئاسنێکی زۆر بەهێز دەشکێنێتو پارەو پولەکەی ناوی دەبات..

دادوەرەکە پێی دەڵێت: فلانە کەس من دەزانم تۆ دزیتو پێشینەت هەیە، سەرسام نیم بە دزی کردنت، هەروەها بە بازدانەکەت، بەڵام سەرسامم بەوەی چۆن توانیت ئەو ئاسنە بەهێزە بشکێنیتو پارەکانی ناوی بەریت؟!

دزەکەش دەڵێت: ئەی دادوەری بەڕێز، ئەی ئەم هۆنراوەیەت نەبیستووە کە دەڵێت:

ألا بالحرصِ يحصل ماتريد         وبالتقوى يلينُ لك الحديد..

واتە: بە سووربوونو هەوڵدان ئەوەی دەتەوێت بە دەستی دەهێنیت، هەورەها بە لە خودا ترسانو خۆپارێزیش ئاسنت بۆ نەرم دەبێت..

دادوەرەکەش دەڵێت: ماشاءالله.. دیارە تۆ برای داود پێغەمبەریﷺ وا ئاسنت بۆ نەرم دەبێت؟! پاشان فەرمان دەدات بۆ ئەوەی سزای بدەن..

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە ئێمە جاری وا هەیە کاتێك هەڵەیەك یان تاوانو گوناهێك دەکەین، بە دوای پاساوو بیانوویەکدا دەگەڕێین بۆ ئەوەی خۆمان بە گوناهبار نەزانین، هەروەکو ئیبلیس کاتێك فەرمانی پێکرا سوجدەی ڕێز بۆ ئادەمﷺ بەرێت، یەکەم

شت کە بە دوایدا گەڕا بیانوو بوو، بیانووەکەشی ئەوە بوو کە ئیبلیس خۆی بە باشتر دەزانیو وتی: من لە ئاگر دروست کراوەو ئەویش لە خۆڵ.. ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف. واتە: (شەیتان وتی: من لەو چاکترم، تۆ منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردووە)..

هەروەها لە ئایەتێکی تردا هاتووە کە دەڵێت: ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾﴾ الإسراء. واتە: (ئایا چۆن سوجدە دەبەم بۆ ئەو کەسەی کە لە قوڕ دروستت کردووە؟!)..

ئیبلیس سەرپێچی فەرمانی خودای گەورە دەکات، بەڵام بیانوویەکیشی ئامادە کردووە بۆ سەرپێچییەکەی، بۆچی سوجدە بۆ ئادەم‌ﷺ نابەیت؟

لەبەر ئەوەی بیانووم هەیە؟ من لەو باشترم!!

بە هەمان شێوە فیرعەونیش کە بانگەوازی خودایەتی دەکرد وتی: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ...﴿٣٨﴾﴾ القصص. واتە: (فیرعەون سەرکەشانە وتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کە شایستە بێت بەوەی خوداتان بێت جگە لە خۆم)..

هەروەها وتی: ﴿أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٥١﴾﴾ الزخرف. واتە: (من پاشای میصرەو فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەم، ئەم ڕوبارانەش بە بەر کۆشکەکانمدا دەڕوات، ئایا ئەم دەسەڵاتەی من نابینن؟!)..

ئەوەتا فیرعەونیش بۆ بانگەوازەکەی بە دوای پاساوو بیانوودا دەگەڕێتو دەڵێت: من خوداو پادشای ئێوەمو ئایا نابینن چۆن ڕوبارەکان بە ژێرمدا دەڕۆن؟!

بەڵام جاری وا هەیە کەسێك کارێك دەکات، ڕاستگۆیەو بەڕاستی پاساوو بیانووی هەیەو مەبەستی ئەوە نەبووە، کە شتێك ڕوویدات، هەروەك بەسەر موسا‌ﷺ دا هات، پەروەردگار ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٧﴾﴾ القصص. واتە: ((موسا) لە کاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە شەقامو بازاڕدا، بینی دوو پیاو شەڕ دەکەن، ئەمەیان لە تایەفەی خۆیەتیو ئەمەشیان لە دەستەی دوژمنەکەیەتی (سەربازی فیرعەونە)، ئەوەی خزمی خۆی بوو موسای بینی هاواری لێکرد کە فریای بکەوێتو زاڵی بکات بەسەر دوژمنەکەیدا، موساش بەپەلە چوو بە دەمیەوە بۆکسێکی ماڵی بە کابرای (قیبتیدا)و کوشتی، موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم (من نەمدەویست بیکوژم) بەڕاستی شەیتان

دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە.. (ئینجا دەستەکانی بەرز کردەوەو) وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی ستەمم لە خۆم کرد کاتێك لە دەستم دەرچوو ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببورەو بمبەخشە، جا خودای میهرەبانیش لێی خۆش بوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو میهرەبانە.. (موسا هەستی کرد پەروەردگار نزای گیرا کردووە بۆیە) وتی: پەروەردگارا مادەم ئاوا نازو نیعمەتێکی لێخۆشبوونت بەسەردا ڕژاندم، من ئیتر هەرگیز نابمە پشتیوان بۆ تاوانکاران)..

موسا ﷺ بۆ ئەوە چوو کە ناوبژییان بکاتو لێکیان جیا بکاتەوە، بەڵام بەهۆی مشتەکۆڵەیەکەوە کەسێکیان دەمرێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە موسا ﷺ مەبەستی ئەوە نەبوو، هەر بۆیە بە دوای خۆڕزگارکردنو بیانوو دۆزینەوەدا نەگەڕا یەکسەر وتی: خودایە من مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵام دانیشی بەوەدا نا، کە بە هەڵە مرۆڤێکی کوشت، هەر بۆیە ئەم کارە پێویستی بە گەڕانەوەو پەشیمانی هەیە بۆ لای خودا..

کاتێك کەسێك دەیەوێت واز لە عەرەق بهێنێت، هاوەڵەکانی پێی دەڵێت: تۆ هێشتا گەنجیتو بیانووی بۆ دەهێننەوە، هەر وەکو دزەکەش بیانووی هێنایەوەو ماڵی خەڵکی بۆ خۆی بە حەڵاڵ دەزانیو دەیوت: ئەوان زەکات نادەن.. نەخێر دروست نیە بە پارەی حەرام خێر بکەیت، منداڵی هەتیو بەخێو بکەیت، یان مزگەوت دروست بکەیت..

کەسێك جلوبەرگەکەی باش نیەو خۆشی بە باڵاپۆش دەزانێتو دەیەوێت باشتربێت، هاوەڵەکانی پێی دەڵێن: هیچ نەبێت خۆ تۆ باشتری لە فلانە باڵاپۆش.. فلانە کەس جلوبەرگەکەی لە تۆ کورتترەو باڵابۆشیشە!! ڕاستە جلوبەرگەکەی تۆ تەسکە، بەڵام خۆ درێژەو کورت نیە!! فلانە کەس سەرو قژی داناپۆشێت، خۆ تۆ هیچ نەبێت ئەگەر تەنکیش بێت، سەرپۆشێکت داوە بە سەرتدا!!

کاتێك کەسێك نوێژەکانی لە مزگەوت ناکاتو بە هاوەڵەکانی دەڵێت: دەمەوێت لەمەودوا نوێژەکانم لە مزگەوت ئەنجام بدەم، هاوەڵەکانی پێی دەڵێن: کاکە تۆ باشی، خەڵکانی تر هەر نوێژ ناکەن، تۆ بەس نیە لە ماڵیشەوە بێت نوێژەکانت ئەنجام دەدەمیت!! هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ بە دوای پاساوو بیانوو خۆدزینەوەدا نەدەگەڕان، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام بە دوای خێرو چاکەو کرداری گەورەدا دەگەڕان، بە دانیشتنو پاڵدانەوەی بەر سێبەر ڕازی نەدەبوون، هەروەکو وتراویشە:

ونحن قومٌ لاتوسط عندنا      لنا الصدر دون العالمين أو القبرُ..

واتە: ئێمە نەتەوەو گەلێکین مامناوەندیمان نیە، یان دەبێت پێشەنگو پێشەوا بین، یان دەبێت لە گۆڕدا بین..

کاتێك هاوەڵێك گوناهێك، یان هەڵەیەکی ئەنجام بدایە، بیانووی بۆ کارەکەی

نەدەهێنایەوە، بەڵکو دانی بە هەڵەو تاوانەکەیدا دەنا.. ئەوەی بە دوایدا دەگەڕان، یەك شت بوو، ئەویش گەڕان بە دوای بەهەشتو بەدەست هێنانی بوو..

هاوەڵێك دەیپرسیو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چ کارێك لە لای پەروەردگار زۆر خۆشەویستە؟ هاوەڵێکی تر دەیپرسی: لە ڕۆژی دواییدا چ کارێك لەسەر تەرازووی بەندەکان زۆر قورسو سەنگینە؟ هاوەڵێکی تر دەیپرسی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕۆژی دواییدا کێ زۆر لە تۆوە نزیکە؟

دەی تۆش بە دوای ڕزگاریو سەرفرازیدا بگەڕێ.. لەو کەسانە مەبە کاتێك هەڵە، یان تاوانێك ئەنجام دەدەن، هەموو ڕێگەیەك دەگرنەبەر، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە گوناهبارو تاوانبار نین، بەڵکو وەکو موسا‌ﷺ دانی پێدابنێو داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارت بکە، چونکە بەردەوام گەڕان بە دوای پاساوو بیانوودا، بەرەو ئەوەت دەبات کە لەسەر گوناهو تاوان بەردەوام بیت..

پەروەردگار لە گوناهو تاوانو خراپە بمان پارێزیو لە هەموو گوناهێکمان خۆش بیت، کە کردوومانەو کە نەشمان کردووە، هەروەها لەو گوناهانەش کە دەیزانینو ئەوانەش کە نایزانین.. آمین..

# وازهێنان لە کارێك لەبەر پەروەردگار..

مرۆڤ هەر چەندە سەیری ڕۆژگاری خەڵکی بکاتو لێیان ورد بێتەوە، پەندو ئامۆژگاریو وانەی بەسوود فێر دەبێت.. پەروەردگاریش لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ڕووداوو بەسەرهاتی نەتەوەکانی پێشووی بۆ باس کردووین، هەروەك دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ یوسف. واتە: (سوێند بێت بە خودا بەڕاستی لە سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وە نەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێك بێت هەڵبەسترا بێت، بەڵکو بە ڕاستدانەری ئەوەیە کە لەپێش خۆیەوە هاتووە (تەوراتو ئینجیل)و ڕوونکەرەوەو جیاکردنەوەی هەموو شتێکی پێویستە لە ئایندا، ڕێنماییو ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك باوەڕ دەهێنن)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ ﴾ طه. واتە: (ئەی موحەممەدﷺ: ئێمە بێگومان ئا بەو شێوەیە هەندێك لە بەسەرهاتی ئەوانەی ڕابووردو بۆت دەگێڕینەوە، دڵنیابە ئێمە لە لایەن خۆمانەوە قورئانمان پێبەخشیوویت کە یاداوەری بێت لە هەموو ڕوویەکەوە).. لە قورئانی پیرۆزدا هەواڵی چەندین پێغەمبەری ئازیزو بەڕێزی وەك موساو عیساو شوعەیبو یەحیاو زەکەریا (درودی خودایان لێ بێت) تۆمار کراوە..

* دەگەڕێینەوە بۆ ساڵی ٦٣٥ی کۆچی بۆ ئەوەی هەڵوێستەیەك لەگەڵ ڕووداوێکدا بکەین..

موزەفەر پاشا یەکێك بوو لە پاشاکانی ئەو سەردەمەو چەندین ناوچەو شاری لە ژێر دەستدا دەبێت، یەکێك لەو ناوچانە میرێکی دەبێت، میرەکە دەمرێتو تەنها کچێکی لە پاش جێدەمێنێت، ئەو میرەی لە دوای باوکی کچەکە دەبێت بە بەرپرسی ئەو ناوچەیە، ستەم لەو کچە دەکاتو دەست بەسەر سەروەتو سامانەکەیدا دەگرێت، هەتا کچەکە وای لێدێت هەژاری بە تەواوی تەنگی پێ هەڵدەچنێت..

ڕۆژێك پیرێژنێك دەچێت بۆ لای موزەفەر پاشاو باسەکەی تێدەگەیەنێتو پێی دەڵێت: فلانە میر لە ژێر فەرمانڕەوایی تۆدایەو ستەم لە کچی میرەکەی پێش خۆی دەکات، ئێستا ئەو کچە دەیەوێت بێت بۆ لاتو سکاڵای خۆی بکات، ڕێگەی پێدەدەیت؟

لە وەڵامدا موزەفەر پاشا دەڵێت: با بێت..

بەڵێ.. ئافرەتەکە دێت.. کاتێك موزەفەر پاشا سەیری دەکات، دەبینێت لەوپەڕی شۆخو شەنگیو جوانیدا دەبێت، داوای شایەدی دەکات بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە بەڕاستی ئەو کچە کچی فلانە میرە، چونکە لەو کاتەدا ناسنامە نەبوو بۆ سەلماندن، هەر بۆیە لە ڕێگەی شایەدیەوە ئەوەیان سەلماندووە.. شایەدەکان هاتنو شایەدییانداو بابەتەکەیان پشت ڕاست کردەوە، کە بەڵێ ڕاستە کچی فلانە میرە..

ئافرەتەکە ئەوەندە جوان دەبێت، کە تا ئەو کاتە موزەفەر پاشا جوانی وای نەبینی بوو، هەر بۆیە داوا دەکات ڕوخساری داپۆشێت.. ئافرەتەکە ڕوخساری دادەپۆشێت، پاشان موزەفەر پاشا پێی دەڵێت: چیت دەوێت؟

ئافرەتەکە دەڵێت: فلانە میر لە دوای مردنی باوکم دەستی بەسەر موڵكو ماڵی باوکمدا گرتووەو ستەمم لێدەکات، داوات لێدەکەم یارمەتیم بدەیتو سەروەتو سامانی باوکم بۆ بگێڕیتەوە..

موزەفەر پاشا یەکسەر فەرمان دەکات سەروەتو سامانەکەی بۆ بگێڕنەوە، پاشان لێی دەپرسێتو دەڵێت: حاڵو گوزەرانت چۆنەو تا ئێستا چۆن ژیاویت؟!

ئافرەتەکە دەڵێت: سوێند بە خودا لەسەر وردە نان ژیاومو ئیشوکارم بۆ خەڵکی کردوە..

موزەفەر پاشا جگە لە گێڕانەوەی ماڵو سەروەتو سامانی باوکی، فەرمان دەکات پارەو سامانی تریشی بدەنێ..

پیرێژنەکە تێبینی ئەوە دەکات، کە موزەفەر پاشا زۆر سەرسام بووە بەو ئافرەتە، هەر بۆیە پێی دەڵێت: بۆچی ئەمشەو لە لای خۆت نایهێڵیتەوەو بۆ خۆت گفتوگۆی لەگەڵ بکەیتو شەوی لەگەڵ بەسەربەری؟!

موزەفەر پاشا دەڵێت: نزیك بوو ڕازی بمو بڵێم: باشە، بەڵام بیرم کردەوە کە منیش چەند کچێکم هەیە، سبەینێش دەمرم، لەوانەیە کەسێك دەست بەسەر ماڵو سەروەتو سامانی منیشدا بگرێتو دەستدرێژیش بکاتە سەر کچەکانم.. کاتێك کچێکم بە لاوازیو تێکشکاویەوە بچێتە بەردەم میری دوای خۆم، دوور نیە دەستدرێژی بکاتە سەر کچەکەم، هەروەکو چۆن ئەگەر منیش دەستدرێژی بکەمە سەر ئەم کچە..

سەیری ئەو پادشا بەڕێزە بکە.. لەناو کۆشكو تەلاری خۆیداو چەندین کەس بە دەوریەوە، دەسەڵاتێکی گەورەشی هەبوو، دەیتوانی زۆر کار بکات.. هەموو ئەو شتانەی دەوروبەریشی بەرەو یاخی بوون هانیان دەدا.. ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ ﴾ العلق. واتە: (نەخێر (لەگەڵ ئەو هەموو چاکەو ڕێزەدا کە خودا بەخشیوویەتی بە ئیسنان) بەڕاستی خەڵکی سەرکەشی دەکەن، یاخی دەبن، ستەم دەکەن)..

بەڵام ئەم پادشایە سنوری خودای گەورەی نەبەزاندو بە پیرەژنەکەی وت: بیبەرەوە

بۆ ناو کەس‌وکاری‌و خودا فەڕو پیرۆزی بخاتە ژیانیەوە..

ئەم چیرۆکە ئەوەمان بۆ دەردەخات، هەر چەندە دەرگاکانی خراپە بە ڕووی مرۆڤەکانیشدا بە ئاسانی بکرێنەوە، لە هەمان کاتدا مرۆڤەکان دەتوانن خۆیان بگرن‌و بەسەر دەروونی خۆیاندا زاڵ بن.. پێویستە مرۆڤەکان کاتێك دەیانەوێت کارێکی خراپ ئەنجام بدەن، پێش ئەوەی بیر لە سزای دواڕۆژی ئەو کارە بکەنەوە، بیری سەرئەنجامی ئەو کارە لە دونیادا بکەنەوە، چونکە لەوانەیە هەر لە دونیادا پێش ڕۆژی دوایی پەروەردگار تۆڵەیان لێبستێنێتەوەو سزایان بدات..

* تەنوخی لە پەڕتوکی (الفرج بعد الشدة)دا دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

ئێمە لە شاری (صعید) لە لای پیاوێك بووین، پیاوەکە پیاوێکی بە تەمەن بوو، زۆریش ڕەش بوو، بەڵام منداڵەکانی زۆر سپی و جوان بوون..

دەربارەی منداڵەکانی پرسیارمان لێکرد..

لە وەڵامدا وتی: ئەم منداڵانە دایکیان فەرەنگیە (إفرنجية)، من‌و دایکی ئەم منداڵانە چیرۆك‌و بەسەرهاتێکی دوورو درێژمان هەیە..

پیاوەکە وتی: لە کاتی جەنگی داگیرکاری خاچ پەرستەکاندا چووم بۆ شام‌و لەو کاتەدا گەنج بووم.. دوکانێکم بە کرێ گرت‌و قوماشی کەتانم تیادا دەفرۆشت.. ڕۆژێك لە دوکانەکەمدا بووم، ژنێکی فەرەنگی کە خێزانی یەکێك لە سەرکردەی خاچ پەرستان بوو هات بۆ لام، جوانییەکەی سەرسامی کردم، شتم پێ فرۆشت‌و زۆریشم خاتر گرت، پاشان ڕۆیی‌و پاش چەند ڕۆژێك هاتەوەو بەهەمان شێوەی پێشوو زۆر خاترم گرت‌و بەردەوام دەهاتەوە بۆ لام‌و دەشیزانی کە شەیدای بووم، تا گەیشتە ئەوەی حاڵەتەکەمم بۆ ئەو پیرێژنە باس کرد، کە لەگەڵیدا بوو..

پێم وت: شەیدای ئەو ئافرەتە بووم، بە چ ڕێگەیەك دەتوانم پێی بگەم؟!

پیرێژنەکە وتی: ئەم ئافرەتە هاوسەری یەکێك لە سەرکردەی خاچ پەرستەکانە‌و ئەگەر پێمان بزانێ هەر سێکمان دەکوژێت.. هەر بەردەوام بووم لەگەڵیدا، هەتا داوای پەنجا دیناری لێکردم‌و لەبری ئەوە ئافرەتەکەم بۆ بهێنێت بۆ ماڵەوە.. زۆر تێکۆشام تا پەنجا دینارەکەم کۆکردەوەو دام پێی..

لە شەوی یەکەمداو لە ماڵەکەمدا چاوەڕێیم دەکرد.. کاتێك هات بۆ لام، بەیەکەوە نانمان خوارد.. بەشێك لە شەو تێپەڕی.. بە خۆمم وت: ئایا شەرم لە خودای پەروەردگار ناکەی؟! تۆ لێرەدا ڕێبوارو نامۆیت، لەبەردەم هێزو دەسەڵاتی خودای گەورەدایت، لەگەڵ ئافرەتێکی گاوردا سەرپێچی خودای پەروەردگارت دەکەیت؟!

چاوەکانم بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو وتم: خودایە خۆت بە شایەدبە لەبەرخاتری تۆ

لەگەڵ ئەم ئافرەتە گاورەدا داوێن پاك دەبم، پاشان لە جێگەکەم هەڵسامو چووم بۆ جێگەیەکی تر..

کاتێك ئافرەتەکە ئەمەی لێبینیم.. هەڵساو ڕۆیشت، بۆ بەیانی چووم بۆ دوکانەکەمو نزیك چێشتەنگاو هاتەوە بۆ لامو زۆر تووڕە بوو.. سوێند بە خودا ڕوخساری وەك مانگ وابوو.. کاتێك بینیم، لە دڵی خۆمدا وتم: تۆ کێیت تا لە بەرامبەر ئەم ئافرەتە جوانەدا بە شەرمو حەیا بیت؟! تۆ ئەبوبەکریت؟! عومەریت؟! جونەیدی خودا پەرستیت؟! یان حەسەنی دونیا نەویستیت؟!

زۆر خەمو خەفەتم خواردو حەسرەتم بۆ هەڵکێشا.. کاتێك ڕۆیی، پەیوەندیم بە پیرێژنەکەوە کردەوەو پێم وت: شەوێکی تر بۆم بهێنەوە..

پیرەژنەکە وتی: سوێند بە خودا بۆت ناهێنم بە سەد دینار نەبێت..

وتم: باشە.. هەوڵو کۆششێکی زۆرمدا هەتا پارەکەم کۆکردەوەو دام پێی..

لە شـەوی دووەمدا لە ماڵەوە چاوەڕێیم دەکرد، کاتێك هات، وەکو مانگ وابوو.. لە لام دانیشت، دووبارە ترسی خودا دایگرتم.. چۆن لەگەڵ گاورێکی بێباوەڕدا سەرپێچی خودا بکەم.. لە ترسی خودا وازم لێهێنا..

بۆ بەیانی چووم بۆ دوکانو بیرو هۆشو دڵو دەروونم هەر لە لای ئەو بوو.. لە چێشتەنگاودا بە لامدا تێپەڕیو زۆر تووڕە بوو..

کاتێك بینیم، زۆر سەرزەنشتی خۆمم کرد، کە وازم لەو ئافرەتە جوانە هێناوە.. زۆر بە داخ بووم بۆی.. هەمدیسان داوام لە پیرەژنەکە کردەوەو ئەویش وتی: یان بە پێنج سەد دینار بۆت دەهێنم، یان دەبێت بە داخو حەسرەتیەوە بمریت..

وتم: باشە.. ویستم دوکانو شتومەکەکانم بفرۆشمو پێنج سەد دینارەکەی بدەمێ.. کاتێك من لەم حاڵەتەدا بووم بانگکەرێك لە خاچ پەرستەکان لە بازاڕدا هاواری دەکردو دەیوت: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەو ئاگربەستەی لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هەبوو هەڵوەشایەوەو تەواو بوو، بازرگانە موسڵمانەکانیش ماوەی یەك هەفتەیان مۆڵەتە لێرە..

منیش ئەو کەلو پەلانەی کە مابووم، کۆم کردەوەو بە ئاخو حەسرەتەوە شامم بەجێ هێشت، پاشان دەستم کرد بە کڕینو فرۆشتنی کەنیزەك، بەو هیوایەی خۆشەویستی ئەو ئافرەتە لە دڵم دەربچێتو بیرم بچێتەوە..

سێ ساڵ تێپەڕیو پاشان شەڕی (حطین) ڕوویداو موسڵمانان زەویە داگیرکراوەکانیان گێڕایەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان..

ڕۆژێك داوای کەنیزەکێکیان لێکردم بۆ ناصر پادشا.. منیش کەنیزەکێکی زۆر جوانم لە لابوو.. بە سەد دینار لێیان کڕیم.. نەوەد دیناریان پێدامو دە دیناریان لا مایەوە..

ناصر پادشا وتی: بیبەن بۆ ئەو خانووەی ئافرەتە فەرەنگییەکانی لێیەو لە باتی ئەو دە دینارە با یەکێکیان هەڵبژێرێت..

کاتێك دەرگایان لێکردمەوە.. ئافرەتە فەرەنگیەکەی شامم بینی، ئەوم هەڵبژارد.. کاتێك چووینەوە بۆماڵەوە پێم وت: ئایا دەمناسیت؟!

وتی: نەخێر!!

وتم: من بازرگانە کەتان فرۆشەکەم، ئەو کەسەی کە سەدو پەنجا دینارت لێسەندمو پاشان وتت: بە پێنج سەد دینار نەبێت، پێم دڵخۆش نابیت، ئەوەتا ئێستا تۆم بە دە دینار دەستکەوت..

ئافرەتەکە وتی: ﴿أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله﴾و زۆر بە باشی موسڵمان بوو، پاشان مارەم کرد.. پاش ماوەیەك دایکی سندوقێکی بۆ نارد.. کاتێك کردمانەوە، دوو پەڕۆی پێچراوەی تێدا بوو.. یەکەمیان پەنجا دینارو دووەمیان سەد دیناری تێدا بوو.. هەروەها ئەو جلو بەرگانەشی تێدا بوو کە لەبەریدا بینی بووم.. ئەو ئافرەتە دایکی ئەم منداڵە سپی پێستانەیە.. هەر ئەویش بوو نانو خواردنی ئێوارەی بۆ ئامادە کردبوون..

بەڵێ.. هەر کەسێك لەبەر خاتری خودا واز لە شتێك بهێنێت.. خودای گەورە بە شتێکی باشتر پاداشتی دەداتەوە.. هەندێك جار مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە خەڵکی بشارێتەوە.. بەڵام چۆن دەتوانێت خۆی لە خودای پەروەردگار بشارێتەوە، کە هیچ کارێکی نهێنیو ئاشکرای لێ ون نابێت..

لە کۆندا لەبەر زۆری جەنگەکان لە نێوان موسڵمانانو دوژمنەکانیان، دیلیان لەیەکتر دەگرت، موسڵمانان لە ئەوانو ئەوانیش لە موسڵمانان، بەڵام جیاوازییەکی گەورە لە نێوان هەڵسوکەوتی موسڵمانانو دوژمنەکانیان لەگەڵ بەندیو دیلەکان هەبوو..

ئەوەتا کاتێك دیلەکانی جەنگی بەدریان هێنا، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی بە هاوەڵان کرد، لەگەڵیان باش بن.. کاتێك دەیان بینی هەندێك لە دیلی بێباوەڕان جلوبەرگیان کۆنو دڕاوە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی دەکرد، کە جلوبەرگی لەوەی خۆیان باشتریان پێبدەن.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾﴾ الإنسان. واتە: (هەروەها نانو خۆراك دەبەخشن، ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لایان، بە هەژارو هەتیوو دیلەکان).. بەندیو دیلەکان بێباوەڕیشن، کەچی لە قورئاندا هاتووە کە چاکەیان لەگەڵ بکرێت..

ئەو هاوەڵانەی پاسەوانی دیلەکانیان دەکرد، خواردنە باشەکەیان وەك شیرو خورما، دەدا بە دیلەکانو خۆیان نانە وشکەکەیان دەخوارد.. چاکەیان لەگەڵ کۆمەڵێك بێباوەڕدا

دەكرد، كە تا كەمێك پێش ئەو كاتە دەستیان لە خوێنی موسڵماناندا بوو..

دیلی هەردوولا وەكو خزمەتگوزار هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكراو ئافرەتەكانیش دەكران بە كەنیزەك، بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە چەندین ڕێگە هەوڵی ئازادكردنی ئەو كەسانەی داوە، لە جەنگی بەدردا كە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: هەر دیلێك دە منداڵی موسڵمانان فێری خوێندنو نوسین بكات، ئازاد دەكرێت..

هەر موسڵمانێكیش بە هەڵە كەسێك بكوژێت، پێویست بوو بەندەیەك ئازاد بكات..

ئەگەر كەسێك لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا لەگەڵ هاوسەری خۆیدا كۆببێتەوە، پێویستە بەندەیەك ئازاد بكات..

ئەگەر كەسێك سوێندێكی خواردو نەیبردە سەر، ئەگەر بۆی كرا پێویستە بەندەیەك ئازاد بكات..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ((هەر كەسێك بەندەیەك ئازاد بكات، پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ ئازادی دەكات))..

ئیسلام ڕێگەی بە گرتنی دیلو پاشان كردنیان بە خزمەتگوزار داوە، بەڵام لە هەمان كاتدا فەرمانی كردووە بەوەی كە دەبێت بە شێوەیەكی جوانو چاك هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكرێت پاشتریش داوا دەكات لەبەر خاتری خودای پەروەردگار ئازاد بكرێن..

پێغەمبەری خودا ﷺلە سەرەمەرگدا زۆر ئەم فەرموودەیەی دوبارە دەكردەوەو دەیفەرموو: (الصلاة الصلاة وماملكت أيمانكم). رواه البخاري. واتە: (ئاگاتان لە نوێژەكانتانو ژێردەستەكانتان بێت)..

دەی توخوا جیاوازییەك لە نێوان هەڵسوكەوتی موسڵمانانو هەڵسوكەوتی بێباوەڕانی ئەمڕۆ لەگەڵ بەندیو دیلەكاندا بكەن..

ئەمەریكا چی بە گیراوانی بەندیخانەكانی ئەبوغرێب نەكرد لە عێراق؟! بە شێوەیەك هەڵسوكەوتی لەگەڵ كردن، بە ڕووت كردنەوەو چەندان جۆری سزاو ئازاردان، كە ئەنجامدانی ئەو كارانە بەرامبەر ئاژەڵیش دروست نیە!! دروست نیە لەگەڵ كۆمەڵە بەرازێكیشدا بەو شێوەیە هەڵسوكەوت بكرێت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەو بەندیانە كەسانی ڕۆشنبیر بوون، چەندانیان قورئانیان لەبەربوو، چەندانیان پزیشكو مامۆستای زانكۆ بوون..

ئەی چیان لە بەندیەكانی گوانتانامۆ نەكرد؟! لە شوێنێكدا بەندیان كردوون، ئاژەڵیشی تیادا بەند ناكرێت!! خۆ ئەگەر سەگیان بەو شێوانە بەند بكردایە، چەندین ڕێكخراوی مافی ئاژەڵان، لە بەناوبانگترین دادگاكانی جیهان سكاڵایان تۆمار دەكرد!!

ئەی جولەكە چی بە بەندییەكانی فەلەستین ناكات؟!

دەی سەیری جیاوازی هەڵسوکەوتی موسڵمانانو بێباوەڕان لەگەڵ بەندیەکاندا بکە، بەڕاستی پەروەردگار جوانی فەرمووە: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء. واتە: ((ئەی موحەممەدﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەتو بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەکو پەری...هتد))..

بەڵێ.. هەر کەسێك لەبەر خاتری خودا واز لە شتێك بهێنێت.. خودای گەورە بە شتێکی باشتر پاداشتی دەداتەوە.. هەندێك جار مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە خەڵکی بشارێتەوە.. بەڵام چۆن دەتوانێت خۆی لە خودای پەروەردگار بشارێتەوە، کە هیچ کارێکی نهێنیو ئاشکرای لێ ون نابێت..

ئەمڕۆ بەڵاو گوناهو تاوان زۆربووەو ئەنجامدانیان ئاسان بووە.. لە بازاڕو زانکۆو نەخۆشخانەکان، ئافرەتی ڕووتو ناپۆشتە زۆر زۆر بوون.. هەر کەسێك بیەوێت چاو بگێڕێتو سەیری لەشو لاری ئافرەتان بکات، زۆر بە ئاسانی دەستی دەکەوێت، کارەکە لەوەدا نەماوەو لە زانکۆو نەخۆشخانەکان، زۆر لەوە زیاتریش ئاسانکاری بۆ کراوەو دەکرێتو ئافرەتانو پیاوانی بێگانە، وەکو کەسی یەکتر هەڵسوکەوت دەکەنو دەست دەخەنە دەستی یەکترەوەو لەوانەشە یەکتریش ماچ بکەن، هەر بۆیە بەڵاو تاقیکردنەوەکان زۆر گەورە بوون، لەم ڕۆژەدا هەر کوڕو کچێکی گەنج، دەیانتوانی کارێك ئەنجام بدەنو لەبەر خاتری خودای گەورە، ئەو کارە نەکەنو وازی لێبێنن، بە دڵنیاییەوە خودای گەورە فەرمبوویان بۆ دەکاتەوەو پاداشتیان بە باشتر دەداتەوە..

پەروەردگار لە پاك داوێنانمان بژمێرەو خۆمانو ماڵو منداڵو کەسوکارمان لە خراپەو تاوانو بەڵاو تاقیکردنەوەکان بپارێزیت.. آمین..

# عەشقو ئەوینی هاوەڵێك..

* لە سەردەمی نەفامیدا، لە نێوان هاوەڵێكو ئافرەتێكدا پەیوەندی خۆشەویستی هەبوو.. ئەم هاوەڵە بەڕێزە كاتێك موسڵمان بوو، وازی لەو پەیوەندییە هێنا، بەڵام ڕۆژێك كەوتە هەڵوێستێكی زۆر قورسو گرانەوەو دەیتوانی چی بوویت لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بیكات..

بابزانین ئەو هاوەڵە كێ بوو؟! چیرۆكی ئەوو ئەو ئافرەتە چی بوو؟!

پەروەردگار چۆن یارمەتیداو پاراستی؟!

قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە چی فەرمووە؟!

ئەو هاوەڵە بەڕێزە، مەرسەدی كوڕی ئەبی مەرسەدﷺ بوو.. كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە مەككەوە كۆچی كرد بۆ مەدینەو لەو شارە جێگیر بوو، هەندێك هاوەڵ لە هەندێك بواردا دەركەوتن، هەیان بوو لە لەبەركردنی قورئانو فەرموودەدا دەركەوت، هەیان بوو لە نوسینو هەیان بوو لە هونەرەكانی شەڕو جەنگدا دەركەوت..

ئەم هاوەڵە بە ئازایەتیو جەستەی بەهێزی دەركەوت، ڕاستە وەكو ئەبوهورەیرەﷺ لە زانستو زانیاریدا شارەزاو زیرەك نەبوو، بەڵام لە شتانێكی تردا زۆر لێهاتوو بوو..

جارێكیان پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ڕزگاركردنی هەندێك دیلو دەست بەسەری موسڵمانان دەینێرێت بۆ مەككە، ئەم هاوەڵە یەكە یەكەیان دەخاتە سەر پشتیو دووریان دەخاتەوەو پاشان كۆتو بەندی دەستو قاچیان دەكاتەوەو بەرەو شاری مەدینە بەڕێیان دەكات..

جەنگی قوڕەیشو موسڵمانان بەردەوام بوو، قوڕەیش بەردەوام دەیویست هەڵكوتێتە سەر موسڵمانانو خۆیانو سەروەتو سامانیان بفرێنن..

جارێك لە جاران هەندێك لە بێباوەڕانی قوڕەیش دێن بۆ نزیك شاری مەدینەو كۆمەڵێك لە وشتری موسڵمانانو ئافرەتێكیش دەفرێنن، لە نێوان وشترەكانییشدا وشترەكەی پێغەمبەری خوداشیانﷺ تێدا دەبێت، بەڵام سوپاس بۆ خودا، ئافرەتەكە سواری وشترەكەی پێغەمبەری خوداﷺ دەبێتو هەڵدێتو ڕزگاریان دەبێت، بەردەوام بێباوەڕانی قوڕەیش دەست درێژییان بۆ سەر موسڵمانان دەكرد، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ..﴿١٩٤﴾﴾ البقرة. واتە: (جا ئەوەی كە دەست درێژی دەكاتە سەرتان، ئێوەش مافتان هەیە بە قەدەر دەست درێژییەكەی ئەو، تۆڵەی خۆتان بكەنەوە)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ..﴿٤٠﴾﴾ الشورى. واتە: (جا تۆڵەی هەر

تاوانێك بە ئەندازەی تاوانەكەیە بێ زیادو كەم)..

ڕۆژێك مەرسەدﷺ بۆ ئازادكردنی یەكێك لە موسڵمانان دەكەوێتە ڕێ بۆ شاری مەككەو كاتێك دەیەوێت بچێتە ئەو ماڵەوە كە موسڵمانەكەی تیادا بەند كراوە، ئەو ئافرەتە دەبینێت كە لە سەردەمی نەفامیدا یەكتریان خۆش ویستووەو پەیوەندییان پێكەوە هەبووە..

ئافرەتەكە ناوی عەناق دەبێت، مەرسەدﷺ لە سێبەری مانگەشەوی دیوارێكدا خۆی دەشارێتەوە، بەڵام عەناق دەیبینێتو پێی دەڵێت: مەرسەد سڵاوت لێ بێتو چۆنی..

مەرسەدﷺ بێدەنگ دەبێتو هیچ ناڵێت..

ئافرەتەكە ئەمجارەیان دەڵێت: مەرسەد دەی وەرە با ئەمشەو بەیەكەوە بەسەربەرین..

مەرسەدﷺ دەڵێت: ئەی عەناق خودای گەورە بەدڕەوشتی حەرامو قەدەغە كردووە..

لە شەوداو لە نێوان دیوارە كۆنەكانی مەككەداو لە بێئاگایی ئەو خەڵكەدا، مەرسەدﷺ دەیتوانی ئەوەی ئارەزووی دەیەوێت ئەنجامی بدات، بەڵام دەڵێت: عەناق ئەو كارەی تۆ داوای دەكەیت، حەرامەو قەدەغەكراوە!!

ئافرەتەكە جارێكی تریش دەڵێت: دەی وەرە.. ئەگەر نا، هاوار دەكەم..

مەرسەد، كاتێك دەیەوێت ڕابكات، ئافرەتەكە هاوار دەكاتو دەڵێت: ئەی خەڵكانی قوڕەیش.. ئەوە كەسێكە دەیەوێت، بەندییەكەتان بفڕێنێت..

قوڕەیشییەكان كۆدەبنەوە، بەڵام مەرسەدﷺ بە خێرایی خۆی لەناو كێڵگەو باخچەیەكدا دەشارێتەوە، تا ئەوان دوور دەكەونەوەو دووبارە دەچێتەوەو موسڵمانەكە ڕزگار دەكات..

ئایا ئەوە ئازایەتی نیە؟!

كاتێك كە قوڕەیش بەدەم هاواری ئافرەتەكەوە هاتن، مەرسەدﷺ نەگەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەر باش بوو خۆشم ڕزگارم بوو، بەڵكو ئەو كارەی بۆی هاتبوو، تا بە تەواوی جێبەجێی نەكرد، نەگەڕایەوە..

دوای چەند ڕۆژێك هەردووكیان گەیشتنەوە مەدینە، لەبەر ئەوەی نێوانی مەككەو مەدینە پێنج سەد كیلۆمەتر دوورە.. هەردووكیان شیوو دۆڵەكانیان بە پێ، یان بە وشتر دەبڕی.. مەرسەدﷺ بە درێژایی ڕێگە، خەیاڵی لای ئەو ئافرەتە بوو.. هۆشو بیری لای عەناق بوو.. عەشقو ئەوینی ڕابوردوو لە دڵیدا گەشایەوەو ڕابوردووی بیركەوتەوە، بەڵام دەیزانی پەروەردگار بەدڕەوشتیو زینای حەرام كردووە..

كاتێك گەیشتنەوە مەدینە، موسڵمانە ڕزگار كراوەكە ڕۆیشتەوە بۆ ناو كەسوكاریو مەرسەدیشﷺ ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو ڕووداوەكەی بۆ گێڕایەوەو باسی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان خۆیو عەناقیشی كرد، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ عەناق مارە بكەمو بیخوازم؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی مەرسەد.. پەروەردگار زینای حەرام کردووە..
مەرسەدرضي الله عنه بێدەنگ بوو، پاشان دووبارە وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ مارەی بکەم؟

ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾ النور. واتە: (پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات، (هاوسەرێتی پیاوانو ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرام کراوە)..

پەروەردگار بابەتەکەی یەکلایی کردەوە.. هەر بۆیە کاتێك کەسێك ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەو کێشەیەك دەبێت، هەر وەکو مەرسەدرضي الله عنه پێویستە پرسو ڕا بە کەسانی شارەزا بکاتو ڕایان وەربگرێت.. مەرسەدرضي الله عنه کاتێك زانی دڵو دەروونی بەو ئافرەتەوە سەرقاڵە، هات بۆ لای پزیشکی دڵانو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هاتوومەتە بەردەستتو کێشەیەکی سۆزداریم هەیە، کێشەکەش خۆشەویستییە، دەمەوێت فلانە ئافرەت مارە بکەم.. پێغەمبەری خوداشﷺ ڕاستەوخۆ ئاگاداری دەکات، کە ئەو کارە دروست نیەو حەرامە..

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە: مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە چیە؟
﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً ...﴿٣﴾﴾ النور. واتە: (پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات)..

ئایا ئەم ئایەتە چارەیە بۆ کێشەیەکی دیاریکراوو تایبەت؟ یان بۆ ئێمەشە؟ مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە، کاتێك ئافرەتێك ڕازی دەبێت شوو بە پیاوێکی زیناکار بکات، ئەو ئافرەتەش بەردەوام وەکو ئەوە وایە زینا بکات، مادام ئەو پیاوە نەگەڕابێتەوەو پەشیمان نەبووبێتەوە، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئافرەتەکە، گوناهی وەکو گوناهی ئافرەتێکی زیناکارە!!

نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، ئەو پیاوە زیناکارە، جیاوازی لە نێوان خێزانەکەی خۆیو ئەو ئافرەتانەدا ناکات کە بەردەوام زینایان لەگەڵ دەکات، جیاوازییەکەش تەنها ئەوەندەیە کە گرێبەستێکی شەرعی لە نێوان ئەوو خێزانەکەیدا هەیەو بەس..

بە هەمان شێوەش کاتێك پیاوێك ڕازی دەبێت، ئافرەتێکی زیناکار مارە بکاتو بیخوازێت، ئەویش وەکو زیناکار وایە، چونکە ئافرەتەکە چۆن پەیوەندی لەگەڵ مێردەکەیدا هەیە، ئاواش پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی تردا هەیە، هەر بۆیە دروست نیە پیاوی موسڵمان ئافرەتی لەو جۆرە مارە بکاتو بیهێنێت، مەگەر بە تەواوی پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ..﴿٩٥﴾﴾ المائدة. واتە: (لە ڕابوردووشدا هەرچی لەو بابەتانە ڕوویداوە،

خودا قەڵەمی چاوپۆشی بەسەردا هێناوە، جا ئەوەی ئەم هەڵانە دووبارە بکاتەوە خودا تۆڵەی لێدەسێنێت)..

پەروەردگار لە هاوەڵدانانیش خۆش دەبێت، ئەگەر کەسەکە بەڕاستیو بە تەواوی بگەڕێتەوە، چ جای زینا!!

هاوەڵان کاتێک شتێکیان بۆ دروست دەبوو، یەکسەر دەچوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ و داوای چارەسەری کێشەکەیان لێدەکرد..

زانایانی پێشووش هەمان ڕێگەی هاوەڵانیان گرتووە، ئەبوحەنیفە کاتێک کێشەیەکی هەبووایە، مامۆستاکەی ئاگادار دەکردەوە.. قوتابیەکانی ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی شافیعیش بە هەمان شێوە کێشەکانیان دەخستە بەردەم مامۆستاکانیانو داوای چارەسەریان لێدەکردن.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ ..(٨٣)﴾ النساء. واتە: (هەر کاتێک هەواڵێکیان بۆ دێت دەربارەی ئاسایشو هێمنایەتی، یاخود ترسو بیم، بڵاوی دەکەنەوە (بیر لە سەرئەنجام ناکەنەوە)، خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەکردایەتەوەو بیانگێڕایەتەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، یان بۆ لای کاربەدەستانێک کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کە لە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەنو دەکۆڵنەوە، نهێنیو ڕازەکانیان لێدەردەهێنا)..

پەروەردگار فەرمان دەکات، ئەگەر کێشەو دوودڵیەک دروست بوو، ئەوا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ ئەگەر لە ژیاندا بوو، هەر وەکو هاوەڵان بەو شێوەیان دەکرد، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوداﷺ لە ژیاندا نەمابوو وەکو ئێستا، ئەوا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای زانایانو کاربەدەستانی شارەزاو دیندار..

* ئەوەتا حەنزەڵەشرضي الله عنه کاتێک شتێک لە دڵیدا دروست دەبێتو دەیەوێت بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو لە ڕێگە تووشی ئیمامی ئەبوبەکررضي الله عنه دەبێتو پێی دەڵێت: ئەبوبەکر، حەنزەڵە تووشی دەردی دووڕوویی بووە..

ئیمامی ئەبوبەکررضي الله عنه دەفەرموێت: چۆن چۆنی؟!

حەنزەڵەرضي الله عنه دەڵێت: ئەبوبەکر کاتێک لە خزمەت پێغەمبەری خودامﷺو باسی بەهەشتو دۆزەخمان بۆ دەکات، دڵمان نەرم دەبێتو وامان لێدێت، دەڵێی بە چاوی سەر بەهەشتو دۆزەخ دەبینین، بەڵام کاتێک لە لای پێغەمبەری خوداﷺ دەڕۆینو دەچینەوە بۆ ناو ماڵو منداڵمان، زۆرێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودامانﷺ بیر دەچێتەوە..

ئیمامی ئەبوبەکررضي الله عنه کاتێک گوێی لەم قسانە دەبێت، دەڵێت: ئەوەی تۆ هەستی پێدەکەیتو دەیڵێیت، منیش هەمان هەستم هەیەو هەستی پێدەکەم، کاتێک لە لای پێغەمبەری خودامﷺ دڵم زۆر نەرمە، بەڵام کاتێک دەچمەوە ناو ماڵو منداڵم، ئەو

دڵ نەرمیەم نامێنێت..

بەڕێزان ئەم حاڵە ئاساییە، ئەگەر مرۆڤ کاتێك نوێژ بکات، یان قورئان بخوێنێت، دڵی نەرم ببێتو ئیمانی زیاتر بێت، بەڵام دوای نوێژو قورئان خوێندنەکە، حاڵەتی وەکو پێشووی لێبێتەوە، لەبەر ئەوەی ژینگەو دەوروبەری کاری تێدەکەنو لەوانەیە دڵ نەرمیەکەی کەم بکات..

ئەمڕۆ پەیوەندی کردن بە زانایانەوە زۆر کارێکی ئاسانە، مەرجیش نیە پەیوەندی بە زانایەکی بە ناوبانگەوە بکەیت، گرنگ ئەوەیە ئەو زانایە شارەزا بێت، با بەناوبانگیش نەبێت..

بەهەر حاڵ ئەبوبەکرو حەنزەڵە دەچن بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو بابەتەکەی بۆ باس دەکەن..

پێغەمبەری خوداﷺ پێیان دەفەرموێت: ((ئەی حەنزەڵە سوێند بە خودا ئەگەر ئەو کاتەی لە لای من دەڕۆن، وەکو ئەو کاتە وابن کە لە لای منن، ئەوا فریشتەکان لە جێگەو ڕێگەکانتاندا چاکیو چۆنیو سڵاویان لێدەکردن))، پاشان فەرمووی: ئەی حەنزەڵە ئەو حاڵەتە سات ساتە، واتە: ساتێك گریانو ترسان، ساتێك پێکەنینو خۆشی..

هەر بۆیە پێویستە کێشەکان لە دەروونیدا نەهێڵینەوەو دەریان بڕین، ئەوەتا ئەگەر حەنزەڵەرضي الله عنه باسی کێشەکەی نەکردایە، لەوانەیە لە دەروونو ناخیدا گەورەتر بووایەو بەرەو دووڕوویی ڕاستەقینە بچووایە، بەڵام بە دەربڕینی کێشەکەی لە لای پێغەمبەری خوداﷺ، لە ساتێکی زۆر کەمدا کێشەکەی چارەسەر بوو..

پێویستە وەکو مەرسەدرضي الله عنه بین، کاتێك شتێك لە دڵماندا دروست بوو، دەریبڕینو بە دوای چارەسەردا بگەڕێین.. کاتێك کچێك، یان کوڕێك شتێکی لە لا دروست دەبێت، پێویستە بچنە لای کەسانی شارەزاو خاوەن متمانەو کێشەکانی خۆیان بخەنە ڕوو، بۆ ئەوەی چارەیەك بۆ کێشەکانیان بدۆزنەوە.. ئەو کەسانەش کە قسەیان لە لا دەکرێت، پێویستە متمانەی خۆیان لە دەست نەدەنو نهێنی خەڵکی لە لای کەس نەدرکێنن..

پەروەردگار لە هەڵەو تاوانو گوناهـ بمان پارێزێتو وامان لێبکەیت، بۆ خۆمانو بۆ خەڵکیش سوودمەند بین.. آمین..

## ناوەڕۆک..




* خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ آل‌عمران. واتە: (پێشبڕکێو پەلە بکەن، تا دەگەن بە لێخۆشبوونی پەروەردگارتانو بەهەشتێك، کە پانتاییەکەی ئاسمانو زەوی گرتۆتەوەو ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران ★ ئەوانەی لە خۆشیو ناخۆشیدا، لە هەرزانیو گرانیدا،ماڵو سامانیان دەبەخشنو ڕقو کینەی خۆیان دەخۆنەوەو لە خەڵکی خۆش دەبنو لێبوردەن، پەروەردگاریش چاکەکارو چاکەخوازانی خۆش دەوێت)..

* خوشكو برای ئازیز: تەمەنو ژیانی دونیا وەکو پەڕتوکێك وایە، بەڵام ئەو پەڕتوکە تەنها یەك چاپی هەیەو جارێکی تر چاپ ناکرێتەوە..

* نوسەرێکیش دەڵێت: خۆزگە مرۆڤ لە دونیادا دوو تەمەنی دەبوو، بۆ ئەوەی ئەزموونەکانی تەمەنی یەکەمی لە تەمەنی دووەمیدا بەکار بهێنایە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو خۆزگەیە دارێکی بێبەرو بێ بەروبوومە، کەواتە با لە خەمی خۆماندا بینو پشتیوان بە خودا نەیەڵین تەمەنمان بێهوودە بە فیڕۆ بچێت..

وەرگێڕ..